# طاهر طيب جاف

## «مامكاك»




# ئەوەی نەدەوێرام بیخوێنمەوە،
# وا بڵاوی دەکەمەوە

شیعر

٢٠٢٣ هەولـــێر

بـــــۆ

جیهان

ئەو سەرە ژنە بە ئارامەی بارگەی خەمەکانی منی هەڵگرتووە.

## ئەوەی نەدەوێرام بیخوێنمەوە، وا، بڵاوی دەکەمەوە

هەر لە منداڵییەوە، هەمیشە، باوکم منی دەگەڵ خۆیدا دەگێڕا و لەگەڵ مەلا و شێخ و ئاغە و هەژارانی گوندەکانی دەڤەری دزەییاتی منی لە تەنیشتە خۆی دادەنیشاند؛ بەو حوکمە، دەبوو گوێم لە هەموو ئەوانە بێت کە لەو دانیشتنانەدا ئامادە دەبوون؛ ئەوانیش چینی خوێندەوار و لێزان و شارەزای ئەو دەمان بوون و زۆر لە خەڵکە ڕەش و ڕووت و نەخوێندەوارانی ئەو سەردەمانیش ئامادەی ئەو دانیشتنانە دەبوون؛ سنوور بۆ هیچ کەسێك نەبوو کە بیویستبا ئامادەی کۆڕەکان بێت.

لەگەڵ ئەمەشدا، ئەو گردبوونەوانە جێی ئەوە نەبوون هەر کێ بیەوێت سێرە لە تاکە[1] بگرێت و بیهاوێژێت و کێی بیەوێت بیپێکێت؛ ئەو دانیشتنانەی باوکم هەردەم زۆر مەلا و فەقێ و خوێندەوار و ئاغەی لێ ئامادە دەبوون و هەمیشە بە خوێندنەوەی دوو شت خەریك دەبوون و دانیشتنەکانی خۆیانیان پێ دەگەشاندەوە؛ قورئان و شیعر.

منیش هەر لە منداڵییەوە هەمیشە لە ناو ئەو گێژەنەدا مەلەم کردووە و گەلێ جارانیش قسەی خۆمم هەبووە و زۆرم لەو دانیشتنانە وەرگرتووە و بنەمای پەروەردە و زانینی من لە ناو حوجرەی فەقێیاندا داڕشتراوە؛ بەڵام هەمیشە سەیری ڕووەکەی پشتی دانیشتنەکانیانیشم کردووە و بەراوردی دین و زانستم بە یێکەوە کردووە؛ چونکە زۆر جاران هەستم پێدەکرد، قسەی ئاوا بە ناوی دینەوە دەکرا کە مەبەستە نهێنییەکەی تەنیا لغاوکردنی نەتەوەی کورد بوو و منیش نە ئامدەبووم تا لغاو بکرێم و نە دەستیشم بۆ قسەی خوردە دەبرد؛ چونکە کوردی فێری گەوهەری دینی ئیسلام نەدەکرد؛ هانی موسوڵمانی نەدەدا زانست فێر بن و واز لە قەوانی تەقیو بێنن؛ بەڵکوو بە پێچەوانەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا، لە خزمەت باوکمدا، گوێم لەو هەموو شتە جوانانە دەبوو کە ئەوان دەیانخوێند و دەیانخوێندەوە و وەبەر نەشتەری لێکۆڵینەوەیان دەدان. کە هەراشتریش بووم هەستم کرد ئەوانەی لە مەجلیسەکانی باوکم دادەنیشتن، هزر و بۆچوون و فیکریان بە سێ جۆرە ئاراستەی جودادا ڕەتیان دەدا؛ یێکێکیان ئەوانە بوون کە لەلای باوکم دەیانخوێند و فەقێیەکانی باوکم بوون؛ ئەوانە بە دووای زانستە ئیسلامییەکاندا وێڵ بوون و لە ڕووناکی دینەکە دەگەڕان و گەلەك بایەخیان بە ژیانی خۆیان نەدەدا ئەوەندەی کە بە تێگەشتنی دینەکە ماندوو بوون؛ بۆیێ ئەمانەیان زۆر نەهاتنە ناو دڵم؛ لێیان تەریك بوومەوە! دووەمیان ئەوانە بوون کە مەلا بوون، وەك پێیان دەگوترا - دووازدە عیلم بوون - من تا ماوەیێك لەگەڵیاندا چووم پاشان لەوانیش داترازام؛ نازانم نە بارم نەبردن نە لێیان ڕەت بووم و ئەوان نەگەیشتنە ئەو ئاستەی من پێیگەیشتم؛ جا لەو دانیشتنانەش وەرچەرخامەوە و بەرەو مەجلیسی سێیەم چووم. ئەو

---

[1] تاکە – نیشانە.

سێمینەیەش شیعر و ئەدەب و زمانەکانی کوردی و عارەبی بوون. زۆر جاران لە مەجلیسەکانی باوکمدا، شیعر و ئەدەب و ئەوین دەکەوتە بەر تێزەی تیژی مەلایەکان؛ شیعر گڕی هەبوو؛ هەر لە منداڵییەوە هەستی بردم؛ تەمەنم لە خوارووی پانزدەساڵیدا بوو، کە زۆر جاران لە دانیشتنەکانم لە ڤرادەدەرەکانم، هۆنراوە کلاسیکەکانی کوردیمان، لەبەر دەخوێندەوە و جۆرە پێشبڕکێیەکمان دەکرد؛ ئەوەی کە بەیتێکی دەخوێندەوە و بەیتە هۆنراوەکە بە کام پیت کۆتایی بهاتبایە، دەبوو ئەوەی لە پاش ئەو دەهات، بەیتێکی بهێنابا بەو پیتە دەستی پێبکردایە کە ئەوەی پێشتر خوێندبوویەوە.

لەو کەین و بەینەدا من شەیدای شیعر و ئەدەب بووم. چونکە کەسێکی کڵۆڵیش نەبووم و لە مەجلیسی فەقێ و مەلایان زۆرم لەو بابەتە وەرگرتبوو و حەزم لێبوو شیعرێك بنووسمەوە؛ نووسیمەوە. خوێندمەوە. شیعرەکەم هەندە لە لا پەسند بوو وامزانی هەر تەنیا بەو یێکەمین شیعرە چوومە ڕیزی نالی و مەلای جزیری. شیعرەکەم ڕێکخستەوە و پاکنووسم کرد؛ بۆ لای باوکم چووم و بە فیزێکەوە ووتم – "بابە! ئەم شیعرەم داناوە، دەتەوێ بۆت بیخوێنمەوە؟" پرسیارم لە باوکم کرد.

- "ماشاء الله!" باوکم بە خۆشییەوە فەرمووی، "کوڕم ئاگات لە خۆت بێ؛ بە چاو نەچی!" ئامۆژگاری کردم و تێی گەیاندم کە من هێشتا زۆر منداڵ بووم، "کوڕم، شیعر سەرهەورازە؛ شیعر زمانە، هەستە، تەعبیرە، وەزنە؛ تاهیر، شیعر لە هەموو نووسینەکان زەحمەتترە." لە بابەتەکەی گەیاندم، لە مەرامەکەی نەگەیشتم!

وەخت بوو تەق بکەم، تا هەڵوەستەیێکی کرد؛ جا منیش یێکسەر تێیهەڵچووم و بۆیم خوێندەوە؛ من دەمخوێندەوە، تەماشای باوکیشمم دەکرد، ئەویش سەری خۆی بۆ دەهەژاندمەوە؛ پتر کەیفم بە سەر لەقاندنەوەکەی باوکم دەهات و چێژم لە خوێندنەوەکەم وەردەگرت، ڕشتتر دەمخوێندەوە؛ چونکە وامزانی لە شوکور الله بابان[1] باڵاتر دەیخوێنمەوە، هەر بۆیێ باوکیشم فرە بە دڵی بوو. تا تەواوم کرد، جا پرسی – "تەواو بووی؟"

- "بەڵێ،" گوتم، "بابە؛ ڕات لێی بوو؟" پرسیم.

- "تاهیر،" باوکم سەرنجی ڕاکێشام، ئەنجا گوتی – "ڕەوەندەکانی هۆزی مەنتك، ئەوانەی کە کوێستان و گەرمێن دەکەن، شتێکیان هەیە دەڵێن – 'هەتەرۆك و مەتەرۆك ... سەری بابت مەنجەرۆك!' کوڕم دەزانی ئەوە مانای چییە؟" باوکم لێی پرسیار کردم.

- "بەڵێ!" بە ساردییەوە وەڵامیم داوە و ووتم – "ئەوەی خوێندمەوە شیعر نەبوو!"

- "لە قوتابخانە، لە دەرسی عارەبی، بەحرەکانی شیعرتان فێر دەکەن؟" پرسیاری لێکردم.

---

[1] شکر الله بابان – ئەو شاعیرە کوردەی کوردستانی خۆرهەڵات بوو کە لە ڕادیۆی کرماشان هەر شەو شیعری دەخوێندەوە و تا گوێمان لێ نەبووبا نەدەخەوتین.

من وەڵامم لە لادا نەبوو. بێ دەنگ و بێ نموود وەستام.

- "کەی خوێندنت نەبوو،" باوکم فەرمووی - "وەرە با من هەر شازدە بەحرەکانی شیعرت پێ بڵێم." پێشنیازی بۆ کردم، ئەم پێشنیازەش بۆ من خەونێك بوو وا دەهاتە دی.

- "بەڵێ!" بە خێرایی و بە جۆشەوە وەڵامیم داوە.

نەمزانی بەحری شیعر چییە! خۆ شیعر مەلە ناکا تا پێویستی بە بەحر بێت! بەڵام من هەرگیز لە بەرانبەری باوکم نە داواکاریم لێی هەبوو؛ نە ڕەخنەم لێی هەبوو؛ نە بە پێچەوانەی ئامۆژگارییەکانی ئەو کارم دەکرد؛ ئاخر دڵنیا بووم کە باوکم مەحاڵ بوو هەڵە بکات؛ ئەو لە من پتر بەرژەوەندی منی دەویست؛ جا هەمیشە ملکەچی بووم؛ ئاخر منیش کوڕێکی لامل نەبووم؛ بایی یێك موو، لە قسەی باوکم و لە ئامۆژگارییەکانی لام نەدەدا و لە بەرانبەریدا (مووم نەدەپساند).

چەندین ڕۆژ لە لای ئەو لە بەحرەکانی شیعری عارەبیدا مەلەم کرد؛ فێریان بووم، بەڵام هەرگیز نەمزانی چۆن ووشەی ڕەسەنی کوردی لە ناو بەحری شیعری عارەبیدا جێ بکەمەوە! ئاخر لە ووشەی کوردیدا چەندین (سکون) بە دوای یێکتریدا دێن؛ بەڵام لە عارەبی، بە پێی کەمزانی خۆم، لە دوو سکوون پتر بە دوای یێکتریدا نایێن و ئەمەش لە کێش و قافییەی شیعری کوردیدا بە من ڕێك نەدەخرا. نەشمدەویست چاو لە شاعیرە بلیمەتەکانی کلاسیك بکەم و وشەی عارەبی بکوردێنم، چییە دوو دێڕ هۆزان دەهۆنمەوە! جا هەستام (گرێبەند)ی هۆزانی کوردی فێر بووم؛ ئینجا شیعرم نووسی. بەڵام زاتی ئەوەم نەکرد جارێکی دیکە بۆ باوکم بیخوێنمەوە، تا ڕۆژێکیان مامۆستا مەلا مەجیدی گوێڕی، یادی بەخێر، لە ماڵێماندا میوانی باوکم بوو، باسی شیعر و شتی ئەدەبیمان دەکرد، باوکم بابەتەکەی لێ تەقاندمەوە و فەرمووی - "مەلا مەجید!" باوکم سەرنجی مامۆستای بۆ خۆی ڕاکێشا و کارەکەی ئاشکار کردم - "وا بزانم تاهیر جێی مەلا هەوایی مامی دەگرێتەوە." بە متمانەوە فەرمووی!

ئیتر بە ناچاری شیعرێکم بۆ مامۆستا مەلا مەجید خوێندەوە. ئەویش، خودا تەمەن درێژ و تەنی دروست بکات، زۆر هانی دام و تەکانی ئەو جوامێرە بناغەی بۆ نووسینی شیعر لە کونج و کەلێنەکانی ناو مێشکم و لە چوارچێوەی سۆزمدا، گرت. جا هەر لەوان ساڵاندا تا ئێستا ناوە ناوە شیعراندوومە، نەك وەك شاعیرێك کە هەموو کار و پیشەی هەر شیعر و عیشق بێت؛ شیعر بۆ من وەك گەواڵەی بەهار بووە؛ لە کاتی نادیار هاتووە و پرووشاندوویەتی و پاشتر بووەتە ساماڵ و بۆ چەندین ڕۆژ پەڵە هەورەکە نەهاتووەتەوە و نە با بووە و نە باران! بەڵام لە ئەنجامی ئەو هەموو ساڵە دوور و درێژەی شیعرم تێیاندا نووسیوەتەوە، تەنیا بەرهەمی دوو ساڵانم بزر بووە؛ لە شوێنێکم هەڵگرتبوو کە دیارە دەستی خوێنەرێکی پێگەیشتووە و بردوویانی و نەیگەڕاندوونەتەوە؛ هەر باشە، ئەگەر ڕۆژێك بە ناوی خۆی بڵاویان نەکاتەوە! ئەوا ئەوەی پاراستوویانم، ئومێدمە بیخەمە بەر دەستی خوێنەری کورد. پێشتریش جارێکیان، لە دوای بەیانی

١١ی ئاداری ١٩٧٠، بزاڤێك کەوتە ناو گەنجی کورد و ڕێگەی بۆ والا بووەوە و کورد لە کوردستان دەنگ و ڕەنگێکی بۆ پەیدا ببوو، منیش هەستام ئەو هۆنراوانەی پێشتر لە ١٩٦٥ تا ١٩٧٠ ڕێکم خستبوون هەموویانم خستە سەر چەند پەڕێکی دەفتەرێك و ناوی (بۆ پێشمەرگە)م لێیان نا، ڕەوانشاد مامۆستا سعید یحیی ناوەکەی بۆ نووسیمەوە و ناردمە بەغدا تا (هیئة رقابة المطبوعات) لە (وزارة الاعلام) مۆڵەتی بڵاو کردنەوەیان بدات؛ ئەو چەند شیعر گەڕانەوە؛ ئەوەی بۆنی کورد و کوردستان و بۆرە تامێکی کوردایەتی لێ بهاتبا، لە سەر هەموویانیان نووسیبوو (یحذف) واتا (قوت دەکرێت) و منیش لە سەر ئەو بنەمایە هیچیانم بڵاو نەکردەوە و ئەم ناوەی ئێستاش کاردانەوەی ئەو کاتییە کە نووکی قەڵەمی کوردیان دەبڕی و ئەوەی بە دڵی ئەوان نەبا ڕێی نەبوو چاپ و پەخش بکرێت؛ بۆیێ ئێستا، کە هەموومان لەم بەشەی کوردستان ئازادین، لەبەر ئەمە پێشتر **(ئەوەی نەدەوێرام بیخوێنمەوە، وا، بڵاوی دەکەمەوە)** و ئومێدمە وەبەر دەست و چاوی خوێنەری کوردی بگات و وێنەی جوانی پێ نیشان بدات، بە تایبەتیش گەنجەکان، و ئومێدیش دەخوازم کاشکا واز لە پرۆگرامەکانی سەر تێلیفۆنەکانیان دەهێنن و بەرەو پەڕی کتێبان دەگەڕێنەوە تا بزانن ئەدەب و زانست چنە و چۆنن و چەند سوود بەخشن و باشتریش بزانن ئەوەی کە دەکەوێتە سەر لاپەڕەیێکی قاقەز، لەوەی کە لە سەر هەندێك لاپەڕەی تەمەن کورتی ئینتەرنێت پەخش و بڵاو دەبنەوە تەمەن درێژتر و بە سوودتر دەبێت و وەك ئەوەی سەر هێلە ئێلێکترۆنیکەکان زوو لە ناوناچن و ماندوبوونەکانیش بزر نابن. ئاخر بابەتەکە هەر ئەمەندە نەبوو کە وا بکات شیعر لە ناو دڵم و لە مێشکمدا گەشە بکات؛ بەڵکوو لە ژیانی مندا؛ شیعر هەستە، شیعر عەقڵە، شیعر سۆزە، شیعر عیشقە، شیعر خەمە و خەم ڕەوێنە، شیعر کۆرپەی نائومێدییە و لووتکەی پڕ ئومێدییە؛ ژینە، ژانە، هیشکەتییە، بیابانە، شیعر ئاوە، خۆراکی ژینە، نانە، شیعر میهری خودایە بە هەموو کەسێك نادرێ؛ چونکە ئەوەی بە شیعر دەگوترێت، بە زمانێکی دیکە پەروەردە نابێت. هەر نەتەوەیێکی شیعر لە ئەدەبیاتیدا نەبێت، نەتەوە نییە.




لە کۆتاییدا، با لە بیر نەکەم، باوکم دوو هۆنراوی لەلام ماون، ڕێگەم پێ بدەن، بۆ ڕیزلێنان، بۆتانیان بنووسمەوە و بزانن لەو سەردەماندا، خەمی گەورەی مەلا و زانا کوردە ئیسلامەکان چی بووە؛ پێمشخۆشە لەگەڵ هەڵوێستی ئێستای قوتابخانەکانی هزری ئیسلامی لە ناو کورداندا، بەراوردێکیان پێبکەن؛ ئاخر نەتەوە ئەگەر دینی هەبێت دەبێت دینەکە پشتیوانی هزری نەتەوایەتی خۆی بکات و بیپارێزێت، دین نابێت ببێتە دەستی دوژمن و خودی نەتەوەی دیندارەکان بکوژێت و قەڵاچۆی هزری و جەستەییان بکات؛ لە بیر نەکەن خودا دەفەرمێت –

"**وَأَنْ لَيْسَ لِلإِنْسان إِلا ما سَعى وَ إِنَّ سَعْيَه سَوْفَ يُرى** - صدق الله العظيم". باوكم له شيعری يێكەمی ئومێدی سەربەخۆیی كورد و كوردستان دەكات -

گەر ببینم سەربەخۆیی كورد و كوردستانەكەم
سەد هەزار كاوڕبەرانی مەنتكی قوربان ئەكەم
بێ ژمار حەیران و لۆلۆ و لاوكی پێ هەر دەڵێم؛
تا بمێنم بەزم و ڕەزم و ئەگلەنجە و سەیران ئەكەم
بۆ چمە كچ ؟ نامەوێ كوڕ، نامەوێ ئیلا مەگەر
وەك سەقەڕ دەركا دوو چاوی دوژمن و بێگانەكەم

پێش ئەویش، شیعرێكی مەلیك مەحمودی حەفیدی كردووەتە پێنج خشتەكی و ئومێدی بە هاناوە هاتنی پەیامبەری خودای خواستووە و پێدەچێت باوكیشم لەو دەمانەدا ئەو شیعرەی پێنجخشتە كردبێت؛ چونكە ئەویش وەك شێخی گەورە بێ ئومید ماوە و نووسیبێتی و هانای بۆ پەیامبەری گەورەی مرۆڤ بردبێت؛ بنووسێت -

چراغی كوردەكانی سەرفیرازم، یا رسول اللە
لە بۆ كوشتن لە پێش لووتی بەرازم، یا رسول اللە
دەكوژرێم و نەبوو حاصل مرازم، یا رسول اللە
(ئەگەر شاهم، ئەگەر شاهین و بازم، یا رسول اللە)
(وەتەن ئاوارە و هێلانەوازم ، یا ر سول اللە)

یەقینم، تۆ دەزانی، جەددی گەورە، چۆنە ئەحواڵم
لە بەر زگ سۆتنە گۆتن، وە یا تەنبیهە ئەقوالم
لە حەژمەتی فیراقی میللەت و قەوم و كەس و ماڵم
(بە ڕۆژ پەروانەیێكی دڵ فكار و بێ پەڕ و باڵم)
(بە شەو شەمعێكی پڕ سۆز و گڵازم، یا رسول اللە)

نەما موشكل لە دنیادا، هەموو ئا سان و هەم حەل بوون
لە بۆ چارەی گرێی كاری منیش هەموو پەل بوون
چ جادوو كارییە، یا رەب؟ دوعاگۆشم ئەوا شل بوون
(لە تێكۆشینی ڕزگاری منی ئاوارەدا كول بوون)
(هەموو باپیرەكانی دڵنەوازم، یا ر سول اللە)

تەڕەحـــوم یـــــا رسـول اللـــە بـــە وێ عەبـدێ جگەر سۆتی
ئەمـــا مەلجەء بـــە غەیـــری تـۆ لـــە ئەشرافـانی ناســــۆتی
تکا کاریـــم بکاتـــــن ئـــەو لـــە حـــەدرەت شاهی لاهـــۆتی
(ئـیتر ئەبێ هەر خـۆت چـارەم بـفەرمووی چـونـکە هەر خـۆتی)
(تکا کارم، مـــــوعینم، چـارەسازم یـا رســـــــــول اللـــە)

دەخیلت بـــــم، وەکوو غەیری ئەتۆش حاشا نەکەی لێما!
لە تیهی هـــــەم، لە غاری غەم، بە جارێ نەفسەکەم داما!
مقیرِم مـــــن بە ئەفعـــالی نەنگ و کاری بـــەدی خۆما
(ئـــەزانی خـــۆ خیلاف ئەمـری تـــۆم زۆر کوردووە ئەمما)
(کوڕی خۆتم، بە لوتفی تـــــۆ دەنازم، یا رسول اللـــــە.)

منیش بۆیێ ئەو هۆزانانەی خۆم چاپ و پەخش دەکەم، نەکا ڕۆژێك بێت و وەبن چەتری زەمان بکەون و لە دەست بچن؛ چونکە گەلێك شتی گرینگ و کارەساتی مێژوویی دەگێڕنەوە کە ڕەنگە پاشی چەند ساڵێکی دیکە ئەگەر مێژوو نووسێك شتێك بنووسێتەوە، پێویستی بێت بزانی چۆن بووە و چۆن دوژمن دەستی لە کچ و ژن و منداڵانی کورد نەپاراستووە؛ ئەم شیعرانەم وێنەی فرە چەشنی ژیانی کوردەواری و نەهامەتییەکانی دەگێڕنەوە و هەر بۆ هەوەسبازی نینە؛ بەڵکو پتر خەمگێڕەوەن و ئومێد دەکەم ببنە وێنەیێکی ژیانی کوردەواری لە بن دەستی ئەو عارەبانەی کە دەیان ساڵ کوردستانیان بە ناوی ئیسلام دەچەوساندەوە و پەیتا پەیتا لە پێشکەوتنی زانستی دووریان خستووەتەوە و بەرەو جەهالەت و شەخس پەرستییان دەبردەوە و هەر بە ناوی ئیسلامەتیشەوە ئەنفالیان کردین؛ دەبێ نەوەکانی ئایندەی کوردەواری، ئەم وێنانەیان بە سادەیی و بە ڕاست و دروستی بێنە بەر چاویان و تێیان بگەن؛ با نیگارەکان برێکی کەمیش بن، بەڵام ئەوەی بۆم کراوە و ئاگام لێی بووە، هەموویم بێ پەردەپۆش کردن، نووسینەتەوە و خەمی کوردەواریم تێیاندا دیار کردووە؛ سەرباری ئەمەش، ئومێد دەکەم عاشقانیش بە خوێندنەوەیان فەرامۆشییان بێتەوە و بزانن عیشقی دوورە دەست لە عیشقی ناو لاپەڕەکانی ئینتەرنێت بە سۆزترە و چاوەڕوانیش لە دیدار بە تامترە.

طاهر طیب جمال (مامکاك)
٢٠٢٣/٢/١١ - هەولێر

## ١٩٦٥

### لێو

ئەو لێوەی هەردەم هەر لە خۆشییە، وا پێدەکەنێ
هەر لە شادی بێت، خێوەتی گرژی لە سەر دانەنێ
ئەو ژیانەی کە خۆشە، سەیرانە، بەزمە، شاییە
لە خەفەت دوور و لە خۆشی بژی، چێژی بدەنێ

گوڵی بەهاریش هەر بە بۆنی خۆش بگەشێتەوە
هوڕە نەیگرێ، با گەرما نەیبات، هەر گەش بێتەوە
ئەو کچەی شەیدای بەیداخ هەڵگرە؛ با هەر بخەملێ
لاوی خەوانی قەت لێی دوور نەبێت، زوو بۆی بێتەوە!

کەسێکی هەر دەم دەژی و بە سوودە، بۆ کورد لە جۆشە
هەر لە خەباتە، لە تێکۆشانە، وریا و پڕ هۆشە
گوزەرانی خۆی بۆ کورد داناوە، ڕاست و دڵسۆزە
بێ پێچ و پەنا؛ ئامانجی دیارە و بۆ کار لە خرۆشە

ئەو شیعرەش کەوا پڕی هیممەتە بۆ گەل دەنووسرێ
بخوێندرێتەوە؛ با ئەزبەر بکرێ، بە مناڵ بگوترێ
ئەو کوردە ڕەندەی بۆ کورد فیدایە؛ وڵاتپەروەرە
هەر سەربەرز بێ؛ ڕێڕەوی ڕووناك، قسەی بۆ بکرێ

فڕۆکەی شەڕی کارگەی سۆڤییەتی کە کورد دەکوژێت
هەر لەم ئاسمانە، بتەقێتەوە، هیچ خوێن نەڕژێت
تانکی سەربازیش، کێڵگەی کوردستان، وا هەڵدەدڕن
یا خوا نەمێنن، بە سەر مین کەون، نێنەوە سەر ڕێت

١٩٦٥/٩/١١ - هەولێر.

**برا گـــــەورە!**

لێی لامەدە، ئازادییە؛
خاوەنی هێزە؛ شادییە؛
پشتگوێی مەخە،
کەسی گەورە، لە ڕەنگ ناکرێ،
سەران دەبا، بێدەنگ ناکرێ!
پشتی بگرە، لە پێناوی گەلەکەی خۆت،
تا ئازاد بن، کوڕەزاکان، نەوەکەی خۆت،
نەتەوەی خۆت!
بەرزی کەوە؛
قۆناخت بەرینتر دەکات، ماندووبوونت دەداتەوە!
پشت ئەستوور و باڵادەستت دەکاتەوە،
گەلی ئازاد قەت نادۆڕێ،
خۆی هەر دەژی؛ ژیانیش دەبووژێنتەوە!
لێی لامەدە، ئازادییە!
هەر دۆستی بە،
پشتی بگرە، گەورەت دەکا؛
خۆشت بوێ، پشتت دەگرێ،
خۆشەویستیت بەردەست دەکا،
گەلەکەی خۆت سەربەست دەکا،
دەژیێنەوە؛ نابڕێنەوە.

١٩٦٥/٩/١٧ - هەولێر.

## تــرس

کەسێك لە مردن بترسێ، ناوی ژیان بێنن دەمرێ؛
چونکە دەزانێ ڕێگەی ژین، مردنی زۆر دێتە پێشێ.
١٩٦٥/١٢/٢٤ - هەولێر

## ئارەزووی خۆم

ئارەزوومە، هەلْم ڕێك بێ و بمگەڕێنێ؛
ڕۆژ ڕێ بدا، لە سەر گۆی عارد، بمسووڕێنێ،
لە هەموو باخێکی ئازاد، تاقە گوڵێکم بۆ بێنێ!
١٩٦٥/١٢/٢٤- هەولێر.

## ئارەزووی گــەل

گەلی کورد وا پێشمەرگەی بــوو، نامــرێ و دەژییێتەوە
خــۆرمان هەڵــدێ، شــەومان دەڕوا، ڕووناکیمـان دێتـەوە
لاوی کــورد شەیـدای ژیانــە، ڕاپەڕیــوە، لــە مەیدانــە
دەنگەکــەی ئــاوازی خۆشــە، ســازە دەزرینگێتــەوە
١٩٦٥/١٢/٢٤ - هەولێر.

**بووك**

ئەم بووکە جوان و ڕازاوە   لە سەر ڕێگا ڕاوەستاوە
بەرگی سپی، چاوی بە کل   چۆنە بە بێ خودان ماوە
بیر و هۆش و عەقڵ و ژیانی   بۆچ هەموو ڕێی لێ گیراوە؟
دەستی بەردەن، با بێتە کار   ئایندە بە ئیش لکاوە!

١٩٦٥/١٢/٢٩ - هەولێر.

**باوکی**

باوکی زاڵم و پارە پەرستت
ڕێی لێت گرتووە پێش چاو و دەستت
نرخت نازانێ ئەی شیرین زمان
بە پارەت دەدا بێ خواست و هەستت
وا لە پەرۆشی بانکەنۆت سوورە
لای گرینگ نییە ئاوات و ویستت
گیرفانی گەرم، هەناوێکی سارد
خەمی تۆی نییە، نە نیاز، نە قەسدت
پیاو چاکی لای گەرمی گیرفانە
هیچ ڕێزێك ناگرێ لە تۆ و مەبەستت
ژیانی ئێمە پڕ بووە لە ژان
هیچ بایەخ نادرێت بە دید و بیستت!

١٩٦٥/١٢/٢٨ - هەولێر.

## ١٩٦٦

### ئەمەك و وەفا

کوردستان پرسی: ڕۆڵــەی شیرینم،
لـە کۆڕی خەبات بۆچـی ناتبینم؟
لە چەنگی دوژمن زوو ڕزگارم کــە،
بەسـە! بـا چیتر خوێنڕێـژ نەبینـم
ڕۆڵەی بە ئەمەك، لــە پێنـاو تۆیـە،
بۆ ئـازادی تـۆ وا لە سەر لـە ڕێیە
ژیانمـان ناوێت گـەر ئـــازاد نەبـین،
مەڵبەنـدی ڕزگار، ژیــان لـە وێیە
پۆشاکـم کۆنـــە، ڕایەخـم بـەردە،
ژێردەستی گـەلم، گرانـــە، دەردە
یان ئازاد دەژین؛ بـە ســەر بڵنـدی،
بــە شەرمـەزاری، ناچنـە بن پـەردە
*لە گرمەی تۆپ و گرەی فـرۆکان،*
*ناگەڕێینـەوە و هەرگـیز نابەزیـن*
لە هەر شەش لاڕا، ئاگرمان بۆ بێت،

*بەرگری دەکەین ئازایین نابەزین*
پێمان دەڵێن کورد؛ نەبەرد و ئازا،
کـوڕی ســۆران و بــارزان و زازا،
مـــژدەی ڕزگاربوون گەلێك نزیکە
گەر پێشتر یێك باین ژیان دەسازا.
١٩٦٦/٦/١٣ - هەولێر.

هیوا

بـراکەم، مەگـری، لەبەر جەوری ژیـن؛ ئەسریـن گـرانە!
مەرجە گەنـج دەبـێ بەرگـری بـکـا، بەوەوە جـوانە!
فرمێســـك و خەفەت کار پەیدا ناکەن، کار خۆی ژیانە!
هـیوات قەت نەبڕی، زۆر مـاوە زەمـان؛ پڕ لە گۆڕانە
کاتی ناخۆشی، چاوەڕێ مەکـــە، کار هـــی مەردانـــــە،
هەر تەنگـانەیێـك، کۆتـایی هەیـــــە، ســـنوور بزانە!

١٩٦٦/٦/١٩ - هەولێر.

## تەنیایی

بە دڵ تەنگی، بە بێ ڕەنگی لە دەرگـا ڕاوەسـتـاوم
مەستم بـێ مـەی، تەنیامە دەی، وەرە بینایی چاوم!
دوور لـە بەهـار، دڵ پڕ ئازار؛ هاوار! توند بووە داوم!
بە بێ هەسـتم، بێی تۆ مەسـتم، سـەیرە وا زیندوو ماوم!

مەیگـێڕ بچـۆ، مەوەستە تـۆ، پێی بـێژە وا بێزارم
لـە دووری ئـەو، شت نەما نـەو، هەمیشە لە ئـازارم!
بەزەیی بـێ، گـریان بەس بـێ، بزانێ بـۆی ناچارم
خـان و مان بێ، با ئاگای بێ، دوور لـەو مـن بریندارم!

تەنیـایی بەس، دەس لە نـاو دەس، بژین نزیـك لە یێکتر
ژین بەینە سـەر، بێ دەردەسـەر، گەلێك لە جاران ڕێکتر
با قۆڵ و مل، با چاو و کل، پێك بن لـە ڕۆژان چێتر
زۆر گەشبینم، خـۆش دەبینم، ئەمـڕۆ لە دوێنێ ژێتر
١٩٦٦/٦/٢٠ - هەولێر.

## بارزانی

بارزانی بۆ کورد سەروەرە　　هێزە، ئومێدە، ڕابەرە
لە تەنگانەدا هاندەرە　　سەرۆکە و ڕێ نیشاندەرە
مامۆستای کوردایەتییە　　خۆی، هێمای مەردایەتییە
هزری بەرزی یێك ڕیزییە　　ڕێ خۆشکەری ئازادییە
وا کوردی بەرزکردەوە　　لە دوژمنانی بردەوە
ڕێگەی ئازادی دۆزییەوە　　جا پێی دەڵێین بۆ پێشەوە
دەشت و دەر و کێوەکانم　　مێرگەکانی کوردستانم
بندەست دەمان جێی ژوانم　　نەبوونا پێشمەرگەکانم

١٩٦٦/١٢/١٨ - هەولێر.

## بمناسی یان نەمناسی

گەر بمناسی، گەر نەمناسی؛ گرینگ نییە!
بزانی کێم، نەزانی کێم، دەی! خۆت بیڵێ؛ زیانی چییە!
من تۆم ناسی، دەشزانم کێی، ئەمە هەوە!
تا ئەم کاتە، نەبیندراوی لەم ئاسمانە!
بە میوانیش، نەهاتوویە ئەم دەشتانە،
ڕاشنەبردووی بەم کێوانە!
چۆن دەزانی چی دەقەومێ لەم وڵاتەی کوردستانە؟
١٩٦٦/١٢/١٨ – هەولێر.

**پەشیمان نیم**

خۆ دڵنیام وازناهێنم،
لێ ناگەڕێم، تا ئەو دەمی،
زەنگی مەرگی ملوانکەیێك دێتە دەستم،
گۆمکی سەری گۆپاڵێکی کنێری جوان،
بووە مەبەستم!
کلدان و کل و کلچووکێك، بردی هەستم!
دەبێ نەمرم و زات بکەم، بەرانبەرت ڕابوەستم؟

١٩٦٦/١٢/١٩ - هەولێر.

**من و مامۆستا**

بابە، بابە، مامۆستاکەم ئەمڕۆ، پرسی -
(هیوای پاشەڕۆژتان چییە؟)
منیش کە ڕیزم پێگەیشت،
هەستام، گوتم -
(ئارەزووی من، ژینە، مانە!
ئازادی گشت کوردستانــە!)

١٩٦٦/٦/١٥ - هەولێر.

**بۆ بێگانــە**

وا لە یادمە،
لە پێش چەند ساڵ،
لە نێوان شەست و حەفتاوە،
کێوێ گەلێ جوان و ڕازاوە!
لە هەوراز شار و دێکانمان،
ڕوو لە ئاسمان،
لە کوردستان، ڕێك خرابوو،
بە هێز و خوێن، دارێژرا بوو!
کێوێك بەرز، لە پۆڵا بوو!

**

دووکەڵی ڕەز کە دەسووتا،
ناڵەی منداڵ،
لەو دەمەی باوکی دەکوژرا،
(واق)ەی کۆرپە،
کە لە ناو لانك دەسووتا!
پیرە باوکمان،
کە دەیگوت (ئۆف!)
بۆ جەرگی، کە لە دار دەدرا!
توندتر دەبوو، چاك دەچەسپا؛
پۆڵا دەماوە، هەر کاتێك!
نە دەجوولاوە، هیچ ساتێك!
پاش ئەم هەموو،
ڕووداوە زۆر تفت و تاڵە،

لە هەوراز شار و دێکانمان،
گرمەیێك هات!
تەپ و تۆزی گەییە ئاسمان!
بەشێك لە کێو کرایەوە! پۆڵا پەڕی!
ئەشکەوتێ ڕەش، لێی پەیدا بوو! بەشێك ڕزی!
سەد سەر بە هەش، لە کوردەواری پەیدا بوو!
کە پرسیم - بۆچ؟ پێیان گوتم -
(خۆفرۆشن، بە بێگانە!
لە خۆ بردوون، بۆ بێگانە!
کرنۆشبەرن، بۆ بێگانە!
چەوراتی پوولی بێگانە،
تیزابی دەستی بێگانە،
وای ڕزاندوون!)
بەڵام بۆ زانین بیزانە -
درەختێك باڵاکەی برزی، نا بەس کەمی،
کۆلکە مەرجە، کورد نابەزی!

١٩٦٦/١٢/٢٠ - هەولێر.

ئەم شیعرە و چەند شیعری دیکە بوون، کوردە بەندەکەی ڕەقابەی بەغدا لە ساڵی ١٩٧٠، ئەم (حذف) و (ئەم دەمە دەولکانەی) لە سەر نووسیبوو تا چاپ نەبن، ئەوان چوون، بەڵام ئەم شیعرە نەچوو و وا چاپ دەبێ.

## کـــل

له کۆتایی بێ سەرەتا،
وەکوو دانە مرواریییێك، درەوشایەوە!
له ناو دیدەم دەرمهێنای؛ ژیایەوە!
که تۆم بینی، لێم نزیکی؛ بووژامەوە،
بەرەو ڤیان گەڕامەوە،
له بەهاری ژین بزر بووی،
لێت دەگەڕام؛ ناوونیشان - هەڵبەستێك بووی
شاعر نەبوو داتبڕێژێ،
هەستیارێك ڕێکی نەخستووی؛
له هیکەوە؛ لێم پەیدا بووی،
چیم له دەست دا، هێنامەوە؛
جا له دۆزت دەتوێمەوە!

١٩٦٦/١٢/٢٩ - هەولێر.

## چاکـە

لــەم ژیانـــە وا بێزارە؛ سەیریکــەن؛ وا کێــو دەبــڕێ!
گەر دە هەزار ســاڵیش بڕوا، ڕۆژێکی دێت، هەر دەمرێ!
شارەزا و لێزانــە ئەمــڕۆ، بــۆ بەیانیــش چـــاوەڕێ؛
کێ دەزانێ بۆ کوێ دەڕوا، بەختەکەی چــۆن دەخوڕێ!
لــە پاکیزەی لامــەدە، نـــا! ڕاستــەڕێ بــە، ڕاستـە ڕێ،
ڕێبازێك بگرە و مەگـۆڕێ، دەنـــا خـۆتت لێ دەگـۆڕێ!
چاکــە لەگەڵ هەمــووان بکــە، باشە دێتن، چاکـە ڕێ،
خاسی تۆ دوژمن دەهاڕێ، هێزە بــۆ خــۆت، ڕاستی ڕێ!

١٩٦٧/٢/١ – هەولێر.

**باخچەی شێوەن**

لـــــە هەر ژینێك باخچەیێك، ژیانی مـــــن
شێوەن و زاری و برین، هەر بەشمە لەم ژیانە
بێستانی یـــــارم ڕوا؛ بـــە فرمێسكی چـــاوی
ئەویش نایێتە سەیـری، بێ وەفان لەم جێهانە
لە باخیاندا گەییون، دوو جۆرە ســــــێو و
لە ناو وشكـە باخی من، ئەسرین وا لـە چاوانە
ئێستا كاتی بەهـــــارە، وەرزی نــــــاز و
لــە نـاو جۆباری ژینم، تەنیـا ئـاخ هەڵكێشانە
لە دارستانی یـــاران، بولبول لـــــە ســـەر
لــە باخی ژیانی مـــن، گـوڵ شەیدای بولبولانە
١٩٦٧/٣/١٨ - هەولێر.

**سادە**

تۆم خۆشویست بــە سادەیی     نەك بە فـیـز و گەورەیـی
هەر كەسێك لووت بەرز بێ،     دوور، یان نزیك، دەكـەوی!
١٩٦٧/٤/٢٤ - هەولێر.

## شادی

سەر ئەمێستا، خۆ مەست نییە، سۆز و ئاوازی هەیە،
زەوقێکی خـــۆش، پـــڕە لە جۆش، دڵ مەیلی سازی
زەوقی ئەم دەمەم ڕەســـەنە، شـــیعر و شـــایی و
خـــەم مەنۆشـــە، دایمەپۆشـــە، سازی خۆی نازی
١٩٦٧/٢/١٨ - هەولێر.

## باڵندە

بفـــڕە و بنیشە، هێمـــای جـــــوانی؛
بۆم بچریکێنە، هەســـتی، ژیـــانی!
بە دڵ بخوێنـــە دەنـــــگ و ئاوازت
دەبنە سەر بەستەی عیشقی ڕەبانی!
لە نـــاو باخـــان و لە ســـــەر هێلانە
با جریوەت بێت، ســــازی کێوانی!
سۆزی قاسیەی تۆ، روح دەسازێنێت،
دەیهێنێتـــەوە، نـــاو ئـــاوەدانی.
١٩٦٧/٥/٣١ - هەولێر.

## ئەم شەو

ئەوا شادییە، ئەم شەو لەم ناوە     گۆرانی و بەستە دەنگیان داوە
کچان و کوڕان لە هەڵپەڕکێنە     دەستیان گرتووە کاتیان وەستاوە
ڕەشبەڵەکێکە، ئەوا دەگەڕێ     دەهۆڵ و زوڕنا هێزیان بڕاوە
عود و کەمەنجە ئاواز دەژەنن     ڕەبابە و جۆزە باویان نەماوە
ئاوازی سازە مەستی کردوونە،     تویست و دانسیش لە بیر کراوە
ئەی لاوی تازە بۆچی داماوی     ڕووت لەم سەیرانە وا وەرگێڕاوە
لاوەکان شادن بە جلی کوردی     پانتۆڵەکەی تۆش پێتەوە نووساوە
خەنجەر لە پشتی کوڕە کوردانە     میدالیای دەستت پەرت و ساوە
مەجلسی لاوان باسی خەباتە     بریژیت باغدۆ ناوی لات باوە
ژیان بەم چەشنە شەرمەزارییە     بۆچی گەلەکەت لێت ڕەش کراوە
باوەڕکە ئێمە فرە پێشکەوتووین     پێشیش دەکەوین، وەکوو ڕۆژاوە
ئێمە هیچێکمان وەکوو تۆ نییە،     خەمی گەورەمە کە لێت گۆڕاوە!
خەباتی باوکت لە بیرت نەچێت،     وەرە هەڵپەڕە، مەچۆ بۆ دوواوە،
دانسی لە بیرکە؛ ئاوازی کوردی     چاك و پڕ سۆزە، باش ڕێك خراوە
لە خەیاڵ دەرکە، کچ کاردینالی     ئێلڤس پریسلیش بەرە بۆ دوواوە
کە هاتیە سەر ڕێ، دڵداری بکە     کچە کورد زۆرن، گەش و ڕازاوە!
دڵسۆز بە بۆ یار و ببە ئەڤیندار     یەزدانی مەزن ڕێی بۆت داناوە،
جا ببە پیاو، وەك ئەم کوردگەلە     تێکۆشە تاکوو گەنجێتیت ماوە.

١٩٦٧/٧/٢٨ - هەولێر

## کانی

وەکوو کانی، کە هەڵقوڵای لە ژیانم،
چیلکەی وشکی ژینی تاڵم، پشکۆی گرت و گەشایەوە؛
خۆشەویستیت، ڕووەکێکی باراناوی، بە ئەسپایی ژیایەوە،
بە لێواری قەڵای بەرزی بۆی هەڵکشا؛
شێی خۆشی بوو؛ هەمووی تێکڕا بووژایەوە،
جەستە ماندوو، فیکری ماندوو، بە دیدەنت حەسایەوە.

١٩٦٧/٦/١٣ – هەولێر.

## هەتیو

بێ کەسم، ئەی برا، گەلان!     ڕەحمێکتان بێ لە ڕێی یەزدان
جودایی دەردێکی سەختـە،     بێی بـــــرا، ناچـتە سەر ژیان
برام دەبەن، چیم دەمێنێ!     کێ لـــە خەمیـم ڕادەهێنێ؟
بێ کەسم، براکــەم مەبەن     دەنـا خـــۆ کەســم نامێنێ!

١٩٦٧/٥/٣١ – هەولێر.

## پەیمانی ژین

شـــەیدای ژیانین، وا لە مەیدانین، لە ســـەنگەر
تـا دەمانناســن، دەزانـــن ئێمـــە خاوەنی خاکین
ئێمە ئـاواتین، ئـارەزووی گەلین، ئـامـانجـی
ئازا و دلێر و شەیـــدای ئازادی و سنوور پارێزین
ئێمەین عاشـــقی ئاڵای کوردانــــــین، ئێمەش
پەیمان ناگۆڕین؛ عەهدە داومانە بە خاکی دیرین
لە بیر دەرناچن، یادی ڕابردوو؛ خاپووری خاکمان
پەتی سێدارە، خوێنی گەنجانمان، زیندان؛ ڕاگوازین
زۆر باش بزانــــن، چاك بمانناســـن؛ کوردستان
دەبێ خورپەی بێ، تا ئازاد دەبێ، وڵاتی ڕەنگـــین
١٩٦٧/٧/٣١ - هەولێر.

## ئاواز

ئاوازێ ساز بێ، لــــە دوورەوە بێ، دەستم دامێنت، گوێ بگرە لە ڕێ
شمشاڵێ بێنە، وەرامـــی بـــدەوە، با ئــەم ئاوازە قەت لە بــیر نەچێ
١٩٦٧/٧/٢٩ - هەولێر.

## کچـــی شۆخ

ئەی کچی شۆخ،
لە دوورەوە چاوم پێتکەوت،
لە ناوەڕاست بۆت هاتمە ڕۆخ!
دوور مەکەوە، چیتر بێی تۆ، من هەڵناکەم!
چاوەکانم بۆم ناچنە خەو،
تێکەڵ دەبن لێم ڕۆژ و شەو،
دڵم بۆ تۆ پەریشانە،
دووریت بە ڕاستی پڕ ژانە!
فیکرم مەستە، سەرم گێژە،
زمان لاڵە، شەو درێژە،
مێشکم بۆت گڕی گرتووە،
وا هەورازم سەر و لێژە،
قەڵەمم نووکی نەماوە،
بۆت بنووسم، شت وەك وێژە!

١٩٦٧/٦/٤ - هەولێر.

## لامژی

بیری لامژ تا لە ناو کوردان دەرنەچێ؛ تا لادەچێ،
هەر وا دەبین، ئێستا چۆنین،
هەر وا دەژین؛ ئەگەر بژین،
تاکوو دەمرین، یێکتر دەکوژین!
تاکوو بە بیرمان (لامژ) بین، بندەست دەژین!
ئەو کاتەی بیرمان لە هۆشمان، دۆزرایەوە؛
وەك کەل و پەل، بۆمان نەهات لە دەرەوە،
ئەو کات دەژین، بە گشت واتای ژیانەوە!
بە هەست و دڵ و گیانەوە،
سەربەست دەبین،
ئەگینا، ڕاست چەشنی ئێستا، هەتا دەمرین،
یێکتر دەبڕین، خۆمان دوکوژین!

١٩٦٧/١١/٥- هەولێر.

## چەکەکـــەت

باوە، باوە! لەگەر هەموو خۆرهەڵاتێك،
خۆزیا دەبەم بتبێنمەوە، لە ناو چاوت رامێنم،
لە باوەشت ڕامهەژێنی، ڕاتهەژێنم،
دەستت ماچ کەم، لە لووتکەی بەرزی بتبێنم!
شکۆی سەرمان، هیوای دوورمان!
بە ساقەت بم؛ دەست شل نەکەی! لوولەی بڕنۆکەت دانەدەی!
قۆنداخەکەی توند، توند بگرە! وا بزانە، تفەنگەکەت، هەموومانین،
کوڕ و کچ و دایکمانین! باش بزانە، ئێمە هەموو لەگەڵتانین!
لە بیرت بێ کە چەکەکەت، قەلغانی ئابڕووی ئێمەیە،
سەری بەرزی دایکمانە، بازووی توندی باوکمانە!
پاسەوانی ئاڵای بەرزی کوردستانە!
بیپارێزە، باوە، گیانە!

١٩٦٧/١٢/٣٠ - هەولێر.

**ئاوات و ئارەزووو**

بابە، بابـــە! ئیمڕۆ ئێمە لە ناو پۆل بووین، دانیشتبووین!
کە مامۆستا هاتە ژوورێ، ڕاست لێی پرسین –
(قوتابییەکان! ؛ ئارەزووتان بنووسنەوە؛
هیچ مە ترسێن، شەرمیش مەکەن
ئاواتەکانی پاشەڕۆژ، هەمووی بڵێن،
لە سەر کاغەز ڕێکی بخەن. بینووسنەوە!)
باوە، هەرکە ڕیزم داهات، هەستام؛ نووسیم –
(ئەی مامۆستا بەڕێزەکەم،
زۆر ئارەزوو و ئاواتم هەن،
حەزم لێیە، هەموو بژین، پێکڕا بژین،
نەمانکوژن، کەس نەکوژین!
ئارەزووی خۆم، ژینە، مانە،
ئازادی هەموو ئینسانە،
ئاواتەکەم تایبەتییە،
ئەو پەڕەکەی سەربەستییە، دەرچوون لە بن ژێردەستییە!
ئارەزوومە، پاشەڕۆژی منداڵی کورد، وەکوو ئێستای ئێمە نەبێ!
ژیان وەکوو ئەو زیندەگییەی ئێوە، ترس و تۆقین ڕێی لێنەگرێ!
حەزم لێیە، بمگەڕێنی،
بە سەر تەواوی گۆی زەمین، بمسووڕێنی،
لە هەموو خاکێکی ئازاد، چەپکە گوڵێکم بۆ بێنی!
مامۆستا گیان، حەزم لێیە لە کوردستان،
ئاشتی و ئومێد و ئازادی، ببنە پاوان، لە بۆ ئینسان.
ئینجا بمبەی، لە ئاسمانی شاری بەغداد، بمگەڕێنی!

له تارانێ، له ئەنقەرا، له دیمەشق، له یەریڤان، دامبەزێنی،
بۆ لای ئەو کوردانە بچم،
برامانن،
خزم و کەس و هاوڕامانن،
تا هاواریان له بۆ ببەم؛
که دەزانم پشتیوانن.
حەزم لێیە، بیان بینم،
ڕەت بم من بەو کوردستانەی،
لەبن چنگی تورکەکانە!
دیاربەکر و ماردین و ڤان،
مەنزڵگەی گەورەی کوردانە!
ئازادی بەشێك گەر ببێت،
بۆ ئازادی وان ئاسانە.
مەهاباد و ناو شەهری کورد،
کرماشان و قەسرشیرین،
سنوور لادەین
خۆری ئازادی هەڵبێتن بە بێ ئەسرین!
مامۆستاکەم؛
حەزم لێیە، بە سەفەرێك بچمە عەفرین،
بچمە سەرکێوەکەی کوردان،
هەر لەوێدا، باوەش له یێکتری بگرین؛
ئاخر ئەمەش، مامۆستا گیان،
سەرەتایێکە بۆ یێکبوون.

۱۹٦۷/۹/۲۲ - هەولێر.

## ١٩٦٨

### نامــه

خامــەی غەریبیم هاتــە جۆش بۆتان　　هەستی دەربــڕی، فرمێسکی ڕژان
بــێ هەواڵیتـــان، کــزی کردووینـە　　ناچار بنووسم بــۆ کاك و خوشکان
سڵاوی پــڕ ڕێــز پێشکەشی ئێــوە　　کــە هەڵدەقوڵێ لـە دڵی پــڕ ژان
هەستی برایانــەم تــەواو هانی دام　　بۆتان بنووسم چەنـد دێڕی جـوان
لــە یادم مەکــەن، دووری گرانــە　　دەروونــم هــەژا، لەبەر دووریتان
بـا زۆر نەکێشـێ، یــادم کەنـەوە　　لــە بـۆم بنێرن نامەی پڕ جۆشتان
خەتی ناسکــتان ئاســوودەم دەکات　　هاتنی خۆشییە، لـە بـۆ هەموومان
لــە دووری ئێــوە دڵ هــەر سوارە　　گــرژ و داماوە لە دووری هەموان
زۆر دڵنیا بــن، دڵ لای ئێوەیــــە　　دێنە بــەر چاومان وێنـەی منداڵان
وێنەی گەلاوێژ خونچەی بـاخی دڵ　　کاکە وێنەی تۆش دێتە سـەر چاوان
شـێرکۆی بلیمەت یا سـمکۆی زیرەك　　توانای هــەر یێکێك دەکەنە دەیان
(سروە) سروود و چریکــەی بولبول　　هەمیشە چالاك لـە بـاخی ماڵتــان
سوێندتان دەدەم بـە ســەری صلاح　　لە یادم مەکەن، بـۆ خاتری خـۆتان
ئەم خەیاڵانەی کــە بۆم ڕیز کردوون　　قەدری بزانــن، وەرام کـەن ڕەوان

١٩٦٨/١/٢٢- هەولێر.

**ئازادی**

دڵی ناشـــادم، هەمـــوو دەم، هـــەر شەیدایی شادییە،
ئەم خامە نووك بەسـتراوەم، پێویســت بە ئازادییە!
لێـوی کــز و بــە گریانــم، چاوەڕێــی پێکەنینــە،
هەســت و هۆشی پەشۆکاوم، مەیلی لە گۆڕانییـە!
خەونی شەوانی زستانم، هۆنــراوەی پــڕ لـــە داستانــم،
قسەکانــم، پەندەکانــم، ئاشنــایان ڕاستییـــــە؛
ئەم جیهانەی چوار سنوورم، هەموو لێم بووینە دوژمن،
مەرجە، بە چاو کوێرەیی وان، بگەم بەم ڕووناکییە
کە ڕۆژ هەڵدێ؛ کورد یێك دەبێ، لەو ڕۆژێدا شـایی دەکرێ
یێك ئامانج و یێك نیشان بن، یێکبوونە مەرداتییە.

١٩٦٨/٧/٧ - هەولێر.

### کوردم

که منداڵ بووم، فێرت کردم، لە بەند نەترسم، دایە!
لە بن دەستت لێی ڕاهاتم، لەو دەسرازەی وەك كۆت وایە!
بە دەنگت ئاشنای تۆپ بووم، چەشنی سەردوولكە و
بە كوردی پەروەردەت كردم؛ خوێنم كوردە، كورد سەرمایە!
١٩٦٨/٩/١ - هەولێر.

### خودان ژین

خۆ دیارە و ئاشكرایە، ویستن هەوێنی ژینە
خودان ژین سەر بڵندە؛ لە لای هەمووان شیرینە!
١٩٦٨/٧/٧ - هەولێر.

### ژیان

هێشتا منداڵ بووی، گیانە هاتییە ناو ئەم كۆسپانە!
نەتدەزانی كە ژیان ئەركی سەختە و گرانە!
١٩٦٨/٤/٢٤ - هەولێر.

**مـردن!**

سەرم لە مردن سوڕ ماوە؛
بۆچ وا مرۆی ترساندووە؟
بۆ وا خەڵکی لێی ترساوە!
ئەم ترسانە، پێویستە کورد نەگرتەوە،
ئاخر مردن، لە ناو گەلی کورد ڕەخساوە!
مردنی کورد فرە چەشنە: لە پێش هەمووان -
ئەو کاتەی تەمەن بڕاوە،
چاوی مردن لە مرۆڤ هەڵدێت!
لە بۆ خزمی کوردی مردوو، سەرساغی دێت.
دووەمیشیان -
ئەگەر کوردێك بەرانبەر عارەبێکی زۆڵ،
هەر بە ئاستەمێك نەبەزێت
بە کەمتر لەمەش نەترسێت
زاتی هەبێت؛ دەنگ هەڵبڕێت،
ئەو دەم، بە بێ ئاگاداری دادگا، مردنی دێت!
سێیەم -
ئەگەر کوردێك،
ڕێگەی خەباتی گرتەبەر، باوەڕت بێت؛
ئەوکاتە، کورد، بە دڵی خۆی، ڕووە و مردن دەچێت،
بەڵام مردن،
لە بەردەستی کوردی ئازا، بە تاو هەڵدێت!
١٩٦٨/١٠/٤ - هەولێر.

## ئامانج

لە سەر ڕێیە؛ وا ڕەتدەدا؛
بەرەو ئاواتێکی دەچێ،
بەرەو ئومێدێکی دەڕوا!
شەقاوی بەرین دەهاوێ،
کاشکا خێرا، دەگاتە جێ،
لەم ڕێگایە دەباز دەبێ،
خێرا، خێرا! ئەوا دەڕوا؛
ڕێگا لە پێشی خۆی دەشوا، دوورە ڕێگا!
لە سەر ڕێگاش بەربەست هەنە،
هەوراز، نشێو، سەت بەست هەنە!
دەبێ ڕەت بێ، ڕانەوەستێ،
ئاو ڕاوەستێ، کاروانی ئێمە نەوەستێ،
هەر ڕاوەستا،
جێ دەمێنێ؛ ئیتر ڕێگا،
لە هەموویان دەبێ جودا!
هەموو شتێ، ڕادەوەستێ،
عەقڵ، فیکر، ئومێد، هزر،
ئیتر هەرگیز پێڕاناگا!
جا با پێشتر سەدان هەزار ئامانج هەبا!

١٩٦٨/٩/٢ - هەولێر.

## گەل و ژیان

هـــــەر گەلێکی بیـــــــەوێ     ژیانی بـــەر دەست کەوێ؛
ئەگەر زوو بێ، یان درەنـگ     سـەری بە بەرد دەکەوەوێ!
١٩٦٨/٩/١٩ – هەولێر.

**(ئەم چوارینە قوربانی دەستی ڕەقابە کرا)**

## ویست

خۆ دیارە و ئاشـــکرایە، ویســـتن هەوێنی
خودان ژین سەر بڵندە؛ لە لای هەمووان شیرینە!
١٩٦٨/٩/١٩ – هەولێر.

**(ئەم چوارینە قوربانی دەستی ڕەقابە کرا)**

## زەنگ

زەنگوڵی ژیـان لێـیـدا،     ئاوازی پیرۆزی هات!
پەیکەری هۆشـیارییە     بۆی دانەوێنە باڵات!
١٩٦٨/٩/١٩ – هەولێر.

### ژێر چەپۆك

دەست بکەیتەوە گەورە و سەرۆکی، دەست شۆڕکەیەوە، تۆ ژێر چەپۆکی!

١٩٦٨/١٠/١٨ - هەولێر.

### ناوم بژی

گەر ناوم بژی، گیانم با بڕوا! وێنەم بمێنێ جەستەم خاك بیخوا!

١٩٦٨/١٠/٢٠ - هەولێر.

### ترس لە مردن

کەسێك لە مردن بترسێ، ناوی ژیان بێنن دەمرێ؛

چونکە دەزانێ ڕێگەی، ژین مردنی زۆر دێتە پێشێ.

١٩٦٨/١٠/١٨ - هەولێر.

**یادداشت**

برۆ، برۆ؛ بە جێم بێلە،
چیتر دڵم مەگۆوێنە!
لێمگەڕێ، با بە تەنیا بم، مەمرەنجێنە،
چ مەزهەبێکی ئەرێ تۆ؟
تووخوا، برۆ! برۆ! برۆ!
بلا من هەر بێ نەوا بم،
دوور لە تۆ، دوور لە دنیا بم،
ئاگادارم و دەزانم، کۆتاییم هەر تەنیاییە،
ئەشك و گرین، جوداییە،
هەر یادداشتە بە کەلکم دێ،
لە سەفەرێکی دوورە ڕێ!
زەردخەنەت دوژمنی دڵی هەژارە،
بکوژی سەد لێو و زارە،
کاولکەری گوند و شارە؛ هی بەهارە.
بۆنی گوڵاوی دەسماڵت،
ڕوومەتی سوور، خەت و خاڵت،
گوشینی بە هەر دوو باڵت،
سپی و لووسی پاك جەماڵت،
شێتییان کردم بە بێ گرێ،
هۆشیان بردم، هەر دەستبەجێ!
کە بە پەنجەی نەرم و شلت،
باسکت گرتم، خستتە ملت،
چاوی پڕ شەرم و پڕ کلت،

لێوی تەڕ و پڕ لە گڕت،
سەرتاپا هەستیان بردم، دیلیان کردم.
ئەمڕۆش کۆشکی دڵدارەکەت،
خاوەن پوول و تەلارەکەت،
بە کلیل و سەیارەکەت،
دەکوژێ کۆنە یارەکەت!
پیرۆز بێ لێت ژینی تازە،
تا نوێیە زۆر پڕ نازە،
هەمووی هەر ساز و ئاوازە،
شلت دەکەن، بۆنت دەبەن.
بەجێمبێڵە، بۆ خۆت بڕۆ؛
نێتە ناومان، چیتر درۆ!
کە تۆ دوور بی، من و یادداشت و ئەندێشە،
دادەنیشین بە بێ ئەرك، بە بێ پیشە،
دەست دامێنی ئەو کاتانەم،
ئەو پایز و زستانانەم؛
لە باوەشم گڕت دەگرت؛
هەرچی خۆشی دنیا هەبوو، هەمووت دەبردا!
لێوی تەڕت لە سەر لێوم دەبووە پەنگر،
سینەی ڕووتی هەردوولامان،
هەر ئەوەتا نەدەسووتان؛ دەبوونە گڕ!
سڕیان دەکرد! لاشەکانمان بڕیان دەکرد!
لەو دەمان بوو بە نازی خۆت،
بە زاری خۆت، ئاوازی خۆت،

بە دەنگی پڕ لە سازی خۆت،
بۆت چرپاندم - تۆم خۆش دەوێ، هەر تۆم دەوێ،
تا سەر بە ژێر خاك دەکەوێ، هەر تۆم دەوێ؛
لەگەڵ کەسێك نانووم شەوێ،
گیانە، دڵم هەر تۆی دەوێ، تۆی خۆش دەوێ!!
ئەمڕۆش دەرچوو؛ هیچ ڕاست نەبوو،
هەرچی گوتت هەر قسە بوو، قسەش بۆ ناو گیرفان نەچوو!
یادداشتی تۆ گێژەنێکە؛
پەردەپۆشی بێژەنێکە!
ئیتر، بڕۆ، زوو واز بێنە،
چیتر دڵم مەڕەنجێنە،
با یادداشتم بیرکەمەوە،
ئاخر، جوانێ، ئەوەی ڕۆیی نایێتەوە.
هەر یاداشتە دەشنێتەوە!
دێنەوە یاد، دەبنە فریاد؛
لە سێبەرێ، بن دیوارێ،
لەو کۆڵانەی لە لای خوارێ،
زەردەخەنەت، لەرەی مەمەت،
دڵیان خستە داوی گەمەت.
من خەڵەتام، فریو درام؛
قسەی شەکراو، دڵی بردم،
هەست و هۆشی لە دەست کردم.
تەنیا یێك دڵۆپ گوڵاو بوو،
کە زۆر خێرا؛ کە زوو بە زوو،

بە نینۆکە درێژەکانت،
پەنجە زۆر باریکەکانت،
بە هەردووک ئەبرۆت داهێنام؛
گێژ بووم، شێوام!
هۆشم نەما بۆ باوەشت،
ئارامی برد، چاوی ڕەشت،
دنیایان سەرا و ژێر کردم،
هەموو ئازادییان بردم.
کەچی ئەمڕۆ،
وا پێت دەڵێم، بەسە درۆ! بڕۆ، بڕۆ!
بۆ کۆشکی تازە دڵدارت،
خاوەنی نوێی هەوارت،
لێی تێر بخۆ!
ئەو و من، قەت نابین بە یێک، نابینە ڕێک!
من خاوەنی دیاری نیم،
خاوەن سینەما و یاری نیم،
هەر تەنیا خاوەن بەهرەمە،
خودان فیکر و ئەندێشەمە!
نە دەتوانم خۆم فریودەم،
نە کەسێکیس خەڵەتێنم.
دەی زوو، بڕۆ!
ڕێبازی کەسی وەکوو من،
نادەنەوە سەر ڕێگەی تۆ!
بە جێمبێڵە، بۆ یادداشتم،

ئاخر ئەمەیە پاداشتم!
دوور نەڕۆم؛ یادت کەمەوە،
هەر خەیاڵم، ئاو دەمەوە!
ئەو دەمی بوو، لە زاری تۆ،
بە گوڵزاری سەر زاری تۆ،
بە دەنگی وەك کەناری تۆ،
بە خۆت گوتت -
تۆم خۆش دەوێ، هەر تۆم دەوێ؛
لەگەڵ کەسێك نانووم شەوێ،
پڕ بە دڵ، من تۆم خۆش دەوێ؛
هەر تۆم دەوێ؛ هەر تۆم دەوێ!
زووکە، بڕۆ، هەرگیز جێگەی باوەڕ نی تۆ،
هەر بۆ زەوقی خۆشیشت بێت،
ناوم نەبەی، یادم نەکەی!
نەڵێی ڕۆژێك، لاوێك هەبوو،
هەموو بوونم، هەر هی ئەو بوو،
بە دیدەنی چاوی ئەو بوو،
دڵی شەیدام ئارام دەبوو.

١٩٦٨/١٠/٢٩ - هەولێر.

**خاك و خوێن**

ســـوێنـد دەخۆم بە خوا، بە خـاكی كوردان
بەم ڕۆژە ڕەشـــەی ئەمڕۆی كـوردســـتـان
تاكــــــوو وەرنەگـــرم مافـــی هــــەژاران
بڕنــــــۆی پـــیرۆزم، داناگـــرم لـــە شان

ســوێنــــــدم بەو دایكە، دایكی زگ ســـووتاو؛
بەو بـاوكە كـوردەی تـازە كـوڕ كـوژراو.
بـــە خەمی خوشكـــی، لە بـــــرا بەجێماو
ئــێرە دەبتــــــە گوڵ، پـــــڕ كانی و كانیاو

بە دەشتی هەولێر، بـــە لووتكەی سەفـــین
بـــە مەهابـــــاد و بــــارزان و بادیـــــن
بە دەشتی قـــــەراج، زەڵـــــم و خانەقـــین
دەبـــێت ئاڵای كـــورد بـــەرز ڕابگرین

سوێندم بـــــە خوایە، بە گونـــــــد و بە شار
دەســـتم هەڵدەگـــــرم، لە هەر جۆرە كار
بــۆ شـــــۆڕش دەڕۆم، خێرا، هــــەر بــە غار
ســەربەستی دێنم بـــۆ یـــــــاری نازدار

١٩٦٨/١١/٢ – هەولێر.

**عیشق و ئەدەب**

هەر کەس عاشـقی ئەدەب بێ لە ژین
باش لێی تێبگا، وێنا و هـزر و دین
بیخوێنێتـــەوە، بـــە هزرێکـــی ڕوون
عەودالّی دەبێ، بێ شك، بـە یەقین
منیش هێند سـەودای وشـەی ناسکم
هەرکە دەیبیستم، دەفڕم لە زەمین
١٩٦٨/١١/١٠ - هەولێر.

**سامالّ**

بریا سـەد بریا، دەژیم هەزار ســالّ
بە عەقلّی دانا، بە جەستەی مندالّ
تاکوو دەمتوانی مێشکـــە بۆگەکان
زاخــاو دەمەوە، تا دەبووە سامالّ.
١٩٦٨/١١/٣ - هەولێر.

**قژ زەردەکە لە سێیان**

وای گـەر دەمزانـی، چ ناوت لێیە!
ئەگەر دەمزانی، مالّتان لە کوێیە!
دلّنیا دەبـووم، شیریـــن کـچـی
باریکەی قەشـەنگ، ئومێدم پێیە.
زۆر قشتە لەنجەت، گرانـە ڕۆیینت
بالاکـەت ڕێکـە؛ گلێنـەی شینت
لە ســەر شان پەرتـــە، قــژی
گەنجان دەکـوژی، بـە پێکەنینت.
١٩٦٨/١١/٢٩ - هەولێر.

## بۆ فەرمانڕەوا

ئەی فەرمانڕەوا؛ بە تۆمـــە، زۆردار      شەیـــدای کـــاولی؛ دوشمنی ژیـــان
گاڵتەت پێ نەیێ، بە تەکانی گـــەل      بە خوێن ڕشتن و هانـــای زیندانیان
ناژی گـــەر دژی ژیانی کـــورد بێ      هەر ببارێنە، بۆمب بە ســـەر گوندان
بـریتانیا کـوردی بندەســـت کـرد      دەنا کـــورد نییە بێتـە بـــن دەستان
با ئەمڕۆ ڕۆژی ژێردەستتی کورد بێ      هـــەر چـرۆ دەکا ئـــازادی کـــوردان
ئاسۆی نزیکمان ڕووناکـە، پاکـــە،      بێ بروسـك و باسـك، گرمەی گەواڵان
گاڵتەت بە ناڵەی هەژاران نەیـــێ؛      هێزی نـــەداره مێژووی هەڵسووڕان!
زۆری نەمـاوە دروێنـــەی بکەیـن،      بەرهەمی دەستی کـــوڕی کوردستان!
بە خوێن ئاومان دا، بڕکـی ئـازادی      گێژت پێ دەخوا کوڕی کـــورد زوبان.

١٩٦٨/٩/١٣ - هەولێر.

## سروودی ئازادان

هاواری پـیرۆز، دەرچـە لـە داوم،      ویســـتی ئازادی، ڕووناکی چاووم،
ئاهی تەزیـوی نێـــوان پەراسووم،      کاتی تـــــۆ نییە؛ نایگرێ داووم!
گـڕی نزگـــرەی ســـەر لێوەکانـــم      هەستم پێدەدەن کە هێشتا لاوم
خێرا گڵپەکـــە! کاتـــی هەڵچوونـە      بـــــە ڕاپەڕینـــــە، دەزانم ماوم

١٩٦٨/١٢/١ - هەولێر.

**ئارەزوو**

ئارەزوومە هەست بکەم، تەنیا تـــــــۆم لە
جوانـــیّ دەمێك وەرە لام، پێویستیـــم پێتە، گیانە
هەناسـە سینگی دڕیم، دووری بێ تـــام و
ناخۆشە هاتـــن و چـــوونم، ژیانـــم بێی تـــۆ
لە دووریـت دڵ دەسـوووتێ، بۆنی کڕووزی
چبکەم دوور لە تۆ نامرێ، هەر چەندە لە نەمانە
بۆییێکە مـــــن دەمەوێ، ئـــــەم ڤیانەت
بـــا لە خەیاڵ نەکـــەوێ، ئەندێشەکـــەت
تا ســـەر، ببە هاوبەشـــم، ئەی تاکە گوڵی
هەتـاو و ڕۆژی خۆشـــم، دیـــــداری تـــۆ
نازی، ئومێدی، هیوای، تاکـــــــە بەزمێکی
خۆت ناسکی بێ هاوتــــای، تـــــۆم لەم ژینە
تەنیا یێك جار دەمەوێ، لێوم بـــــە لێوت
پاشـتر قەت نەنووم شـەوێ؛ چاوەڕوانیت جیهانە
١٩٦٨/١١/١٠ - هەولێر.

**خۆشی**

باوەڕکـــە ئارەزوومـــە بۆ من بِ لـــەم ژیانە
وێنـــەت گـــڕی دڵانە، باوەشت جێی ڤیانە
دووریت سینەی ڕزاندم، ئەسرین دیدەی بەزاندم
عیشقت بوونی هەژانـدم، هۆیان هەر تۆیە گیانە
بۆ تۆ سـووتاوە دڵم، لە باخان هەر تۆی گوڵم،
تـــۆی پەرستار من کوڵم، بێی تۆ بوونم نەمانە،
هەمیشە من دەمەوێ، دڵ لە عیشقت نەسرەوێ
نە بـــە ڕۆژ و نە شەوێ، خەیاڵت، بووکە؛ جوانە
ببە هاوسەرم دڵبەر بە خۆشی ژین بەینە ســەر
سۆزمان بکەینە جەوهەر هەر ئەو هێزی دڵانە
هـــەر تۆی ئومێد و هیـوا، خۆتی شایی و موزیقا
دڵــداری دوور لە جەفـــا، بێیتە خەونیش سامانە
وێکرِا با بانگەواز کەیــن، با دنیا پڕ ئاواز کەین
ئەڤینمان فێری نـاز کەین، خۆشـــەویســـتی

١٩٦٨/١١/٣ – هەولێر

گوڵی ئازادی

پێیان فرکـــــردم جۆر دەردەسـەری، تا داری خەفەت بۆم هاتە بەری،
ئەو چاوەی نەیدی فرمێسك و گریان، بە جارێك تانەی وا کەوتە سەری،
نزً ەی خەفەت سینەی دادڕیـــم؛ هـاوارە! گوڵی ئـازادیم وەری!

١٩٦٨/١١/١٦ – هەولێر.

## ماف دزراو

بژی هەر بە فێڵ، گشـــت خەڵەتێنە
بندەســت حاکمی بێ جێ و ڕێنە،
تا جڵەوی ژین دەخەیتە بەر دەســت
ئاشـــی ناپاکـــی هــەر بسووڕێنە،
چەند چاك بی بۆیان، لایان بێ ســودە
ئەوێندە هیچــن، هیچیان هێوێنە،
بچۆ ڕاوە شـــێر هەر بە فێڵبـازی
شــێر بۆت ڕاو نەکرا، ڕێوی بهێنە،
چ هات بیدزە، بەرد، دار، کا، قەسەڵ،
بڕکـی ڕووەکـــیان گشت بقرتێنە،
لەگەڵیان هەرگیز پەیمانـــت نەبێ،
نەکەی دڵســۆز بی؛ خۆ مەفەوتێنە،
هەر هەڵپەرست بە، مەبدەئت نەبێ؛
چی دەکـــەی بیکە؛ مافت بستێنە،
ڕژێمـــی دنــیا هــەر لـــە گۆڕانــە،
تەمەنت دەڕوا؛ هیــوات مەڕوێنە،
گەر پەلارێکیان وەشـــاندە کوردێك،
تۆڵــەی بکــەوە، چــاو مەنووقێنە،
خاکی کوردســتان، بـــە فێـــڵ دزراوە؛
وەری بگرەوە، قــەت مەیفەوتێنە.

١٩٦٨/١١/١٧ – هەولێر.

## پاشەڕۆژ

مەڵێ ڕابردوو دێتـەوە؛ ئـەوەی ڕۆیی دەبڕێتەوە!
ئــەو گوڵــــەی پایزێ وەری، بەهارێ ناگەشێتەوە،
دڵێکە و یارێك شـکاندی، شـووشـە یێك ناگرێتەوە،
کێ بوو ڕۆیشت لــە بیری کـە! گوڵێکی تر بچێنەوە،
پاشکۆی مـیری کارا نابێ، دەسـتی زۆردار یارا نابێ
زۆر بەر پێی ئاغە چا نـابێ، چاوەڕێنە و نـایێنەوە!
١٩٦٨/١٢/١ – هەولێر.

**بووکۆکە!**

له ۱۹٦٨/۱۲/۳، یێکەم جار هەڵبەستم بۆ هاوقوتابییانم خوێندەوە؛ پۆلی سێیەمی خانەی مامۆستایانی سەرەتایی؛ (مامۆستا جلال غریب - عارەبی) ئامادە بوو.

گیـانە بووکۆکەی هەسـتم جوانتر زۆر لە
ئارەزوو و خۆشی ژینم، کـیژی ڕەوشت کوردانی
تریفـەی مانگەشـەوی، تریـوەی
خۆشتری لـە کاڤۆکێ ، هەردەم لە سەر لێوانی
لـەم وڵاتـە پیرۆزەم، لـە نـاو دەستەی
گوڵی گـەش، تۆم هەڵبژارد، بۆ مـن تامی ژیانی
خنجیلەی، نموونەیی، لـە بێفیزی و
خـڕ و پـڕ و پەممەیـی، شـازادەی دڵـبڕانی
ئاواتی گەورەی دڵـم، سـەر پـەڕی گەشی
لـە دووری تۆ مـن کوڵم، زەوق و ڕەوقـی ژیانی
قژت زێڕی تاریکـە، بەژنـت بـەرز و
دیمەنت هێنـدە ڕێکـە، ئەندێشـەی شاعـیرانی
برینـدارت کردومە هەسـت و هۆشـت
زیندوومە و بـۆت مردوومە، خۆشتری لە گۆرانی
سینەی تۆ قیبلەی منە، جگەرم بۆت کونکونە
کوشتمی ئەو شەرمنە، دێتە خـوار لـە ڕێی کانی
پڕ سـۆزە بـۆ تـۆ بوونم، عاشقێکی
بۆت هەر لە هات و چوونم، مەل و هێلانەکانی.
۱۹٦٨/۱۱/۱۰ - هەولێر.

## خۆزگـــــــــه

خۆزگه، ئەی خۆزگه، لــه ژیــان نەبای،
بەڵام وا (تــۆ) بـووی؛ مردنمان نەبای،
کەچی وا هەردووك، له ژیاندا هـــەن؛
خۆزگه سەربەستی هەر تۆمان هەبای!
١٩٦٨/١٢/٢٧ - هەولێر.

## هەڵبەستم

ســــــۆزی هەڵبەستی پیرۆزم،
مێشکێك که ساڵەهای ساڵــــه
هەرکه شـیعرم پێیدا ڕەت بوو،
به جارێك دێته ســەر مەیدان،
دەکەوێته جـــۆش و خـرۆش،

زاخـــــــاوە؛ دڵ دەخەملێنێ
دوژمـنـی بەد، دەیشـــێـوێـن
وەك باڵنـــــدە دەچریکێنـــێ
ســــــۆزی دڵــداری دەنوێنێ
ئەو دەمی ژیـــــن دەلاوێنێ
١٩٦٨/١٢/٢٩ - هەولێر.

**ڕاســـــته**

جیهانێکی زۆر پـــــیرۆزم، به ئەندێشه ڕێکخستووه،
پەروەردەی دەکەم به دڵم تا ئێستا چۆنم کردووه،
ئامۆژگاری ســـوودی نییه؛ کوردایەتی وای لێکردووم،
چـاو دەگێرم له ئایینێك، له ژیانێك خۆی، مردووه!
ناچارم سەر دابنوێنـــــم، بـــه کتێبتان بڵێم – وایه،
چونکه بۆ ئێمه پێویسته؛ کورسی له پەنا ڕێز بووه!
که مامۆستا کۆتای به وانەکه هێنا، له پۆل دەرچوو،
دەڵیم: پووچ و بێ بـایەخه، کـاتێکی دێ له نـاو
دەســــتم به دامێنتـان، گەلۆ! نەچنه بن بـاڵ
ڕێبـازێکی ناپـیرۆزه و بناغەکـــەی زۆر ڕووچـــووه
چۆن بێت گەلۆ بیبەنه سەر به پاشایی یا دەربەدەر
خەبـات له پـێنـاو خـۆت بـکه، زەمـانه بـۆت
تێکۆشن بـــۆ تاکه ڕۆژێك، تاکه ساتێك که ئازاد بن،
ئازادی ئەوپەڕ مەرامه، شـایانـــــــه و خوێنی
١٩٦٨/١١/٢٤ – هەولێر.

**هاواری گەل!**

هاواری کرد لاوی کوردان،
لەرزی ئاسمان!
زەمین وه ئاگا هاتەوه!
گوڵی هیوای گەش کردەوه،
باهۆزی ئازادی هەڵکرد،
کورد گرەوێ دەباتەوه.

١٩٦٨/١٢/٤ – هەولێر.

## پرسیار

تا ئێستا، باوکم نەدیوە
لێی بخوازم، تاقە یێك ئامۆژگاری!
نەك بە تەنیا هەر ئەمە؛ ناشزانم چییە ناوی!
وا بزانم نەشخوڵقاوە، تا خولەکی ئەم دەمە!
سەیری ئەوێ سەیرانێ! چەند سەیرە ئەم گەمە!
لەگەڵ ئەمەش هێشتاکە، هەندێ پرسیارم هەنە؛
باوکی خۆم، گوێت لێن هەنە؟
پرسیار بکەم لە زەمان ئایا وەك پێشان ماوە؟
مرۆڤ و هەڵسوکەوتی، چون جاران، شڕ و هوڕە،
ئەوپەڕ ئاواتیان هەر خاوە؟
بیری مرۆڤ، باران بوو، جاران بە خوڕ دەباری،
ئەرێ ئێستاکە، باوە، توخواکە، پەڵەی داوە؟
دواڕۆژی منداڵەکان،
هەر قەفی سێدارەیە، یاسای کوشتن، هەر وا باوە؟
وەڵامێکم بۆ بنێرە، بزانم چی قەوماوە!!
١٩٦٨/١٢/١ - هەولێر.

## ئەی هاوڕێکـــــەم

به بۆنەی ناردنی ئەپۆڵۆ (٨) بۆ سووڕانی به دەوری مانگدا، فرانك بۆرمان و دوو ئەستێرگەڕی دیکەی هەڵگرتبوو.

ئەرێ ئایا هاوڕێگەلی ڕێی ئازادی، وەك ئێمەنە؟
ئەو گەلانەی گەیشتوونەتە بەرزاتی؛ وەك ئێمەنە؟
دەبا سەیری مێژووی بکەین،
تا بزانین، باش تێبگەین؛
ئەوانەی ڕێگەیان دیارە، ڕۆژێك له ئێمه بەربادتر،
گەلێك له ئێمه دڵساردتر،
ژینی خۆیان به سەر دەبرد،
باش و خراپیان تێکەڵ دەکرد!
له گەلی کورد نالەبارتر، ئەوانەنە هاتوونە ڕێ،
کەشتیان نارد؛ تاکوو به ئاسمان هەڵگەڕێ،
ئەو کەسەی ها لەم ڕێگەیە،
مرۆڤە، چەشنی ئێمەیە،
تەمەنی وەك تەمەنمانە، مردنی له پاش ژیانە!
خۆی دێ و دەڕوا، بەڵام کارێکی وا دەکا،
هەتاکوو دنیا دنیایە، جێ پەنجەکەی بزر نابێ؛ کۆتای نایە!
منیش که سەیری تۆ دەکەم، هەر دەم له سووچێك، ملکەچی،
له ناو خەوی دڵ ڕوودەچی،
هەر خەریکی پسکه پسی، وەختە بمری، هێندە برسی!
وا دەزانی پاڕانەوە، کڕنۆش بردن، پاڵدانەوە،
زاد و ئازادیت بۆ دێنن؟!
نەزانی لەگەڵ تەمبەڵی، هەر چی هەتە لێت دەستێنن!
هەسته و له مردن مەترسە،

وەرە مەیدان، دوور مەوەستە؛ بەس لە ئایندەت بپرسە.
ئەی هاوڕێکەم! ئەی برای ڕێگەی ئازادی؛
وەرە! با من و تۆش بچین،
بۆ کوردەواری تێکۆشین، ڕانەوەستین؛
تا ئەو ڕۆژەی کورد ناوبانگی خۆی دەردەکا،
ئاڵای ئازادی هەڵدەکا،
دەبێ بە شاخان هەڵگەڕێین، بە ئاسمان خۆ شۆڕکەینەوە،
ڕێگە دوورە؛ هاتووین و نا چەرخێینەوە،
با نەوەیێك، یان دوو نەوە،
ڕوو بە ڕووی گورگ ببنەوە،
دەهەستەوە، دەهەستنەوە؛
با پەیمانمان، بۆ کوردستان،
وەك جاران، نوێ بێتەوە!
ئەو پەیمانەی لە سەر تەختی ڕەقی خوێندن،
بە سوێند خواردن،
بە خۆمان و بە گەل و نیشتمانمان دا،
دەبێ یێك بن، تا سەرکەون،
ئەگەر لەم ڕێگەش سەرمان چوو،
ڕوحمان گەیشتە ئاسمان،
بەر لە کەشتی فرانك بۆرمان[1]،
ئەوا فیدای کوردستانین،
بەلاگێڕی خۆشەویست و دۆستانمانین.

١٩٦٨/١٢/٢ - هەولێر.

---

[1] ئاسمانگەڕێکی ئەمێرکی بوو.

## ئەی کیژۆڵە

گەر مانگ تریفەی لێ دزرا،
گەر جۆگەلەی ڕووباری دەچلە،
بێ ویستی خۆی، جێی گۆڕدرا،
باخەکانی زەردەلوویان وشك کردین،
کوردستانیان بە تاڵان برد،
مەلوول مەبە، وا بردرا!
با ئەژنۆی پۆڵات نەلەرزی،
کوردستانی بریندارمان،
ئەم ساڵیشی هەر نەهات بوو؛
بڵێ هیچی نەچاندرا!
مەحاڵە من بێ ئومێد بم؛
ساڵی دادێ، پڕ گەمەیە،
پڕ بەراتە؛ هەڵڵا و هۆریا!
خۆشترین ڕۆژ لە پاشتر دێ،
گەشترین گوڵ لە بەهاری ئایندەیە؛
بەڵێن درا! ئەرێ جوانێ!
ئاوازی هۆ شوانەی شەماڵ،
زوو یان درەنگ،
هەر دەبێ دەنگ بداتەوە،
ئەشکەنجە لە بیر باتەوە.
ئەی کیژۆڵە، لێت مزگێنی! بازێکم دی!
لە تاقی ئاسمانێ دەفڕی!
یێکجار بە سام دەی چریکان،

لاوانی لە خەو هەڵدەستان،
پڕ بە دەم دەیگوت -
(کوردینە! هاوار! خاوەن باوەڕینە!
ئەمڕۆ ڕۆژی تێکۆشانە، کاتی ڕزگاری کوردانە.)
ئەی کچۆڵە، قەت نەترسی،
هێرشەکانیان، پەلاماری بێ ئامانجن!
دوژمنەکان هەر قسە و تیر و توانجن،
بە حەقیقەت، زراوی لە تۆ ڕژاوە؛
زەندەقێکی لێنەماوە،
لێت دەترسێ؛ ترسنۆکە؛ چاو ترساوە!
هەموو یێك بن، هەموو وێکڕا، پۆڵای ڕەقیش دەپەڕێنین!
خودان خاکین؛ مافی خۆمان وەدەست دێنین!
ئەمڕۆش، خوشکێ، ئەو ڕۆژەیە،
کە پێویستی پێمان هەیە،
بە من - بە تۆ؛ ئاخر کاتی دووانەیە.
تۆش سەیرکە! سەیری دوورکە!
خەباتی تۆ، خەباتی من،
تریفە دزراوەکەی مانگ، دێنێتەوە،
ناپاڵم دەکوژێنێتەوە!
دەنگی ئێمە سروودێکە، ئازادی دەژیێنێتەوە،
ئەی خوشکۆڵە، پاشە ڕۆژمان زۆر ڕووناکە،
ئاسۆ گەشە، بێگەرد، پاکە؛
زووکە ڕابە، بۆی هەستەوە، ڕاپەڕینت، بۆ کورد چاکە!
١٩٦٨/١٢/٣ - هەولێر.

### نەسرین

کچە شەهیدێك بوو لە سەر جەنازەی باوکی ودم گرتبووی؛ نە دەگریا!

نەسرین - نەسرین،
ڕوحی باوکت پێویستی بە گریان نییە!
لە چاوت نەبارێ ئەسرین!
گەر تریفەی مانگ کوژاوە،
هیچ کات واتای ئەوە نادا، ژین بڕاوە!
باخی بەرداری زەردەلوو،
ئەگەر ئەمساڵ هات وشك بوو،
ڕێگە نەدەن ترس و لەرز داتان گرێ،
لە کوردستان،
وا ئەمساڵیش،
وەکوو ساڵانی پێشتریش،
هەر نەهات بوو!
دڵنیابە!
ساڵی دادێ هەمووی هاتە؛
ڕۆژانی خۆشە، بەراتە؛
خونچەی بەهار جوانتر دەگەشێنەوە!
خۆشی دێنێ، ناخۆشی بیر دەچێتەوە!
ئاوازی بەرزی ئەی ڕەقیب،
زوو، یان درەنگ،
هەر دەبێ دەنگ بداتەوە!
نەسرین، زەمان مزگێنی زۆری تێدایە،
ڕاستە ئەمڕۆمان نەهاتە؛

وا ئەمڕۆکە پڕ بەڵایە!
بەڵام شاخەکانی کوردستانمان،
سەدان هەڵۆیان لە سەرە؛
بن باڵی هەڵۆ سێبەرە،
سەر دەنووکی پڕ ئاوازە،
لانەی گەرمە؛ پڕ گەوهەرە!
ڕنەی هێمای تێکۆشانە،
خەبات مەرجی ئازادییە،
ئازادی قوڵغی ژیانە!
ئەمڕۆ خۆشە؛
کورد شەهیدی ڕزگاری دا؛
مەرجە هەر ئازادی دەبا.
با ئێستاکەش شەو بێ، تار بێ؛
شەوی تاریك تێدەپەڕێ؛ جا بەهار دێ!
نەسرین، بەیان ئاسۆی دوورە،
دوورێکە، بە بێ سنوورە!
بەڵام نەسرین، ئەم دوورییە،
پڕ خۆشییە؛ سەربەستییە؛ ڕووناکییە؛
زۆر بێگەردە،
هەموو لە هەمووی شادییە،
بێ ئەسرینە؛ ئازادییە، ئازادییە، ئازادییە.
١٩٦٨/١٢/٣ - هەولێر

**گەل پێکەنی!**

وا چریکەی لاوی کوردە؛
زەمین بەنگە؛ دەنگی مەردە!
لە دووررا دێت، عەقڵە، پەندە،
چوستە، ڕەندە؛ باهۆزی ئازادی کوردە!
خونچەی هیوای گەش، بێ گەردە!
ئامادیە لەم ڕێیەدا، گرەو لە سەر خوێنی دەکات!
مەحاڵە؛ هەر دەیباتەوە ئەو نەبەردە!
ئەمڕۆ با ڕۆژێکی تەنگ بێ؛
شەوەزەنگ بێ! کورد بێ زەنگ بێ!
لە پەرێز جوتیار بێ دەنگ بێ؛
دوژمنیشمان با ئەرژەنگ بێ!
ئەم ڕەشبگیر و کوشتنە، با جیهانی هەر لێی بەنگ بێ!
ڕۆژێك هەر دێ، کورد، سەرهەنگ بێ!
دەمێك هەر دێ، جیهان هەموو ئاگادار بێ
ئەو ڕۆژی کە ڕادەگیرێ، بردن، کوژتن؛
باخەکانی کوردستانمان گەورە دەبن!
هەر نامێنێ سووتانی ژن، تاڵان کردن،
ئەوەی تا ئێستاکەش بووە،
ئاون بۆ داری ئازادی، سروودن بۆ ڕۆژی شادی!
بەم کارانە، کورد قڕ نابن!
هەڕەمەکانی مێژوومان، لە ناو ناچن!
کاری کەمزانی ملهوڕ بوو، مردووی مێژووی ژیاندەوە،
بە هێزی ئاگر و ئاسن، ئیتر سەرکوت ناکرێنەوە!

ژیلەمۆی بزاڤی کوردە، بە دژ دانامرکێتەوە.
گەل ڕاپەڕی! ئیتر سەد جار بووەتە مەحاڵ،
کوردە هەستاوە، هەرگیز ناخەوێندرێتەوە!
دەستی کورد نابەسترێتەوە!
کوردی مەرد قەت چۆك دانادا،
قەت بەیداخی فڕێ نادا
هەموو، هەمووی لە ڕێگەیە،
لە سەنگەرە، پێشمەرگەیە!
ئاگرێکی وای کردەوە، پەیامبەری شۆڕشان بوو
لە ڕاست و چەپدا هەڵگیرسا؛
دڵی ناحەز پێی پڕ ژان بوو!
ئەم ئاگرە گڕەی شۆڕش،
کوردستانمان ڕزگار دەکا
جا پێکەنە کوردی هەژار؛
لەمەودوا خاك پڕ دەبێ لە گوڵ و بەیبوون
هەڵدەستنەوە ئەو مەردانەی لە پێناوی ئەمڕۆدا چوون!
گەلی کوردیش ئاهەنگ دەکا،
شارەکان دەڕازێنەوە،
پەممە و سور و زەرد و سەوز،
جل و بەرگی ئاڵ و واڵا، شەقامی ڕێك، تەلاری بەرز،
کورد شارەزا، کورد دانایە،
کورد نادۆڕێ، پێشەواکەی مستەفایە.

١٩٦٨/١٢/٤ - هەولێر

**(ئەم هۆزانەش ڕەقابەکەی وەزارەتی ئیعلامی بەغدا خنکاندی)**

**هاندەر**

جوتیار کوشتن، منداڵ گرتن،
ژن سووتاندن، تاڵان بردن،
ستەم، زیندان،
هێمای حوکمی ترسنۆکن،
هاندەری ژێر چەپۆڵۆکن،
کاروانچی نا گەڕێننەوە،
نەك هەر تەنیا کوردی خەوتوو،
مردووشیان لێ دەژێننەوە.

١٩٦٨/١٢/٤ - هەولێر.

## بۆ پێشمەرگە

بلیمەتی پێشمەرگە، باش لە مێژوو تێبگە،
ئەم مێژووەی کوردانە، وا پڕە لە ئەفسانە،
خەباتی بەرگری کورد باڵاترین داستانە!
ئەوەت بۆ دەگێڕتەوە کە باپیرەکەت کردی!
پاڵەوانەتی کوردە شایانی سەر بڵندی؛
نەترس و نەبەرد بووە، سەری دانەنواندووە!
لە زێنەفۆن، بۆ مەغۆل، تا دەگاتە عارەبان،
گەر فرت و فێڵیان نەبا،
زیندوویەکیان نەدەبوو پێ دانێتە سەر خاکمان!
پەتی قەنارەی دوژمن، هێزی ئاگر و ئاسن،
نەیتوانی کورد بکوژن؛ ئەوا هاتوونە مەیدان!
خەبات دژی ژێر دەستی، خۆڕاگری و سەربەستی؛
هەر دەگەینە ئازادان!
بۆردومانی شار و دێ،
کوشتنی منداڵ لە ڕێ،
نەهێلی لە بیر بچێ؛
گڕن گەنجان هاندەدەن،
دوژمنی کورد دەردەکەن!

١٩٦٨/١٢/٤ - هەولێر.

**بریا**

ئەی لاپەڕی ژینی پڕشەنگ
خۆزگە لای تۆ، وشەی نەدەنووسرای لە سەردێڕان.
ئەی ئاوازی شایی و ئاهەنگ،
خۆزگە تاکوو ڕۆژی نەمان، دەبوویتە ویردی سەر زمان.
هۆ کازیوەی خۆری بە سام،
خۆزگە هەرگیز ئاوا نابووی، شەو ناهات، ڕۆژ بە سەر ناچووی
ئەی گوڵی زەرد ئەی نەو نەمام
خۆزگە گەڵات نەدەوەری، هەر گەش دەمای هەتا
وەی تریفەی زیوینی مانگ،
خۆزگە هیچ ئاوا نەدەبووی، هەر پەناگەی شاعیر دەبووی.
هۆ ئاسمانی شینی ساماڵ،
خۆزگە هەور نەیدەگرتی، ڕووناکییەکەی نەدەبردی
بووکی بێ ناز، کچی ناسك،
بریا ژینت هەر شایی با، ناخۆشییت لە ڕێت نەدیبا.
گەنجی دڵسۆز، هێز و باسك،
خۆزیا دڵت هەروا خۆش با، شاد بای؛ ئاوازت پڕ جۆش با
ئەی لاوێتی، کانگای بەزم،
ئارامت بێ بۆ سەردەمێك، تا دەم دەخەیتە سەر دەمێك.
وای بەهاری بەزم و ڕەزم،
خۆزگە لە گشت سەیرانگەکان گوڵاڵەت بە گەشی دەمان.
داهێنەری گشت شتی چاك
بـ لە خاکی کوردستان، ئازادیت یێك ڕۆژ دەباران.
١٩٦٨/١٢/١٤ – هەولێر.

## خوشکی بەڕێز

لە پاشەڕۆژ، لە ئەندێشەی جوانی بێ سۆز، بیر بکەوە!
لە نەفامی، لە ناکامی، دوور بکەوە.
چی درۆیە، ڕسوای بکە؛
لەگەڵ ڕاستی سەودای بکە، چی جوانییە، بەرپای بکە؛
عەقڵ بکە پێشڕەوی خۆت؛ ئایین بکە پەیڕەوی خۆت.
ئەم قشتی و ئەو جوانییە، خەڵاتی خواوەندانییە،
فەرمانی یێکگرتن دەدا؛
ڕق و قین لە دڵ لادەبا؛ ژین خۆش دەکا.
ڕووداو دەستکردی مرۆیە؛ جا یا ڕاستە یان درۆیە!
هەر چۆنیش بێ، سەرنجێکت ڕادەکێشێ!
هەندێ چەوتی، بە بێ هەستی،
بە شایەدێکی درۆزنێك، دەبتە ڕاستی!
فریوی مێشکی ژیر دەدا، ئاگادار بە وات لێدەکا!
ئەو تابلۆیەی ڕەنگا و ڕەنگە، بێ گەردە وەکوو گەزەنگە،
هەزار جار سەرچیغت دەبا،
دەگاتە پلەی فڕ و فێڵ، پیرت لێ دەبێتە جەحێڵ!
خوشکی بەڕێز، ڕوخساری خۆت لە ئاوێنە، جوانێکی خەڵەتێنە،
ڕاست و چەپی تێکەڵاوە، بیابانێکە بێ ئاوە!
پێیدا نەچی، لێی ڕوودەچی،
گەنجینەی خۆت لە دەست دەچی!

١٩٦٨/١٢/١٧ - هەولێر.

**شیرینەکەم**

شۆڕشەکەمان هێدی هێدی گەشە دەکا،
ڕاستە کە دوژمنی سەر سەخت،
باخەکانمان دەسووتێنێ،
گوندەکانمان تاڵان دەکا،
کێڵگەکانمان وێران دەکا،
گەورە و بچووك، بە ڕەشبگیر، دەخنکێنێ،
بەڵام شیرین، ڕێگە قەت بە ترس نەدەی؛
مل کەچ نەکەی،
ژیانی خۆش هەر دێتەوە؛ کڕنۆش لە بۆ دوژمن نەبەی.
دار بەڕووە ژار خواردووەکەش دەژییێتەوە.
دڵ خۆش دەبێت،
تەنگانەمان لە بیر دەچێت،
ئەو کاروانەی کەوتۆتە ڕێ،
هەر دێتەوە!
ئەو ڕۆژ هەر دێ،
زەردەشت دیسان بە کوردستان گوزەر بکا،
ئاڤێستای پیرۆزی بێنێ،
ئا لەو ڕۆژی سەرکوتکاران،
بکوژی عیشق و دڵداران،
بەرانبەرت، شیرینەکەم، ڕادەوەستن،
ڕوو ڕەش دەبن،
حەسرەت دەیانڕزێنتەوە.
شیرینەکەم، من ئەو کوردەم،

ئەتاتورك نەی مراندم،
ڕەزا شا ئیعدامی کردم،
بەس خۆی ڕزی، نەیڕزاندم،
ئینگلیس خاکی دابەش کردم،
پەڵەی ڕەشی مێژووی چێرچڵ، نەیبەزاندم.
شیرینەکەم، کورد گەلێکە،
میوەی خاکەکەی شیرینە،
چاو هەڵبڕە، پێشمەرگەکانی ببینە،
چی دەکەن، چییان کردووە،
کورد ئەو کەسە، نەمردووە؛
هەر زیندووە!
ئیتر - ئیتر ببڕای ببڕ،
لە کوردستان،
لە نیشتمانی خەو خۆشان،
نوستن لە دوژمن حەرامە،
وەدەرنانی کوردکوژ لێرە،
ئەوپەڕ ئاوات و مەرامە!
شۆڕش لە دوو شۆڕش هەر دێ،
تا ئەو ڕۆژەی ڕۆژمان هەڵدێ،
هێدی - هێدی بۆم پێکەنە،
دامەمێنێ،
ئەی خاوەنی جوانترین زەردەخەنە!

١٩٦٨/١٢/١٧ - هەولێر.

**هەر چییێك بام**

گرینگ نەبوو، هەر چی باما؛
تەنیا گیانلەبەر نەباما!
زۆر پێم خۆش بوو،
لە هەڵبەستێك دێڕێك بووام.
لە سەر لێو، ئاوازێك بووام،
بۆ مەبەستێك بخوێندرابام؛
یان هەر نەبام!
پیرۆزتر بووم،
دڵخۆشتر بووم،
جوانتر بووم لەوەی کە وا،
لە دڵم بڕوێنی هیوا،
لە ناخ چۆلایی سینەمدا.
ئەی هاوڕێکەم!
سەیری ڕێگەم!
بە ئاخ و ناڵە تەنراوە، ئەم ڕێگەیەم!
دەور و بەرم، خەمە، خوێنە،
مافەکانم لێ خوراوە، لەم ڕێگەیەم!
ئاواتمان لێ دوور کراوە، لەم ڕێگەیەم!
بەڵام ژیان، هەر خونچەیە؛
قوت نەکراوە، لەم ڕێگەیە!
با ئەمڕۆ بێستان وشك بێ،
با هەندێك مافم لە دەست چێ،

بەڵام سبەی، هەموو شتێ،
ورد و درشت، دەژیێتەوە؛
هەستم چیتر ناپەشۆکێ،
ناخەڵەتێ، فریو نادرێ،
لە سەر ڕەگی جارانی خۆی،
شین و جوان دەڕوێتەوە.
لەم ڕێگەیە!
با ئێستێکە، مێشکم شەکەت و ماندوو بێ،
دەر بە دەر بم؛
قوڕ بە سەر بم؛
بریندار بم؛ لالە زار بم؛
با هەندێ خەونم لە ناو چێ،
بە نەمانی زیندە خەون، ژیانی کورد نابڕێتەوە.
لەم ڕێگەیە! با ڕامماڵێ هیوای زبر،
ئومێد هەرگیز ناشرێتەوە،
هێشتا بێدەنگ،
لە شەوە زەنگ،
وەکوو شاهەنگ،
دەڕۆم زۆر مەنگ،
ڕێگەی ترس دەڕۆم تا سەر، دەڕۆم و ناگەڕێمەوە.
بۆ کوێم دەبا؛ خۆزگە نەبا، ئەم ڕێگەیە؟
بۆ کوێ دەڕۆم؟ بۆ کوێ ئەی خۆم؟
خۆزگە نەڕۆم! خۆزگە نەبام!

١٩٦٨/١٢/١٧ - هەولێر.

**ناتوانی من بڕەنجێنی**

لەبەر چییە وا گەرەکتە،
لە من دوور بیت؟!
بەم دوورییەت دەمڕەنجێنی؟
هۆی چییە هێندە مەرەقتە؛
خەبات دەکەی،
تاکوو ورەم بڕووخێنی؟
دڵنیابە، من ناڕەنجێم!
ورەم کێوی هەندرێنە!
هەندرێن دوژمن بەزێنە!
تۆ دەفەوتێی؛
تۆ دەڕووخێی؛
بەڵام هەرگیز ناملەرزێنی؛
من تامی تۆم هەڵمژیوە،
ناخ کاکڵەی تۆم ناسیوە،
جێی نووکی دەرزیش نەماوە،
لە سەر تا پێت، سەری لە لێوم نەدابێت،
یان پەنجەمی لێنەخشابێت.
لە بیرت چوو! لە جێی ژوانان، مەمەکانت
لە پەنایان؛ لە سەربانان؛
باڵای باریك؛ نەرمە ڕانت،
لە باوەش و ناو لەپم بوون!
کوڵمەکانت کە دەم مژین،

لە خۆشیانا، پەمبە دەبوون!
ئەی گەردەنت؟
خەت و خاڵی سەر تا پای هەموو بەدەنت؟
شان و ملت،
بۆن گوڵاوی بن هەنگڵت،
زگی نەرم و سمتی خڕت،
هەموو جەستەی تورت و پڕت،
جێ ماوە لە جەستەت بیڵێم،
نەمشێلابێ وەك کێڵگەی خۆم؟
دەی! لە پاش چی پەشیمانی؟
ئارەزووتە بمڕەنجێنی؟
من ناڕەنجێم؛ تامی تۆم تێر هەڵمژیوە،
من سکۆڵەی دڵتم دیوە،
من گوێچکۆڵەی دڵتم دیوە،
بۆچ دەتەوێ بمڕەنجێنی؟
چم لێ کردی؟ چت لێ کردم؟!
ئێستا بۆ چی وا تۆراوی؟
لە سەر چییە؛ بووەتە هیوات بمشێوێنی؟
بەسە شێتی! خۆت بامەدە،
وەرە باوەش، لێم لامەدە،
تا بەردێکی لە سەر دانێم؛
باش بزانە، زۆر مەحاڵە، بمڕەنجێنی!
یەقینت بێت، من بە تۆ، هەرگیز ناڕەنجێم!
١٩٦٨/١٢/١٧ - هەولێر.

### نامەی پێشمەرگەیێك

هۆ ئاوازە خوێن شیرینە بێ نازەکەم،
بۆیێ ئێستا دوورم لە تۆ؛ لە سەر ڕێمە؛
خەریکم سنوور دەشکێنم!
ئازادی تۆ، ئاوازەکەم، دوا قۆناغمە، جێمە!
ئەی پەپوولەی نامرادم؛
تۆش لە ماڵێ، لە سەر پەڕی پەڕاوێکی بێ ناونیشان،
لە نێوان هەموو هێلەکان،
پێش پیتەکان؛ پاش وشەکان؛
لە ناوەندی گشت ڕستەکان؛
جار و بارێك یادم کەوە؛
وێنەم بێنەوە بەر چاوان!
بە دڵێکی پاك، بپاڕێوە لە خودای تاك؛
بوارمان دا، وەکوو پێشان، ئەی کچی چاك!
لە باوەشێت بکەمەوە؛
دڵنیا بە؛ هەر دێمەوە!
هۆ ئاوازە خوێن شیرینە بێ نازەکەم،
قسەکانت لە یاد ماون؛
لە بیرتانە ڕۆژێك گوتم –
شیرینەکەم،
لەم ژیانە شتێك نییە وەك تۆ، نەرم،
وەك هەناسەی خۆشیت، گەرم،
وەك دوو چاوت بێت، پڕ شەرم؟

شتێك نییه له تەماشات،
پڕ سۆزتر بێ،
له ڕوخسارت، دڵگیرتر بێ؟
ئاوازەکەم، بیرت ماوە، هەناسەکەم؟
ئەی هەنسکه هەر تازەکەم،
بۆت دەنووسم؛
من هەڵه بووم؛
ئاخر، دیتم! له نێو لەپی تۆ نەرمتر،
ڕایەخی ڕێگەی ئازادی کوردستانم؛
بەردی سەر کێوی سەرکەشی نیشتمانم.
له هەناسەت زۆر گەرمتر؛
پەلاماری هەڤاڵە پێشمەرگەکانم
که دەیکەنه سەر سەنگەری توندکراوی دوژمنانم.
بەڵێ، بینیم! له تەماشای تۆ پڕ سۆزتر؛
کاتێك که دێن، سێرە دەگرن، تیرەندازانی وڵاتم.
ئاواز، دیتم، له ڕوخساری تۆ ناسکتر؛
سیمای گەشی پێشمەرگەکان،
که شەکەتن، له هەڵمەتی ڕزگاری خاکی کوردستان!
هۆ ئاوازە خوێن شیرینه بێ نازەکەم،
دەزانی بۆ چی ئەمانه،
له گەڵ زاتی حەزرەتی تۆ، وا له تەرازووی من دانه؟
چونکه گیانه،
ژینی وانیش، له پێناوی زەردەخەنەی دوو لێوانه.
١٩٦٨/١٢/٢٦ – هەولێر

## من نامـرم!

ئایا دەمرم؟
من چۆن دەمرم؟
دەمم هێشتا پڕی گوڵە،
هەستم مێرگی دڵدارییە،
سینەم ئێستاش شوورەی دڵە!
کازیوەی سەد بیری نوێ،
لە ناو مێشکم گەڵای تەڕە،
لە سەر چڵە!
تازە عەشقی کێوی سەفین،
دەشتی قەراج، باوە گوڕگوڕ،
گۆمی وان و شاخی حەمرین، ملاوملە!
ئاسۆی ئازادی ڕەوشەنە،
پڕ گوڵشەنە،
هەرواش دەبێ تاکوو پێکبێن،
ئیتر گەلۆ،
هەتا ئێستا،
مردنمان چۆن مەحاڵ بووە،
باوەڕتان بێ،
لە ئایندەش موستەحیلە!

١٩٦٨/١٢/٥ - هەولێر.

## ١٩٦٩

### باوەڕ دەکەم

تۆم خۆشدەوێ؛ خۆشەویستی تۆ، باوەڕە؛
چونکە ڕاستی، بۆم بوویتە شت،
منیش لەم سەدەی بیستەمە، هەر کت و مت،
چاوم لێیە شتێك هەبێ، ڕاست و دروست،
هی خۆمان بێ، بۆ خۆمان بێ؛ ئاخر ئێمە ڕاستپەرستین؛
ڕاناوەستین؛ چیغی ئازادی دەبەستین!
بۆ چی باوەڕت پێ بێنم، تا نەتبێنم؟
تۆ، تا ئێستا، هەر خەیاڵی، سێبەرێکی بە بێ جەستە،
تۆ ناوێکی هەر هەڵبەستە؛
هێشتا نەهاتیە بەر چاوم، نەدەمناسی، نەدەشزانی چییە ناوم!
تۆ، تا ئێستا، تەنیا خەونی! منیش بڕوام بە خەو نییە؛
عەقیدەی من هەر ڕاستییە!
خەیاڵی من خۆم دامهێنا، خۆ ئەگینا،
تۆ لە بنچینەدا نەبووی، من، دامڕشتووی؛
من خۆم ڕاستم، من، ڕاستیمە، من، مێشکی خۆشەویستیمە،
تۆش ئەندێشەی ئەم ڕاستییەی، واتا تۆش هەی!
کەواتە تۆ حەقیقەتی، خاوەن بەهای پڕ قیمەتی،
جا بۆیێ من، تا ناخی مۆخی ئێسقانم،
لە پێناو تۆیە ژیانم،
هەر پێت دەگەم، بۆ من شادی،
ئەوپەڕ ئاواتم..........ئازادی.

١٩٦٩/٢/٢٥ - هەولێر.

**هەستی ناسك**

هەستەکانم، ئومێد و ئـاوات و خۆشـین،
دوورن لە ڕك، دوورن لە قین، عاشـق بە هەسـتی من دەژین.
هەڵبەسـتی مـــــــن برووسـکەنە،
لــــە تاریکی ترووسکەنـــــە، ڕێبازێکـــن پــڕ لـە ئەوین.
هۆنراوەی مـــــــــن یێکسـانینە،
ســـەربەســتینە، ئـازادینە، هەمـوو هـزرن، پـڕن لە دیـن!
یاسایێکـــن ناسڕێنـــــــــــەوە،
فکـر پێیـان دەژییێتــــەوە، لە قورئـان عەقـڵ وەردەگرین.
هۆنــــــراوەم ژینـــــن، سادەنە،
کـــورد بەدەنـــن، لایلایەنـــە شەکرن، شیرینـتر لـە هەنگوین.
هەڵبەسـتی مــــــن ئاون، نـانن،
بۆ هەژار چەترن، ســەیوانن، بتەو وەکـوو شاخـی حەمرین.
لـــــــەم کوردسـتانـــە بەهرەنە،
پشت و پەنـــــای نەتەوەنە؛ لەگەڵ مێشکی پووچ لە شەڕین،
لـــە خــــــۆم زۆر پتر دەمێنن،
دڵی عاشـــقان ڕادەژێـــــنن، بــەم هۆنراوانـــە دڵ خۆشین.
١٩٦٩/٢/٢٧ - هەولێر.

**جەژنانەی پێشمەرگە**

دەڵێن جەژنە!سبەی جەژنە!

گەر جەژن بوو، چیت پێشکێش کەم گیانە، باشە؟

ئایا ماچێك، لەم لێوانەی لە بەر هەتاودا، سووتانت؟

یان دانیشم لە بەرانبەر، ئەم چاوە کارمامزییانەت،

ئاخر، خۆشی و کامەرانی، لە بەرهەمی دیدەکانت،

قەت نایەنە ناو تەرازووی گوڵ و دڵ و بەژن و ژوانت!

یانە گیانە، لە باوەشم جێت کەمەوە،

یان فرمێسکت بسڕمەوە؟

هەرچی بکەم، پارسەنگ نابن لەگەڵ سۆزی قسەکانت!

بە دەستێکی بێ دیاریمە،

وا هاتوومە، هەتا دڵت بدەمەوە!

تاکوو دڵم بدەیەوە!

هیچ ملوانکەم نەهێناوە، تا بیخەمە دەوری ملت،

من نامەوێ تۆقێکی وەك کۆتی دوژمن، لە ملتان بێت!

ببتە پاسەوانی دڵت!

من گەرەکمە، گەردنی زەرد، هەر ئازاد بن،

نەکەونە ناو داوی باسکی کەسی کرمن!

لە پێناوی چاوی ڕەش و گەردەنی زەرد و جوانت،

هاتمە ڕیزی ئەو کەسانەی، بۆ ئازادیت ڕاوەستاون! بوومە شوانت!

من ئێستاکە، پێشمەرگەمە،

باوەڕ هەموو سەرمایەمە،

ئامانجە، میهرە، مایەمە!

بەرەو ئاوات، لەو ڕێگەمە،
خوێنم بە هیوای ئازادی، زۆر ڕشتووە!
ئەمانەش هەموو، خانمەکەم، بۆ تۆ بووە!
تا ئازاد بی، خۆش و شاد بی!
هەرچی بتی ژێردەستییە، دەیشکێنم!
ئەوەی حاکم پەرستییە، دەیڕوخێنم!
بۆیێ کیژێ، لە مەیدانم،
کاشکا ڕۆژێك، یێك بەیداخێکت بۆ دێنم،
تا لە سەرت بئاڵێنم!
ئەو ڕۆژ جەژنت لێ پیرۆزکەم،
هەر ئەو ڕۆژی؛ بێم نەورۆزکەم!
بەڵام ئێستا، پێشمەرگەمە،
ئەم قسانەش، هۆ خانمەکەم،
گشت توانا و جەژنانەمە!

١٩٦٩/٣/٢١ - هەولێر.

**بــــۆچ؟**

بۆچ ژیانمان پێ بەخشـــرا، گـــەر تامی خۆشی نەچێژین؟
مانای بەرزی ژیان چییە؛ گەر ئاوازی خۆش نەبێژین؟
بۆچی دەژیــن ئێمــە ئەگـــەر لــە بــن پێیە پانەکانمان
گوڵی بەهار پــــــــــان کەینەوە، یان تەرمی لاوان
وەرن با یێك بین، با چاك بین، با لەگەڵ یێکتر دڵ پاك بین،
با لە سەر ڕێی یێکتر، برا، گوڵی ڕەنگاوڕەنگ بڕێژین.
١٩٦٩/٤/١٦ - هەولێر.

**چەند پرسیارێك**

**پرسیارەکان**

بەهار بە چ ڕوو، گوڵی ڕەنگاوڕەنگ دەگەشێنییەوە؟
زەمین، پرسیار هات، زەوی پڕ پیتت چۆن دەژیێنیەوە؟
ئەی تۆ، هەی ئاسمان! بە چ ڕووێکە، شین داگەڕاوی؟
هـــــەورە ڕەشەکان، وا بـــــزر دەکـــــەی،
تۆش هەی دڵی ڕەق؛ چ هەســتێکـت هەس، وا
ئـــەم لێوە وشکەت چۆن ڕەباس دەبێ، تەڕ دەبێتەوە؟
ئەی کچی قەشەنگ، تۆ بە چ چێژێك، وا ڕێگا دەدەی،
بەرگــی ڕەنگاوڕەنــگ، جەستەی ناسکت
تۆش ئەی پیرەمێرد، چۆنە وا پۆشـــتەی، چت هاتەوە
تا پێستی چــاوت، لەگـــەڵ پێکەنین، بــۆ یێك بێتەوە؟

**وەڵامی بەهار**

بەرۆکم مەگرە؛ گوڵی بەهاریش وەك تۆ پــەژارەن!
کانیاوەکانیــش، ژاریـــان تێکراوە، خڵت و
گوڵی ســووری من کە تۆ دەیبینی، شـــەرمەزاری
حاجیلە و لاولاو، خەمباری ئێـــــــــوەن، خەو و
چۆم و ڕووبار و چوار وەرزی ساڵن، لە تەنگانەدان،
ئەشك و ئەسرینە، نزگـــــرە و گریان، سامـــی ئەم

**وەڵامی زەوی**

هیچ نزا و گریان، کارم تێناکات، وەکوو سەرخۆشم
ئـــاوم سازگارە، دنیام بەهـــارە، هـــەردەم لـــە
د ن کە گریا، من فریادڕەسیم، باران هەڵدەمژم،
دەیدەمـــەوە خـــاك، تـــا بژیێتەوە، بەمـــەش

**وەڵامی ئاسمان**

ئاسمان هەمیشە خەم هەڵگرمانە، بۆتان بەیانکەم
گریانی پیتـــە، پـــڕ خـــێر و بـــێرە، بۆتـــان
هەور و سامالّی هەر بۆ ئینسانە، مرۆڤی دانـــــا!
ئەگەر ئەو نەیکات، خـــاك بیابانـە، ژین دەبتە
دەستت پانکەوە، هەر بپاڕێوە، بــــە خەیاڵ بژی،
تا نێیتە مەیدان، ئارەق نەڕێــــــژی، هیچـــــت پێ

**وەڵامی دڵ**

من دەتبزوێنم، خۆم دەتژیێنم، دەســـەڵات خۆمم
عەشقت بـــۆ دێنـم، خەمت بۆ دێنم، کارەسات
من وات لێ دەکەم، تا دابمێنی، خۆت بڕەخسێنی،
ئەگـــــــەر نەگونجێنی، سارد دەبیتــــەوە، جـــــا

**وەڵامی کچ**

گیانە، لاوەکەم، بزانە ڕێکیم، هـــــەر لە خۆشییە
ئازاریـــــان دەدام لــــە دەشت و لە دەر؛ ئێستام وا
گەل بە ئاگایە، گوڵ لە ئارایـــــە؛ خەفەت نەمایە
خوێنمان نارژێـــــت، خانـــــم نا کوژرێت، ئەمـــەش

**وەڵامی پیرەمێرد**

من خەبـاتم کرد؛ هەموو تەمەنم، بۆیێ ئـازادین؛
چـــۆن پێنەکەنـــین، شایی نەگێڕیـن؛ وا هەموو
خاوەنی خاك و خودانی قســــە و کاتی خۆممانین،
گشت هــــی خۆمانــــــە، ترس نەماوە، لە دوژمن

١٩٦٩/٣/٣٠ - هەولێر.

**خەفەت**

دەڕۆیشتم، لە دەریای شیتاق و خەفـــەت
زۆر دوور دەچووم، بـێ پشتیوان و بێ مەینەت!
تەنیا نەبووم، لێ بێ هیوا بووم، بێ ئامانج
بـۆ خـۆم نەبێ، بـــۆ هەمووانـــم پڕ لە قازانج
ئەم ڕووداوەی ڕێی لێگرتم، نەناسراو بوو،
چەند ناخۆش بوو، هەندەش تام و سۆزی هەبوو
پەژارەی دام، دڵی بــــــردم، هەستی ڕەواند
ڕاست وەك کوردێکی مــاڵ سووتاو، تێکی شکانــد
لەو دەمیدا، هەموو هەستی بووژانــــدەوە
تۆپی یاری منداڵەکان کەللـــەی سەری هەژاندەوە
کاتێك کە وا بە توند و تاو، دای لـــــە سەرم
منداڵیم هاتەوە بیرم، لە ئێستاکەش، بێ خەبـەرم!
منداڵەکان گورزیان وەشانــد، گرژینـــەوە؛
چونکـــە هیـچ فێڵ لایان نەبـــوو، شێن بوونەوە!
ناچار، منیش وەك وانـــم کـــرد و پێکەنیم،
پەشیمان بـــوون! منیش بـــە دیداریـــان خەنیم!
لە وان فێر بووم، خەمی مرۆڤ گوللـــەیێکە؛
دەنگـــی نییـــە و هەوابەنـــدی کوشتارێکـــە!
لەو دەمەوە پەیمانم دا، بێ دڵ نەبــــم
تاکوو مابـــم، بەنـــدەی بـــەرزی و نزمـــی نەبم.
١٩٦٩/٤/٦ - هەولێر.

لەو کۆڵانەی لە گەڕەکی مستەوفیرا بۆ مزگەوتی خانەقا دەڕوات ئیلهامەکە هات.

**لە پێناو هیچ!**

ئاڵای خراپە و خراپەکاران،
لە هەورازەوە ڕێ دەدرێـــن، چین، چین!
هێشتا بڵندە و نایتە خوارەوە،
لە ئاســۆی سووری وڵاتی بێ ژین!
لایەنگرانی بێ قســـە و پەیمان،
بـــە دوای نێچیرن، لـــە دۆڵی ڕەنگین!
ڕاوە کێچ دەکەن لە کاسەی سەری
کــوژراو بە نــاهەق، نــاڕەوا، بە قــین،
دەستی بە خوێنە ڕەفتاری سامناك،
جێ پەنجەی پیســـە ئەژدیهـا و زۆڵە
سەگێکی هـارە، پــڕ دەداتە گەل
ڕێگری دەکات، لەم دەشت و چۆڵە
زەنگێکـــە لە دژی ئاینـــدەی گەلـــە
پەردەی تاریکە، دەنگی دەهۆڵە
سێبەری تـــارە، تامی زەرەنـــدە
ناخۆشی کردووە، هەمـووی ئەم دۆڵە
لە بان کەللـــەی سەر، وا هەڵدەپەڕێ
هەڵپەڕکێی خەم و شایـی دڕندان
قەنــارە دێنن، کـــورد دەترسێنن
شـــێر هیچ ناترسی لە ڕێـوی بیابان
با هەر خەریك بن، کورد ببڕنـــەوە
بۆی ناچێتە سەر، شێتی بێ ویژدان
نیهادیان نییە، ئەخلاقیان نییە!
ڕەفتار سەگی هـــــار، بێ ڕەحمە دڵیان

سەدان سێدارە، ئەوا لەم شارە،
کورد دەخنکێنن؛ خەڵکی خەمبارە
خوشکان و دایکان چاو پڕ
هەناسە تەنگن، دڵیان بێزارە
ئاسمان و زەمین، بۆ ئێمە دەگرین
لە داخمان گێژن، گشت لەم ڕەفتارە
ئەم نووزە و ناڵە، لە پێناو کوردە
کوردی هەژاریش نامرێ؛ سەردارە
ئایا نەزانن؟ یان هەر نازانن
کە قەت ناتوانن، کوردان پەك بخەن؟
وا لە چاوەڕێین، دڵمان ناسرەوێ
تا ئەو ڕۆژە دێ، کورد هەڵمەت دەبەن.
١٩٦٩/٤/١٦ - هەولێر.

**ماف و سەربەستی**

بــرا لە پێناو ماف و سەربەستی   تاوەکوو ماوی، هیچ نەکەی سستی
ئەو ژینە سازە ئازاد و قۆشەنگ   ژێردەستی پێکە وەك بت پەرستی.
١٩٦٩/٥/٢ - هەولێر.

## تۆ جوانی

خۆت شۆخ و شەنگی شیرین زوبانی
باریك و ڕێکی؛ خۆشی ژیانی
زۆر ئارەزوومە، هەر لە بەر چاو بی
تۆ دیمەنێکی نایابی، جوانی
پێویستیم هەر تۆی، تا بتدوێنم
تەماشات بکەم ناوت بهێنم
عەقڵ بەندەی تۆ، دڵ مەیلی تۆیە
وا بۆ من بوویە خڕۆکەی
بە عەقڵ و فیکر و بە بوون و دڵم
ئارەزوو دەکەم قۆڵ کەیە ملم
هەر ناوە ناوەش گەر لێم وەربگری
بۆتی دەنێرم شیعرێکی گوڵم
گڕی چاوانت بۆم هۆش و هەستە
ژینی ئایندەم ئەتۆی مەبەستە
ڕێی قوتابخانەت، بۆتە قیبلەی من
چاکەیێ بکە؛ ئاواز مەوەستە

١٩٦٩/٤/٢٠ - هەولێر.

## پێشمەرگە

سەرکاروانی پەیدابوونمان،
پێشمەرگەیە!
چرای ڕێگەی هاتووچوونمان،
پێشمەرگەیە!
پێش سەنگەری ڕزگاربوونمان،
پێشمەرگەیە!
بەندەری کەشتی هەبوونمان،
پێشمەرگەیە!
خەونی گەورەی بە کورد بوونمان،
پێشمەرگەیە!
مەشخەڵی لە ناو نەچوونمان،
پێشمەرگەیە!

١٩٦٩/٩/٢٨ - هەولێر.

**له بیرم مەکە**

تۆم خۆشدەوێ، خۆشەویستیم لە بۆ خودا،
زۆر تۆم دەوێ، حەزم لێیە، نەبِی جودا، زوو بی پەیدا،
باش دەزانم، لە ناو دەچن هەڵبەست و هەست،
هەڵدەپڕۆکێت پەڕی مەبەست!
شەقشەق دەبێت داوی پەیوەست!
بەس ئەوینت لەلام دەژی، وەکوو هەڵبەست،
بۆم دەمێنتەوە، لە بەر دەست!
لە یاد مەکە، ئەوینی من،
قسەی خۆش و شیرینی من، دڵ و شیعر و برینی من.
خۆشەویستیت، لە ناخمە،
ئاو و بادە و بەرداخمە،
باوەڕت بێت، وەك باوەڕمە بەم خودایە،
لە تاریکی، ئەوینی تۆ بۆم چرایە.
خۆشی ژیان دەبڕێتەوە،
گۆرانی خۆش، لە یاد دەچێت، دەسڕێتەوە!
بەڵام نابێت لە بیرتکەم؛ یادت نهێنی ژیانە، تا من مابم دەمێنتەوە!
لە بیرت بێ، خۆشەویستیت نەقشی سەر بەرد،
هەر تەڕ بێت، دەدرەوشێتەوە!
کێیە ووتی - خۆشەویستی دووایی دێ و نامێنتەوە،
هەوای پیسی هەڵکێشاوە،
خۆشەویستیت ناسڕێتەوە؛
تەڕە، ئاوە! کانییێکە؛ وشك ناکا، نابڕێتەوە!

١٩٦٩/٥/٢ - هەولێر.

## ئاوازێك بۆ شاعیران

ئەی هەستیارینە! بــۆ کــوردان بەسـە باسی دڵــــداری
هەڵبەســـتمان دەوێ، بۆ دوژمن تاڵبێ، وەك ژاری ماری
وەکوو شەکـــراو و شەهـد و شیرین بێ، بۆ کوردەواری
هەر دووك بینۆشن، بۆ کورد چارەسەر، بـــۆ وان بێزاری

کورد هەر پێویستی بە هەستی سووکە، هەڵبەستی ژیان
بەس دەرخواردی دەن، مــــووی زولفی یار و ژاراوی ڤیان
وا ســـــەدەی بیستەم، بـــەرەو لێژییە، تۆ بــۆی هەڵکشێ
قـــــەدەر بگـــۆڕە، مێژوو ڕاستکـــەوە، وشیار بـــە، زۆرزان

ڕەخنەی بێ قەڵەم؛ ڕووبینی بێ ڕەگ؛ دەنگی زل، بێکار
ڕیسوا و نامۆنــە؛ بە بایــدا هەڵـــدە، مەیخە سەر دیوار
هەڵبەست تەتڵەکــە، چـاك - پـاك بیبێژە، ئینجا بیرێـژە،
هەڵیسەنگێنــە، بــاش بیرەنگێنــــە، تـــا بێتە ســــەر

ئــەی شاعـیر بەســـە! بەند و ئەسیری کیژی عەبا ڕەش،
کچێك قایــل بێت، بە بەندی سەرپۆش، وەکوو قەلەڕەش
شایانی نییە، نـە هەست نە هەڵبەست، نە دڵ و نە جۆش
ئەو شۆخ قابیلی هەڵبەستی منە، ڕوو خۆش و چاو گەش

کوردستان ئێستا تاریکـە شـەوە، تاڵـــــە ژیانمان،
باسی بەیانی بکـــە و بینووســـە، هیـوا و ئاواتمان،
خەیاڵی ئـەو ڕۆژ چاك بچەسپێنە، کە ئازاد دەبین،
دەوڵەتی کورد و سەربەخۆ و ئازاد خاکی کوردستان

١٩٦٩/٥/١١ – هەولێر.

## هیوا

ئەو هێلانەی سووتاندیان؛
یان ئەو کۆرپەیەی کوشتیان،
یان ئەو دایکەی، بزریان کرد و بردیان؛
یان ئەو گوندەی،
کە لەگەڵ خاك یێکسانیان کرد؛ ڕووخاندیان،
یان ئەو گەنجەی لە داریان دا،
جەستەکەشیان دوور تێهەڵدا، لە بیابان،
ناگەڕێنەوە هیچ کامیان!
تەنیا هەر یێك چاریان هەیە،
بە هیوا بن؛ دەبێ وەگرین تۆڵەیان!

١٩٦٩/٥/٢٩ - هەولێر.

**خەناوکەیێکی یادگاری**

لە ١٩٦٩/١/١٧ دەستم بە داڕشتنی کرد.

١

ژینی منداڵ بێ یاسایە، گاڵتەیە، هەرا و هۆریایە!
کە منداڵ بوو، لەو دەمی تەمەن چەند ساڵ بوو،
ژیان هەر وا کرچ و کاڵ بوو! ڕۆژ وەك ئێستا باڵندەیێکی بێ بە بوو!
یان بەفر بوو، یان باران بوو، یان هەور بوو یان ساماڵ بوو.
سەیرە ئێستا چۆنە وایە! ناکرێت بڵێی ئێستا چۆنە، هەر وا ئاڵ بوو!
ئەوەی هەبوو، یاسای خوا بوو، خۆی کەماڵ بوو،
دوور لە کەند و جۆم و چاڵ بوو! ئێستا نەبوو، ئەو کات ماڵ بوو!

٢

لەو ماڵەم ماڵئاوایی کرد؛
فڕی، ڕۆیی بەرەو بیرەوەری بێدەنگ!
بەرەو مێژوو، یادگاری ڕۆژانی تاریك؛ وەك شەوەزەنگ!
بۆ پشت گردی ساڵانێك چوو!
چونکە وایە! ناکرێت بڵێی یاسای خوایە،
ئێستا چۆنە، وا هاتووە و هەر وا چووە و هەر وا بووە!

***

کاتێك کە کەمێك هەڵاش بووم،
لە هاوینان، هەرکە شەوێك مانگەشەو دەبوو،
ئێمەی منداڵ، شاییمان بوو،
پێدەکەنی مانگ لە ئاسمان، دەهاتینە دەر لە ماڵان،
لە پشت مزگەوت، ڕێزمان دەبەست، (قیڕمان) دەکرد،
هەردوو (سەردار)، هێندەی یێکتر، گەمەزانمان، (لاپیڕ) دەکرد،

دابەش دەبووینە دوو بەرە، دوو بەرەی دۆست، بێ کەسەرە!
چاوشلکانێمان لێی دەکرد،
بۆ (چاوشارکێ)، سەکۆی مزگەوتی گوند (شار) بوو،
مەلا لە میحراب دیاربوو،
دڵدەرەوە بوو لە بۆمان! دژی ترسان!
چونکە هەر دەیانترساندین؛ دەیانگوت شەو، (جنۆکە)ی شەڕ بەرەڵایە!!
ناکرێت بڵێی یاسای خوایە، ئێستا چۆنە، وا هاتووە و هەر وا بووە!
***
بە هێمنی غارمان دەدا،
کپ و بێدەنگ، تاکوو هێزمان لێدەبڕا، ڕاوی یێکترمان دەنا.
جاروباریش لە پەنایان، لە پەنای حوجرەی فەقێیان،
لە جێی (دەور) کردنەوەیان، خۆمان حەشاردەدا، لێیان،
بەڵام کە پێیان دەزانی، ڕاویان دەناین، زانایانی،
لە دوور، خۆمان لێدەگرتن؛
تا ئاوازی (ئارێ بابە)ی فەقێیەکان، بزر نەبن؛ لە بیر نەچن.
بەڵام داخم! خاوەن شاری چاوشلکانێ،
بە شوێنی ئێمەی دەزانێ!
دەیدۆزیەوە؛ دەبوو ڕاکەین؛
تا شار (گڕ) دەین،
کەچی لە پڕ پاسەوانێك،
تاوی دەداین بە زۆر زانی!
(گڕی دەداین!)، بە بێ ئاگر، بە ئاسانی!
ناچار دەبووین، کە ملکەچ بین،
ئاخر ڕێسای گەمە وایە!

گەڵتە و گەپیش یاسای خوایە،
ئێستا چۆنە، هەر وا بووە!
٣
ژینی منداڵ بێ یاسایە،
کە منداڵ بووم،
کە چەند ساڵ بووم،
لە زستانان، بە ئێواران،
لە بەر ماڵێك، وەك (پیاوان!)
گەڕەلاوژەمان لێی دەکرد، یێکێك دەبووە براگەورە!
بە بێ گەورە نابییە گەورە!
ئەگەر بێت و گەورەت نەبێ،
ناکرێ بۆ دیوەخان بچی، لە قوژبنێك دابنیشی!
شەوی زستان هێند درێژ بوو؛ نەدەبڕاوە؛
وەك گەورەکان، تاکوو درەنگ، (کەڵەمستانێ)مان دەکرد،
تا گەورەکان دەچوونەوە، لە دیوەخان، ئێمەش پاشان،
بە ڕووخۆشی، بە دڵگەشی،
یێکە، یێکە لەگەڵ لاوێ،
برا، خزم، یان دراوسێ،
بە چاوێکی بە خەوەوە،
دەچووینەوە،
لێی دەنووستین تا بەیانی،
سرووشت وایە!
ئاخر ئەمە یاسای خوایە،
ئێستا چۆنە، هەر وا بووە!

٤

ژینی منداڵ نە یاسایە،
لە منداڵی، لە چەندساڵی،
لە بەهاران، بەیانیان،
ئێمەی منداڵ بە یێکەوە،
هەر کەس بە باوەش پڕییەوە،
دەچووینە دەشت،
(شیوەقولانێ)مان دەکرد!
میوانداری یێکمان دەکرد!
جا پاشان نۆرەی یاری بوو؛
(ساپساپانێ) ، (قاوقاوانێ) ، (خانی چۆلە)، یان (بووکانێ) ،
چەندەها جۆر یارییانێ!
یان وەك لاوان! یارییەکەی (کێلەبەردانێ)!
ڕاماندەبوارد لە ناو گیا، لە سەیرانێ،
تا کاتی ڕۆژ لە سەر زەردی، لە ئێوارێ!
دەهاتینەوە بۆ ماڵێ؛
لە بۆ منداڵان هەر وا بووە و هەریش وایە،
ئاخر ئەمە یاسای خوایە،
ئێستا چۆنە، هەر وا چووە!

٥

ژینی منداڵ بێ یاسایە،
(بابای)م کرد لە منداڵی!!
یاسا هاتە ناو ژیانمان!
هات و کردییە کرچ و کاڵی!

ڕێزی گەنجان؛ ڕێزی شێتان؛
دەهۆڵێکە بە بەتاڵی!
پڕ لە خەیاڵ، خەیاڵیش خۆی هەر کێوییە، نابتە ماڵی.
بەڵام ژینی هەرزەکاری،
بەرانبەر شۆخی نازداری،
لەگەڵ چاوی هێمن و مەنگی، بە بێدەنگی،
ئای کە زۆر خۆشە دڵداری!
هەموو ژیان چرکەیێکە،
چرپەیێکە بە گوێی یاری،
ڕێگا بە خۆی بانگت دەکا،
کڕنۆشت بۆ یار پێ دەبا،
ئارامیت لە دڵ ناهێڵێ،
عیشق هەرگیز جێت ناهێڵێ،
لە شتێ دەگەڕێ؛ نییە!
نەبووە و نییە و نابێتەوە!
دڵ ئارامی هەڵدەگیرێ،
گوڵ و لاولاو تێکەڵ دەبن،
هەنگاو لە دووای هەنگاو دەچن،
شەقام ئیرەیی پێدەبا،
ئەوانیش قەت لە بیر ناچن.
لاو لە سەر ڕێ، تازە یارێ، بۆ خۆی دەگرێ،
دەبێتە بەندی چاوانی، بێ ئارام بۆ لێوەکانی،
شێت و شەیدای مەمەکانی، قسەکانی، چاوی جوانی، نەرمە ڕانی، خان و مانی،
سەد خۆزگە هەر منداڵ بایە!

ئاخر ئەمە یاسای خوایە،
ئێستا چۆنە، هەر وا بووە!
٦
یادی منداڵی سەمایە!
چەند ڕستەیێك بیر دێنەوە،
چەندین ساڵە بەر لە ئەمڕۆ،
کچێکی جوان پێی گوتووە!
(تۆ زاوابە و منیش بووکم!)
بزانە بووکێ وا ئێستا،
زاوا بۆت هاتۆتە سەما!
تۆ لێی دووری، دڵی تەنگە، بێ شادییە!
ژینی وەکوو سێبەر وایە؛ تارماییە!
چاوەڕوانی، هەمیشە بێ کۆتاییە!
وەك بێ ناو ئاو لە هەژانە؛ ژینی، ژانە؛
چاوەڕێیە! تا یادداشتی لە بیر نەکا، باشە، چی بکا؟
تۆ لە بۆی ناسڕێیتەوە،
چیرۆکێکی؛ هەرگیز لە بیر ناچیتەوە؛
خەناوکەیە، بە ملیەوە؛
سەربردەی خۆشەویستییە،
دڵسۆزییە، دڵسۆزیش بە خۆی یاسایە،
ئاخر ئەمە یاسای خوایە،
ئێستا چۆنە، هەر وا بووە!

١٩٦٩/٥/١٤ کۆتایی هات! - هەولێر.

**ماف و سەربەستی**

گیانە لە پێناو ماف و سەربەستی
هەتاکوو ماوی، هیچ نەکەی سستی
ئەو ژینە سازە بێ ترس و ئازاد
ژێردەستی یێکە وەك بت پەرستی.
١٩٦٩/٧/٢٨ - بەغداد.

**ژیانی خۆش**

لە ژینی خۆشی، نەکەی چاوپۆشی
گەر تەرمی لاویت بە گڵ داپۆشی
١٩٦٩/٧/٢٨ - بەغداد.

**له جه‌ژن**

سبه‌ی جه‌ژنه؛ چت پێشكه‌شكه‌م گیانه باشه؟
ئایا ماچێك، له‌م ڕوخساره پڕ له ته‌ڵسه‌مه؟
ده‌نا، گیانه، له باوه‌شیشت كه‌م، كه‌مه؟
یا به ده‌ستم بسڕمه‌وه،
ئه‌و چاوانه‌ی پڕ له خه‌مه؟
وا جه‌ژن دێ، منیش ده‌ستم بێ دیارییه!
گه‌ره‌كمه كه بێمه لات،
بەڵام چ بكه‌م؛ چیم پێ نییه!
نه بازنگێك، له قامكی تۆی بچه‌سپێنم!
نه ملوانكه، تا له ملتی بئاڵێنم،
به‌ڵی گیانه، هیچ دیاریم نه‌هێناوه، چیم پێنییه!
كه دێم، یێك قسه‌ت بۆ دێنم،
ئومێد ده‌كه‌م، قه‌بووڵت بێت ئه‌م ووشه‌یه،
هیچ ووشه‌یێك وه‌ك ئه‌و نییه،
ئه‌ویش ناوی (پێشمه‌رگه‌یه)!
ئاخر دڵێ، من له‌به‌ر تۆ پێشمه‌رگه‌مه!
پاسه‌وانی دایك و باوك و تۆی شیرین و ئه‌م گونده‌مه!
ئاخر بۆیێ پێشمه‌رگه‌مه!
كه دێمه‌وه، ئازادی بۆتان دێنمه‌وه!
ئه‌گه‌ر هات و نه‌شهاتمه‌وه،
له بیر مه‌كه! خۆشه‌ویستیت، به شه‌هیدیم نابڕێته‌وه!
١٩٦٩/٥/٢٨ – هه‌ولێر.

## وەڵام

بە بێ هۆ نییە، چەپڵەی پڕ بە دڵ؛
خۆشویستنی گوڵ!
یان شەیدابوونی چاوێکی بێ کل.
بە بێ هۆ نییە! هەڵبەستی بە سۆز
مەشخەڵی پیرۆز، لە ڕۆژی نەورۆز
بۆ ئەو شاعیرەی، هەڵبەستێك دەڵێ،
چەپڵە هەر دەبێ!
بەڵام چەپڵەکە، نەك بۆ شاعیرە، بۆ شیعرەکە دێ!
چونکە پڕ هەستە، بۆ یێك مەبەستە!
بۆ هەڵسەنگاندن، چەپڵە پێویستە.

١٩٦٩/٥/٢٨ - هەولێر.

## بێکەسەکەم!

محمد صالح دیلان، هاواری بۆ بەر گۆڕی خەیام برد، لە دەست ئەوانەی ڕەزی کوردستانیان سووتاند، منیش هاوارم بردە بەر گۆڕی بێکەس.

خۆم هـــاوارم هێناوە بــۆت، هانـــــام بردۆتـە سـەر گڵکـۆت،
بێکـــەس خـــێرا، زووکە ڕابـە؛ هەســـتەوە دەی، لە گۆڕی خۆت؛
مـانـگ لە بیرکە، خۆت تەیـار کوردستانمـــان وا خـــری سـۆت!

١٩٦٩/٥/٢٩ - هەولێر.

**ناوت**

بێجگە لە ناوت، چ ناوێك هەیە، مەبەســـت بژیێنێ؟
جگە لە دیدەت، چ چاوێك هەیە، هەســـت ببزوێنێ؟
بەهەشـــتت نەبێ، چ باخێك هەیە، خودا دایـنابێ؟
چاوێكی گەشی پــــــڕ هیوای گەورە، لە دوور بنوێنێ؟
بێجگە لە كێوت، چ شـــاخێك هەیە، ڕووباری خوێنی
لە ناو شـــەپۆل دا، هەر دوازدە مانگ، دڵ بســـووتێنێ؟
لـــە تـــۆ بترازێ، چ وەڵات هەیـــە، گەل بە شانازی،
خـــۆی فیـــدا بكات، لـــە ڕێیـــدا بمرێت، خاكی بمێنێ!
چ خـاكێك هەیە لە هەموو دنیـا، هەر بە نـاوەكەی،
گەزەنـــــــگ داتەوە، دوژمن كاس بكات، وا ڕایهەژێنێ!
هیچ ناوێك هەیە، هەر بـــە نازناوت، بناسرێتـــەوە،
هەمیشـــە ناودار، ڕوو بە ڕووی زۆردار خۆی بســـازێنێ
هیچ وڵات هەیە، وەك كوردســـتان بێ، داگیر كرابێ،
هێشـــتا جوان بێ، قەشـــەنگ، بێ هاوتا، دڵ بلەرزێنێ!
ئاخر كوردســـتان، خاكی پێشـــمەرگە و جێی نەبەردانە،
پڕی زانســـت و كرێكاری بـــــاش، خۆی، خۆی دەژیێنێ!
١٩٦٩/٦/١٢ - هەولێر.

## بێکەس

ئاخ بۆ تۆ بێکەس! دۆست و هاودەردت،
وەك خۆت گرفتار ئاهەکەی سەردت،
وێڵ و ڕەنگ زەرد و قیبلەی دڵداریت،
دەرمانی دەردی دڵ و بیماریت،
ئیتر مەحاڵە بگاتە فریا، با هەر عاجز بی، بێکەس و تەنیا،
بێکەس، ئەی گەورە! کۆشك و تەلاری خەیاڵە مانگت؛
کەس حەشار نادا، نایەتە بانگت.
تۆ بەختەوەر بووی بێکەسی زامدار؛
کە مانگت هەبوو، بۆت بێتە هاوار!
لایەنەییێکت بوو کە بۆی هەڵڕێژی؛
تا دەردی دڵی خۆتی بۆ بێژی؛
بەڵام، ئێستێکە، من ئەویشم چوو!
مرۆی چووە سەر؛ وا ئەویش پیس بوو!
ئەپۆلۆ (١١) ڕوونی کردەوە،
مانگیش وەك زەوی؛ بێ دەست و دەوە.
هاوارە بێکەس! وەرە فریادم،
ئامۆژگارم بە؛ نەکەی لە یادم.
پێمبڵێ؛ چی بکەم، لە دەست و داخی ئەو زۆردارانە؟
ئەو جاشە زۆڵە خۆفرۆشانە؟
لە بێزاری خۆم، ترسی خزمانم
بۆنسۆی سووتانی گشت کوردستانم؟
ئەمڕۆ مرۆڤ پێی لە سەر مانگ دانا.

١٩٦٩/٧/٢٢ - هەولێر.

**شۆڕشی هیوا**

کەسێك کە نسکۆی کوردی خۆشییە، پێی دەدۆڕێنێ
با لەشکری خەم خێوەتی حوزنی لە ماڵ چەقێنێ!
ئەوەی هەر شادە بە ناخۆشی کورد، ئاهەنگ دەگێڕێ
با ژینی تاڵ بێ، وێرانە ماڵ بێ، هێزی نەمێنێ
ڕەزیان بێ بەرهەم، کانیان بێ ئاو، زەوییان وشك،
ئایین بێ ڕابەر، لەشکر بێ سەروەر، با بدۆڕێنێ،
گەنجیان شێت بێ، ژنیان بێ مێرد بێ، پیریان ئیفلیج بێ،
هێسکیان ورد و مێشکیان پەل و چاویان نەبینێ.
باوانیان چۆڵ بێ، قەت شایی نەکەن کوڕیان بکوژرێ
لاوانیان بمرن، بەڵاگێڕمان بن، هێزیان نەمێنێ
کچیان ڕەدوو بن، کوڕیان بێ ڕوو بن، کۆزیان خاڵی بن
با دڵیان تەنگ و ڕەنگیان زەرد و خاکیان نەمێنێ
شار بە بیابان، دەخڵیان بێ دان، قەرسیل بێ پاوان،
ڕان بە بێ شوان، گاڕان بێ گاوان، ماست ڕانەژێنێ
ئەو کوردەی جاشە، دوژمنی باشە، سەنگەر تەڕاشە
خوا ڕەزیلی کات، هەر زەلیلی کات، پشتی بشکێنی،
فڕۆکەوانێك، خاکی کوردستان بۆردومان دەکات،
نەگەڕێتەوە بۆ ناو منداڵی؛ خوا بیسووتێنێ
ئەو تانکەش گوند و کێڵگەی کوردستان، تۆپباران دەکا
بتاوێتەوە، ببێت بە پەیین؛ کێڵگە بسازێنێ.

١٩٦٩/٧/٢٧ - بەغداد.

**نەشمیل**

١

لە پشتە من،
لەو دەرگەیەی دوواوە، سەرکەوت ،
لە سەر کورسی ئەمانەکــە شوێنی خۆی گرت.
هەر چەند نەمدیت،
ئاوەڕیشم لێی نەداوە،
بە زیرەکی خۆم بوو، زانیم –
شۆخێکە شۆخ،
مەمك وەك خۆخ!
باڵای بە قەد سپینداریێ،
تەڕ و شلك لە بەهاریێ!
نەشمیل، ناسك، لێو بە خەندە،
سەری کوڵمی بڵێ – قەندە!
تێگەیشتم ئەو کیژۆڵە،
لە دڵ بردن، بێ هاوتایە، هونەرمەندە!
هێشتا هەر ئاوڕم نەداوە؛
بەڵام زانیم،
لە گشت کچانی ئەم شارە!
جیاوازە؛ ئەو نازدارە،
لار و لەنجەی بێ ئەندازە، گوڵبەهارە!
وا تێبگەم ئەو شۆخەیان، زۆر چاوبازە!
هەزار حەسرەت؛
هێشتا هەر ئاوەڕم نەداوە!

بەس بە ئیلهام، هەڵمهێنا؛ ئەم پەرییە،
جوانێکە، وەك خۆی نییە!
بەس نەمزانی، ڕەنگی چییە؛
ڕەش ئەسمەرە، یان سپییە!
چاوی شینە، ڕەشە، کاڵە، مامزییە!
بەڵام زانیم، ئەو مێیینەی،
لە پشتە من، لە سەر کورسی دانیشتییە،
نازدارێکە، بەژن باریك: چنارێکە،
خاوەن جووتە هەنارێکە،
خەندە لێوە، ڕوومەت سێوە، بۆنی کێوە.
بەڵام دانم بە خۆمدا گرت،
باوەڕت بێ؛ هێشتا ئاورم لێی نەداوە!
٢
(پاس) ڕاوەستا،
نەشمیل لە سەر کورسی هەستا؛
هات و بە پێش مندا ڕەت بوو،
هەر چەندە ڕوخساریم نەدی،
بەڵام هەر بە عەقڵ زانیم،
مەحاڵە ئەم نەفەرانە،
کە بەم شێوە حەپەسانە،
ڤینۆسێکیان لە پێش نەبێ!
٣
لە دەرگای پێشی پاسەکە،
وەکوو بڵێی پیاسەکە،

بێوەی سەیری بەر پێی بکا؛
بە جۆرە سەما کردنێك،
یا گەنج لە ڕێ لابردنێك،
نم، نم، لە پەیژە دابەزی؛
من لە جێی خۆم، دڵم لێیدا، مێشکم تەزی!
جا هیچ بیرم نەکردەوە؛
هاتمە خوار و بە دوایەوە!
سەیرێکیم کرد –
(مینی جۆپ)ی تەسکی لە بەر،
قژێکی زەردیشی لە سەر!
قاچێکی ڕووت، سمتێکی خڕ!
بەلەکێکی تا بڵێی پڕ!
لەنجەی هەزار تیز و فیز بوو،
سەد سوێندی بۆ بخۆ، ئینگلیز بوو!
٤
پێم هەڵێنا، تا پێی بگەم،
کاشکا پرسیاری لێ بکەم؛ جا تێیبگەم،
هەرکە هاتمە شانبەشانی،
ئاوڕم لێی داوە، زووم زانی،
ئەو خەڵکە بۆچ حەپەسا بوون،
واقیان وڕما بوو، شێوا بوون؛
هەرکە دیتم، تێگەیشتم،
لە واق وڕمان،
بە شاگردی منیش نەبوون!

٥

عەقڵم، هۆشم،

فیکرم، سۆزم،

باوکم، باپیرم و هۆزم،

هەمووم لە یێك چرکە بینین!

خۆ ئەم هەموو پۆزلێدانە،

وێنەی نەبوو، لەم زەمانە،

بۆ ئەو پەرییە بێ ویژدانە!

ئەوەی من دیتم کفر بوو؛

پیرێك بوو؛

تەمەن ... شەست و دووووو!

١٩٦٩/٧/٢٩ – ٥٢ - بەغداد.

**پەیکەری شکاو**

ئاشنای یێکتر بووین، هەر لە منداڵی
جا خۆشمویستی، پاشی چەند ساڵی
دڵی خۆم پێدای؛ شێتی چاوت بووم
شەیدای نیگات و وێڵی ناوت بووم
من، خۆم تۆم فێرکرد، مانای دڵداری
هەر تۆ بووی بۆ من جێی هیواداری
پێمخۆش بوو بۆ خۆم تۆ بکەم بە بووك
بترازێنمەوە، کچی ئێسک سووك
بەڵام داخەکەم، لە دەست قسمەتمان
نەیهێنا بۆمان هەوڵ و هیممەتمان
کێوی ئاواتمان سەر تا سەر ڕووخا
نە خۆشیمان دیت، نە بەزم و سەفا
ئەوا ئێستێکەش، جێم دێڵی، دەڕۆی
لە یادم بکەی؛ ئێسقانم دەخۆی!

١٩٦٩/٨/١٧ - هەولێر.

**ڕێگەی ئازار**

ئەی ڕێگەی ئازار،
وا لە بۆت دەرچووم؛ هاتمە ئاقاری؛
پێتدا ڕەت دەبم، بە بێ هەواری
من خۆم گیرۆدەی داوی هەژاریم،
تۆش سەڵتەنەتی زوڵم و زۆرداری
من خاوەن سۆز و ئەندێشەی پاکم،
تۆش دژی هیوا و باخی بەهاری
من بۆ خۆم کوردم؛ شەیدای ئازادیم،
تۆش کرێگرتەی دەستی ناچاری
لە پاشەڕۆژی نزیک، لە سەر ڕێ،
تووشی یێك دەبین، دێیە بەر داری
دژی تاریکی و ژێردەستی ئێوەین،
ئێوەش شەڕەنگێز، ناکەن گوڵداری
١٩٦٩/٨/٢٦ - هەولێر.

**نیگایەکەت**

هۆ کـارمـامزەکەی نێو مێرگی کوێســـتـان،
ئەی پاسارییەکەی سواندەی مزگەوتان،
دەنگت قاسپەی کەو، ڕەنگت کازیوە،
تابلۆی پێکاسۆی، سۆزی هونەرمەندان!
نیگات شیرینـــــــــــە، دڵ دەڕفێنێـــــت،
کوڵمەکـەت بەفـرە، سپیە، زۆر جوان،
سرووشتت مەندە؛ لەبـــاری، شۆخی،
نەرمە شەرمەکەت دەمکا سەرگـەردان!
گوڵە گەنمەکـــــەی بەهارێکی تـــــــــەڕ،
دەهەژێتەوە لـــــە بـــەرە بەیـــان!
خوڕەی بەستی تیژ، لــــە پاشی باران،
دێنێتــــەوە بــیر، خرمــــەی بازنەکان،
جوانی، بێگـــــەردی، شیرینی، هەندی،
پـــەری، خنجیلـــەی، کیژی کوردستان.
١٩٦٩/٩/٢٥ - هەولێر.

**ڕێگەی ئەشکەنجە**

ڕێگاییێکم هاتۆتە بەر، ناچارم، وا پێیدا دەڕۆم.
ئەم ڕێگایە، وەك ژیان و مردن وایە؛ قووتم دەدا ئەگەر نەیخۆم.
ڕێگاییێکم گرتۆتە بەر، دەزانم پڕ ئەشکەنجەیە،
بڕینی دەست و پەنجەیە،
ڕووخانی کۆشك و تەلار و هێلانەی پەڕەسێلکەیە؛
ئەمە دنیای ئەم ڕێگەیە.
بەڵام مەرجە پێیدا دەڕۆم؛
هەژار بم، هەر پێیدا دەڕۆم؛ سەردار بم، هەر پێیدا دەڕۆم؛
ئەو دەڕوا، ئەگەر من نەڕۆم! پەیمانە؛ هەر پێیدا دەڕۆم.
ئەو ڕێگەیە، پڕ برینە، دڵڕەقە؛ ناحەزی ژینە،
پڕ ماتەمە، بێ خەندەیە؛ بێ ڕایەخە، بێ زەمینە!
دژ بە دژی بێزارییە، دۆستی فیکر و چالاکییە،
لایەنگری بەرانبەرە، دژی گێلی و بێ باکییە.
ئەم ڕێگەیە بۆ من نییە، بەڵام هەر دەبێ بیبڕم،
لێم داخراوە، بەڵام دەچم! دڵنیامە، لەم ڕێگەیە بە تەنیا نیم،
شێتی ڕووناکی، وەکوو من، فرە زۆرن؛
وا لە سەر ڕێن؛ هەموو هەر دێن!
لە پێش ئێمەیش، گەلێك شەیدا، بەم ڕێگایە زۆر سەختەدا،
چوون و ئیتر نەهاتنەوە!
بەڵام گەلۆ! ئەوەی کورد بێ، خودان ئاواتێك بێ، گورد بێ،
ناچار بەم ڕێییەدا بچێ؛
دوا قۆناغی ئەم ڕێیە، چۆن بۆی نەچم؟ کوردستانمان، وا لەوێیە.

١٩٦٩/٨/٢٤ - هەولێر.

## لاپەڕەیێکی ڕاست

### دڵ

دڵی مرۆڤ دەریا و شاخە،
دەمێك سازە، دەمێك باخە،
دەمێك ڕەشەبا و چەخماخە!
کاتێك بەرزە هێندەی چیا،
جار و باریش هێندە نزمە؛
دەچێتە ئاستی بنی دەریا.
دەم دەمە ئارام و ژیرە،
یا زریانە، شێتە، شەیدا.
قەت ناکرێ بە دڵ متمانە؛
چونکە دڵ بووەتە شێتخانە.

### هەست

بەلەمێکی بێ خودانە،
قەراخی ئەم چاوە جوانە،
دەیخاتە ئاوێك بێ بەندەر؛
وەك نەدارێکە، دەربەدەر،
بە دوای ئومێدێك دەگەڕێ،
ئەو ئومێدەش، خۆزگەیێکی سەرمەستانە!

### هۆش

بەندەرێکی بێ کەشتییە، فڕگەیێکی بێ فڕۆکە؛
نە کەشتیوان شارەزای ئەو بەندەرەیە،
نە فڕگەکەش نەخشەی هەیە!

**هەڵبەست**

شیعری بە پێز، دنیای تەڕی پاش بارانە،
سفت و سوێی دڵ، دادەمرێنێ،
هەست بەنگ دەکا،
هۆش دەخاتە نێو بێشکەیێك، نایهەژێنێ.

**هەستیار**

شاعیر شێتە! تا هەڵبەستێك هەڵدەڕێژێ،
خۆی دەسووتێ!
کە هۆنراوێکی چێژبەخشی، بەخشییەوە،
لە گۆشەیێك، هەڵدەتووتێ،
بیر لە وشە دەکاتەوە، تا کاتێ دێ،
وەخت دەبێ،
لە کێش و قافییە تێبگات،
هەرکە دیسان، وەکوو جاران،
لە تازەوە، جنۆکەی هۆزان دێتەوە، بازنەکە سووڕ دەداتەوە؛
شیعرێکی تازەی پڕ لە چێژ، بۆت دەبێژێ! دەیڵێتەوە!
١٩٦٩/٨/٢٦ - هەولێر

## زام و دڵ

زامەکانم، هەندرێنن،
بەفری ئازاریان پۆشیوە
بووکی فرمێسکی چاوانم،
ژانی ژێردەستی نۆشیوە
وەکوو هەولێرە جوانەکەم،
تەونی نەمری چنیوە
قەڵای بەرز و دەشتی خۆشی،
نە دەگۆڕێ، نەی گۆڕیوە
ئەم دەڤەرە چاك و جوانە،
هەستی منە؛ هەموو عێراقی تەنیوە!
زامەکانم ئەو باڵندە گۆشت خۆرانەن؛
شاهۆیێکی دەنووك پاچی ئاو دراون،
نە فڕیون، نە دەفڕن،
هەر دەژین هەر ژیاون،
تا کوردستان ژێردەست مابێ،
ئەو زامانە تیمار نابن؛
هەر لە سەر دڵم چەقاون!

١٩٦٩/٧/٢٨ - بەغداد.

## ژن

ئافرەت، خۆی شنەی شەماڵە؛
ناسك، فێنك، ژین و ژاڵە.
ئەگەر دیتت،
چەند ئافرەتێك بە یێکەوەن،
ڕەنگا و ڕەنگن؛
بوونەتە چەپکێك گوڵاڵە،
بپارێوە، تاکوو هەر وا گەش بمێنن،
ئەم دەستە شۆخە چاوکاڵە.
تیری کوشتەر لە ژن مەگرن؛
ژن بەهرەیە، ژن گەورەیە،
دایکە، خوشکە، کچە، ژنە،
کانگای عەقڵ و پەروەردەیە،
ببە هاوڕێی، ببە دۆستی،
ببە ئومێد و مەبەستی،
خۆشت بوێ بە سەربەستی،
چونکە ڕاستی؛
(ژن) جوانییە!
گەوراتییە، ناسکییە، پڕ ڕێزییە؛
خۆشویستنە؛
پەروەردەیە؛ ژن کەماڵە.

١٩٦٩/٨/٢٩ – هەولێر

**بۆ کوردستان**

لە پێناوی کوردستانە،
وا لە ڕێینە، ڕێگەکەش ڕووە و ژیانە،
بەرەو بەرزی، هەر ئازادی ئاواتمانە.
لە پێناوی کوردستانە، لاوی کورد وا لە شاخانە،
بۆ (ژیان) لە (مردن)دا نە! هەر لە ڕاهی کوردستانە!
وا خەباتە، جەنگە لە دەوری شارانە؛
هەتا لە حوکمی چاودایە،
هەمووی مەیدانی شێرانە!
لە بازنگی قامکی یارم، لە ئەنگوستیلەی پەنجەکەی،
لە خرخاڵی سەر گۆزینگە زۆر ناسکەکەی،
ئاگری خەبات داگیرساوە،
ئالای دوژمن دەسووتێنێ؛
دێنتە خوارێ، گوللـــە وەك باران دەبارێ!
خۆ هەمووی بۆ کوردستانە؛
گەنج و جوامێر، لە مەیدانە!
لە بەختی ئەم کوردستانە،
ماڵی کوردان، لە سەر شانە! زیندوو لە ناو گۆڕستانە!
تەرمی شەهید، لە سەر سەرە، لە سەر شانە،
لە ڕاهی ئەم کوردستانە!
منداڵی کورد، لە لەرزینە، ژینی تاڵە، ڕۆژی تارە،
بەڵام ئێستاش، نەبەزینە!
نابەزین و نەبەزینە!

١٩٦٩/٨/٣٠ - هەولێر.

**دەودەوانێ**

پرسیاریان کرد: - مەسیح بۆچی لە خاچ درا؟
گوتم: ڕاست بوو! درۆ بە خوێنی حەقیقەت، ڕەباس کرا!
گوتیان:- باشە! ئەی هەستیاران، بۆچ لە چوارمێخە نادرێن؟
گوتم:- هاوڕێ! ڕەنگە لە ڕاستی لا بدەن، یا بترسێن!
گوتی: - گەلۆ! نەبەزێکیان تێدا نییە، بە سەر ڕاستی باز هەڵنەدا؟
ڕووبەڕووی زۆردار بێتەوە و دەست بەر نەدا؟
هەستیار ئەگەر ڕاستی بڵێ، پەیامبەرە!
وشەکانی مروارینە، شیعرەکانی وەك سێبەرە!
گەر شاعیرێ، لە چەقی شار هەڵبواسرێ،
لە سێدارەی دوژمن بدرێ،
(هەلاج) دێت و بەرانبەری کڕنۆش دەبا،
ئەو کات هەڵبەست، دەبتە ڕێباز،
کۆمەڵیش خۆی پارسەنگ دەکا،
بۆچی ساوای کورد لە بێشکە،
تانك و تۆپی عارەب دێت و دەیسووتێنێ وەك برێشکە،
بۆچی پیرە مێردی کوردان،
کچی کوردان، کوڕی کوردان، ژنی کوردان، ورد و درشتی کوردستان،
بێ بیانوو، لە ناو دەبرێن، ئیعدام دەکرێن،
بێ سەر و شوێن، دەچن، نایێن،
بەڵام هەستیار، گەورە دەکرێن؟؟
هانیان بدەن، پێشمەرگە بن؛ ڕاستی بڵێن
یا لە پاش شیعرێکی ئازاد، لە داربدرێن!

١٩٦٩/٩/٢٥ – هەولێر

## قەڵـــەم

خامەم ڕزی! خەیاڵم بەنگ بووە، تەزی!
هێندە بۆ یار شیعرم نووسی، هەزاری بە یەك فلووسی!
هەمووی، بە یێکجار داڕزی!
یا خوا نەژی
ئەو قەڵەمەی شیعرێکی ئاوا دەنووسێ،
کڕنۆش دەباتە بەر قژ و مەمك دەمژی!
دەك داڕزێ ئەو خامەیە،
کە توانایٚ شۆڕشی هەیە؛
بەڵام دەچێتە بەر سایەی،
باڵای بەرز و چاوی سەوز و قژی زەرد و زەمانکوژی!
خۆم خۆش کردووە؛ بە تەمامە،
ڕۆژێك بڵێم: بژی خامە،
بەڵام کەیە؟
بێگومان هەر ئەو دەمەیە،
لە یەك دەئاڵێن خامە و خاك،
دەبنە ڕێبازی بیری پاك،
سروود بۆ کورد دەهۆننەوە،
مردووی سەر خاك دەژیێننەوە،
ئەو کات بە دڵ؛ شیعری کوردی دەخوێنمەوە؛
کە ئازاد بووین،
هاوار دەکەین (خامە بژی!) و دەیڵێیینەوە.

١٩٦٩/٩/٢٦ - هەلێر.

**برانین - براتان نیم**

ڕەزا قوڕسن، کاتێك دەڵێن:- (ئەی برای کورد)!
ئێمە وا لە دەستی ئەوان، پەرێشانین، درشت و ورد!
برای وەك ئێوە، بۆ چییە؟ نە برام بن، نە مکوژن!
هەرکە دەشێین، هیچ بە خێر نێن!
وەك خزمەتکار سەیرم دەکەن، کاتێك کە دێن!
ئەوەی من پێی ماندوو بوومە، حەڵاڵی دەکەن و دەیبەن،
خاکم هەموو، داگیر دەکەن!
گەنج و لاوم دەستە - دەستە، لە دار دەدەن!
دێن بە خێر نێن؛ منداڵمان زراو دەڕژێنن،
ئافرەتمان زگ لێ دەچووێنن،
برام دەکوژن، خوێنم دەڕژن،
سەدان مزگەوتم دەڕووخێنن!
ئێوە چ جۆر براییێکن؟ لە کەیەوە ئێوە برامن؟؟؟
(برای کورد)مان ناو لێمەنێن، قەت وا مەڵێن،
نە تۆ برای، نە برای تۆم! بە چاوی دوژمن دەمبێنی،
قەحپەبێیکیش ئەگەر زەوقت لەگەڵ نەکا،
لە تۆڵەی ئەو، خوێنی کوردە، دەیڕژێنی!
ئێوە هەرگیز برای کورد نین؛ هەر وەها کوردکوژ دەمێنن،
خوێنی کوردانتان هەڵمژیوە و هەر دەمژن،
لەو کاتەوەی لە بن پەردەی ئیسلام هاتن،
هەتا ئێستاش ئیسلامەتی لە ناو دڵتان شوێنی نییە!
برایەتیش ناوی ڕاستەقینەی نییە،
زنجیری تانکی سۆڤییەتی،

له سەر خاکی کوردستانمان، شایەدییە!
نامانەوێ دەبابەتان سەرمانکەوێ،
نامانەوێ، گوللـــەی غەدری دەستی ئێوە پێمانکەوێ؛
لە ماڵ، لە ژوور، لە ئەشکەوتان،
لە بن دار و لە قەراخی زێ و ڕووباران،
لە بەر سێبەری مزگەوتان،
نامانەوی وەك بەرخ و کار، سەرمان بڕن!
پێمان بڵێن، چۆن برا بن؟
ئێوە دەڵێن: (موسوڵمانین)؛
ئێمەش دەڵێین:- (موسوڵمانین)!
بەڵام ئێمە، بە پێی فەرهەنگی عەقڵتان:-
دەمێك (عوسات) لەقەبمانە،
یا (موخەڕڕیب) یا (چڵکاو خۆری بێگانە)!
هەندێ جاریش (کۆمۆنیستین)؛
بە قسەی ئێوە - (مارکس)، (لێنین) دەپەرستین،
جاروباریش پێمان دەڵین:-
ئێوە دووەم ئیسرائیلن؛ بۆ عارەبان عیسرائیلن!
نۆکەری ئینگلیس خۆتانن، کرێگرتەی ئەمێرکانن،
دوا قەوان، پێتان گوتین:- موتەمەڕیدین!
هۆ، برایانی، نا-برا، وەرن با ببین ئاشکرا،
ئێوە عارەب؛ ئێمە کوردین،
دوو نەتەوە، دوو ڕەگەزین، لە یێك دوورین،
ئەتۆی عارەب؛ داگیرکەری خاکی ئێمەی، لەناوبەری ماکی ئێمەی،
بکوژی هزری زۆر چالاکی ئێمەی،

ساختەکەری ناوی گەورەی دایکی ئێمەی.
تا بەم شێوە بیرکەنەوە، بەم جۆرە شت لێکدەنەوە،
ئێوە، هەرگیز، نابنە برا؛ مێژوو غەڵەت دەخوێننەوە،
هەروەها دوور، دەمێننەوە.
ئەمڕۆ ڕۆژی نامەردانە، ڕۆژی سەرشۆڕی زەمانە،
ململانێی دوو بەرانە،
(سنۆبۆڵ) و (ئەنکڵ سام)ن؛ لەو مەیدانە،
لەو نێوانە - ئێمە بووینە سەرگەردانە.
ئەی نابرای کۆلۆنیاڵی،
زەمان هەر وا ڕاناماڵی؛
کورد پێشمەرگە و شاخی هەیە،
سەنگەر و بەیداخی هەیە،
شاعیری زۆر یاخی هەیە،
کوردە، خۆ دەماخی هەیە،
دەستووری دنیا دەگۆڕێ،
چەرخی گەلانی ژێر دەست دێ،
ئەو کات ئێمە، کەس ناکوژین،
چۆلەکەیەك سەر نابڕین،
خاکی ئێوە داگیر ناکەین،
گوندی ئێوە خاپوور ناکەین،
ماڵتان قەت بە تاڵان نابەین،
ئێمە عەقڵی مشتومڕین،
مافمان ژیرانە وەردەگرین.

١٩٦٩/٩/٢٨ - هەولێر.

## دەنگ و باس



ئەم هۆنراوە، ڕەقابە لە بەغدا بەم شێوەیە (حذف - قوتیکرد) و ڕێی نەدا چاپ بکرێ و بڵاو بێتەوە!

شەو لە دەنگی کوردستانی
عیراقەوە،
(بارزان)[1] هەواڵی خوێندەوە!
(جەیش و جاش هێرشیان هێنا،
گەلێك گوندی کوردیان،
سووتان؛
ئافرەتیان کوشت،
منداڵ لە ناو ئاگر نێژران؛
پیرەمێردەکان، هەڵواسران؛
بەڵام پێشمەرگەی تۆڵەسێن،
نەیهێشت بەم (نەصرە) خەڵەتێن!
وەك شێر بۆیان هاتنە مەیدان؛
لێیان کوشتن بیست و یێك کەس،
چوار ڕەشاشەشمان کەوتنە دەس؛
سێ جاشیش لێیان ئەسیر بوون،
ووسوو و حەمەد و باپیر بوون؛
بە سەر بەرزیش پێشمەرگەکان،
گەڕانەوە بۆ بنکەکان!)
ئیتر بڕۆن بۆ پێشەوە ئەی پێشمەرگەی کوردستانی؛
بە سەرۆکایەتی بارزانی!

٣٠/١٠/١٩٦٩ - هەولێر.

---

[1] مەبەست کاك بارزان مەلا خالیدە!، ئەوکات لە ڕادیۆی (دەنگی کوردستانی عیراق) موزیع بوو؛ هەواڵی دەخوێندەوە و خەڵکی کوردستانی گردەدا.

**بۆ کورد**

گەلت پڕ هۆزە، کوردی مەرد؛
خاکت پیرۆزە، کوردی مەرد؛ کێوت پڕ سۆزە، کوردی مەرد؛
ئەم لا بڕۆ هەمووی زێڕە؛ ئەو لا وەرە هەمووی زیوە؛
زنجیر، زنجیر تێکچەقیوە؛ دوژمن چاوی تێبڕیوە!
شاخەکانی کوردستانت، چەسپاون لە دیر زەمانت!
وەك ئەوەنە شاخی کوردان،
هەڵیان گرتبێ عەرشی یەزدان!
ئەم هەردانە، هەر لە حەمرین، تا ئەدەنە،
هەمووی جەنناتی عەدەنە،
کوردکوژ لەتلەتی کردووە،
کوردستان یێکە نەك دووە،
کات کاتی یێکگرتنەوەیە؛
کورد هەمووی هەر یێك نەوەیە؛
لوڕ و فەیلی، سۆران، بادین، سەرتاسەر لە یێك ڕێچکەیە.
هەستە فێربە، لە وێرانی گوندەکانت،
لە تاڵانی پەز و گاڕان، لە کوشتنی شوانەکانت؛
لە سۆتنی دەخڵ و دانت،
پەند وەرگرە، هەستە! وەرە؛
ئەمڕۆ ڕۆژی تێکۆشانە، هی خەبات و کۆڵنەدانە،
ژیان موڵکی ئەو گەلەیە،
چۆك دانادا؛ تا ڕزگاربوون، لە مەیدانە.

١٩٦٩/١١/١ هەولێر

تازە لە خانەی مامۆستایان دەرچوومە.

## ئاشتی

لە سەر لووتکەی کێوەکانمان، چاو دەگێڕم،
تا بزانم لە هیچ شوێنێك دەرناکەوێ!
لە ناو پاشماوەی تەمەنمان، سەرناکەوێ!
هاوڕێ دووریت، لەگەڵ هیچ بەراورد ناکرێ؛
وەکوو چەشنە مردنێکە؛ لە بیر نابرێ!
حەزیاییێکە، هۆش لە دەستی قورتار نابێ!
لە دووری تۆ، ژیانی من تەم و مژە؛ وشە کوژە،
شیعر لە سەر نووکی قەڵەم،
ڕادەوەستێ؛ بۆم نانووسرێ!
وەکوو ڕمی دەستی جەنگاوەرێکی ڕۆمانە،
هەر نامکوژێ؛
سەرم دەبڕێ!
کە تۆ ونی؛
ئەم وڵاتە چیا و چۆڵە،
چاوم لێرە کەس نابینێ!
لە دووری تۆ،
کاتم نییە؛ شوێنم نییە!
وەك درەختێك لەم چۆلەدا، ڕەگم نییە!
دەی! دیارکەوە؛ تا گۆرانیت بۆ بنووسم؛
دەی! دیارکەوە؛ شارستانی ئازاد دەبێت،
لە ناو قوقومی سەندباد، ئیتر حوزن لە یاد دەچێت!
١٩٦٩/١١/١ هەولێر

**هاتووین**

هەموو پێکڕا هاتووین خاکمان خاوێن دەکەینەوە؛
گسك لە شەقامان دەدەین، پیسی لە شاران لادەدەین.
مێژووی نوێ ڕەشنووس دەکەین، سەگ لە جاشۆڵان بەردەدەین،
ناوەکانی سەردەرەی هەموو کۆگاکان،
ناوی پرد و خیابان و کۆڵانەکان،
دەکەینە ناو؛ ناوی داگیرکەر لادەبەین.
بۆیێ هاتین، هەتا مێژووی سەرکوتکەران، بدڕێنین،
گەلۆ، هاتووین، ڕاستیتان بۆ بدرکێنین، کوردی مردوو، ڕادەژێنین،
سەد جار کاشکا، بژێتەوە؛ مێشکی منداڵ، پاك بێتەوە،
بیری ڕەگەزپەرستانی (حبوا العرب) ڕامماڵین،
هزری پاکی کوردایەتی، بسەپێنین.
هاتین لەبەر ناچارییە، چەك هەڵگرین،
لە ناو خاکی پاکی کوردان، دوژمنەکانمان دەربڕین؛
ئینجا پاشان، (بێکەس) دەگەینینە سەر مانگ،
ئەستێرە بەرزەکانیش، دێنینەوە،
لە بەر دەستی (پیرەمێرد)ی مەزن، ڕیزبەند دەکەین
لەبەر خاتری زاتی (ئەحمەد بەگی جاف)یش،
هێلی ئاسن دەبەینە شاخ، لە بۆ هەورەمانی دێنین.
ژین ساز دەکەین، گوڵ دەچێنین،
هەر دێین و دێین، تا پێی دەگەین ڕاناوەستین؛
ڕێکی دەخەین، جوانی دەکەین، ژین ساز دەدەین،
دەڕۆین و قەت ڕاناوەستین، تا پێی دەگەین.
١٩٦٩/١١/٣ – هەولێر.

**لە هەولێرێ**

لە سەر قەڵای بەرزی هەولێر، ڕاوەستاوم. دۆش داماوم!
زەمان وەك من، دۆش داماوە!
تا لە توانای دیتنی چاوە، لە هەر لاوە، بەهەشتە و لێی ڕاکشاوە؛
زەمان خۆشە، خەڵکی هەموو لە خرۆشە، دڵ لە جۆشە،
ئەوە سەیرە! چۆن لە خاکی کوشتار و خوێن، کەیف ماوە؟
لە هەر لاوە،
لە ئاسۆی هەموو کوردستان، مقۆمقۆی چ قەوماوە؟
لە سەر قەڵای خۆڕاگرم، بۆیێ دڵ پڕ لە ئاگرم،
ئاخر ئەم قەڵای هەولێرە، بەر لە دوژمن هەبووە لێرە،
دڵنیاشم پاشی ئەویش، لە لانە دەرناچێ؛ شێرە.
سەنگەرێکە، ئەفسانەی زۆر زۆری لایە،
ڕەنگە پێنج شەش هەزار ساڵبێ، مەنزڵگەی کوردی دلێرە،
ئەم قەڵاتە، پەندە، ڕەندە،
پشتە، پەنایە، مەڵبەندە،
بۆ کورد دەنگە، بۆ کورد ڕەنگە، بۆ کورد سەنگە،
مەرگی نەیارانی دیوە، ڕووبەڕووی مردن وەستاوە،
عیملاقێکە، لە قومقومی دەستی دوژمن، كە دەردەچێ،
ئەو کات زەمان دەجوولێنێ،
هەر سەر بەرزە، هەر ژیاوە.
ئاخر ئەمە، ئەو ئومێد و هیوایەیە،
کەیفبەخشی گەنج و لاوە،
کورد بۆ ئەو ڕۆژە ژیاوە، بۆیێ ماوە!

١٩٦٩/١١/٤ – هەولێر.

**دەنگدانەوە**

کز، کز، بە بێ دەنگ..
کەڵلـــە پڕ و مات، وەك کەسی بن بەنگ،
بێ ڕادیۆ و نووسین،
بێ تەلەڤزیۆن،
ئامێری بێتەل؛ بەبێ تەلیفۆن،
هێدی و لە سەر خۆ،
بەرەو پێش دەڕۆن!
کز، کز، بە بێ دەنگ،
تۆپی سەر دەرگای زیندانەکانیان،
هەموو دەشکێنین،
کۆت و زنجیری دەستی ئەسیران،
گشت، دەپسێنین،
هەر وا بە بێ دەنگ،
نووکی خامەکان،
تیژ دەکەینەوە،
شووشەی مەرەکەب
پڕ دەکەینەوە!
دوور لە شەوەزەنگ،
ئەو ڕۆژە هەر دێت،
کە دەنگ دەینەوە،
ئەو ڕۆژە، بێ شك،
هەر دەبەینەوە.

١٩٦٩/١١/٥ - هەولێر.

## چاوەڕوانی

چاوەڕوانن، وا مەزانن، دوورن لێیان،
ئێوەیان هێشتا نەدیوە؛ سەرتان نەداوە لە جێیان،
لەو دوورەوە، دەتانناسن؛
ئێوە بۆ وان، سەری هەموو دەنگ و باسن!
لەوێڕا چاوەڕێتانن، لێقەوماوان، کوڕ بزر و باو کوژراوان،
کۆست کەوتوان، ماڵ سووتاوان،
خودی ژیان، هەموو ئینسان هەموو، هەموو، چاو لە ڕێنە!
پسکەپسك و چ بوو، چ بوو، لە هەر لایە؛
خەڵکی هیوای لا پەیدایە، شتێکی چاك لە ئارایە!
نەك هەر خەیاڵە و هەر وێنە!
هەیە دەڵێ: مەحاڵ نەما، خەڵکانی تر هەنە دەڵێن: زۆردار نەما،
هەموو وێکڕا، ورد و درشت، چاوەڕێنە!
بۆ زستانێ، لە خۆر جانگیان چنیوە،
بۆ هاوینێش، ئاوی بەفر هەر تەزیوە،
لەگەڵ ئەوەش، هەر دەلەرزن؛
لە خەون دێتن دەترسن، دژی نووستن، ڕادەوەستن!
ئاواتیان گڕی گرتووە؛ خۆزگەیان وا نزیك بووە.
(ئەژی) هاوڕێم لە وانەی داڕشتن نووسی -
(ژینی ئێستا دەبتە یادداشت،
خەبات نییە بە بێ پاداشت.
ڕۆژێك دێ دەینووسینەوە،
سەدان پەڕ، پڕ دەکەینەوە.
ئەوەی لەم سەدەی بیستەمە،

دکتاتۆرە و خوای ستەمە،
ڕۆژێکی دێ، لە ناو دەچێ.
ئەو ڕۆژی، ژین چرۆ دەکا،
چاوەڕوانی دەبڕێتەوە؛ کێوییەکان کەمۆ دەکا.)
(ڕێبوار) نووسی –
- ئەمڕۆ برسین؛ لاواز، لەڕین؛ بێدار، ڕووتین؛ زۆر دەست کورتین!
کارمان بە دەست چەند کەسێکە؛
یان حاجییە، یان مفەوەز، یان جاشێکە!
دەروێش، سۆفی، عەریفێکە، (شلۆن، شلۆن،) دەم ڕووتێکە،
کوردستانیان سەرا و بن کرد، ژینی ئینسانیان لە ناو برد،
شەکر و تۆچا، ڕۆن و برنج، کووتاڵ هەموو،
بە چاوپانیشیەوە، لە بازاڕ نادۆزرێتەوە!
پاتری و ڕادیۆی ترانسیستەر، سەر تا پا لێمان حەرامە،
هەر بۆ عارەب بەردەوامە.
ئەویش سوێندی بە قورئانە،
بەو کەسەی خودان زەمانە،
حاجی کەشیدەکەی دەگرێ،
سوێندی پێ دەخوا بێ گرێ،
سەری شێخیش هەر لە سەر زاری دەروێشە،
لە لای بۆتە بنێشتە خۆشە!
سۆفیش بە (حەیحەی) دێتە پێش، زۆر خراپترە لە دەروێش،
عەریف عەسکەری بیانی، هەزار خۆزگە بە شەیتانی،
نە هیچ شەرمێ لە خۆی دەکا؛ نە مننەتی کەس دەزانی،
هەر کامێك دێت، لە سەر کوردان،

هەر بە تەنیا، نابتە ئاغا، دەبتە فرعۆن،
دەبێتە بت، شلۆن، شلۆن!
خودێ هاوار! ئەم هەموو دەعبا تێرانە،
کوردستانیان کرد وێرانە،
وەك تانکی کارخانەی ڕووسین،
دەخۆن و دەبەن، بە بێ پرسین.
هۆ! هەڤاڵۆ! لە کن بەعسی، لە کن جاشان،
ئەوانەی کوردن یاخینە، مەجووسین، پشتیان لە دینە،
قوتابینە، مەکتەبلینە، سەر و بن لای ئەوان شینە؛
لە کۆنەوە کوردی برا، گوتوویەتی و دەیڵێتەوە –
(سەیری ئەوێ سەیرانێ؛ مریشکی ڕەش، هێلکەی سپی!)
چۆن دەبی؟ یان چلۆن نابی!!
ئەمە لەگەڵ هیچدا ناچێ، ڕەش ڕەشە، قەت سپی نابێ!
هەڤاڵانم، هیوای گەورەی نیشتمانم،
لە شار حاڵ وا بەمجۆرەیە،
دنیا پڕ سۆرە و تۆرەیە،
هەر کەس دەمی کراوەیە،
خواردنەوەی خوێنی ئێمەیە؛
هەڤاڵانم، ئێوە بژین،
ئێوەن ئومێد، ئێوەن هیوا، ئێوەنە، ژین،
ئێوە مردوو دەژیێننەوە،
چاوەڕێین، تاکوو دێنەوە،
ئازادیمان بۆ دێننەوە.

١٩٦٩/١١/٦ – هەولێر.

## ئازادی و ڕابەر

برای کوردم، لە هەر کوێ هەی، لە ئەشکەوتی،
لە کنیسەی، لە مزگەوتی،
لە سەر دەریای چاڵی نەوتی،
لە سەر شاخی، لە نێو باخی،
لە سەر ڕێگای، لە نێو جێگای
گرینگ نییە، ئەی ڕۆڵەی مەرد،
لە هەر کوێ بی، هەستە، ڕابە،
ئەمڕۆ نە کاتی میحرابە؛
کەوتییە بەر لوولەی دەببابە!
دەست داگرە، ژیان دەستەمۆی ئاگرە،
زەوی خاکی تێکۆشەرە، ئەوەی ئازاد بێ، ڕێبەرە.

١٩٦٩/١١/٥ - هەولێر.

## سەر و چاو

ئەوانەی سەریان بێ تووکە، هەموو ڕۆنیان نەڕژاندووە
ئەوەش کە چاوی بنووقی، یان مردووە یا نووستووە!

١٩٦٧/١١/١٩ - هەولێر.

**چاوەڕوانین**

له سلێمانین، له هەولێرێن؛ له هەر کوێ هەن!
کوردن؛ چاوەڕوانی ئێوەن!
لێقەوماون، کوڕکوژراون، ماڵ سووتاون!
هەموو ئاگر پڕ هەناون، خەڵك هەموو چاوەڕوانن!
له مەرەقن تا بزانن، پێشمەرگە دێن، ئاوات دێنن!
خۆڕاگری له بەر ئازار، ئەمڕۆ، ئەوپەڕی خەباتە!
له ناو شاران، ئازار دەدرێین! بندەست دەکرێین!
بەڵی ئەی لاوی پێشمەرگە، کڵۆی ئاوات تەنیا ئێوەن،
بەو ئومێدەش، ئێمە له ناو زەبری ئەشکەنجەدان،
له هەر کات باشتر دەچەسپێین!
پوختە دەبن، ئامانجەکان،
ڕۆژ له پاش ڕۆژ، گەورەتر دەبن خۆزگەکان،
مەزنتر دەبنخەونەکان!
ئێمە هەموو چاوەڕوانین؛
ئێوەش له بەر چاوی ئێمە،
گەشتر دەبن، پتر دەبن، چوستتر دەبن،
دوژمن دەڕوات؛ له ناو دەچێت،
بەڵام ئێوە، هەر لەم خاکە جێگیر دەبن،
یێکتر دەگرن، ژیرتر دەبن!
بە پێی زەمان، پیرتر دەبن،
بەڵام، ڕاستتر، له سەنگەری کوردایەتی،
تا دێ، پشت ئەستوورتر دەبن.

١٩٦٩/١١/٦ - هەولێر.

## ئامۆزاکەم عەلی

ئامۆزاکەم، لە ئامۆزام پتر، کاکەم؛
ئەی هەڤاڵە دڵسۆزەکەم؛ خزم و کەس و گشت هۆزەکەم،
عەسای دەستم، هێزی ئەژنۆم،
پشت و پەنام، ئەی شیعرە پڕ لە سۆزەکەم،
من بە خۆم و بەم شارەوە، بە قەڵا و بەرد و دارەوە،
بە بیرێژی و تەیراوەوە، لە دووری تۆ، وا غەریبین؛
وا مانگێکە؛ هەولێرم بێ پێکەنینە،
(عەلی) دووریت خەمە، بۆم برینە!
مانگێکە پڕ، تۆم لێ دووری،
خۆشیش، وەك خۆت، لە کۆڵانی ئێمە دوورە،
هەستم کزە، هۆش ماندووە، فریشتەی شیعرم نووستوە،
نووکی قەڵەمم شکاوە، دڵ مردووە!
زۆرم سووە، ئەوا جەژنە؛ ئامۆزاکەم، ئێستا لەوبەری سنوورە،
ئەگەر بێت و بێت و ئێستا،
بێت لە دەرگای ماڵێ بدا، بانگم بکا،
ڕەنگە وەك کۆتر، باڵ بگرم،
ئاخر دووریت، مۆخی ناو ئێسقانم دەخوا،
عەلی، ژیان بێی تۆ، سەردوولکەیێکی حەزینە، کزم دەکا.
لە دووری تۆ، ئامۆزا خنجیلانەکەم،
ئەرێ برا وشیارەکەم، کاکە هەمیشە شێتەکەم،
دەزانی غەریبیت دەکەم.
زوو وەرەوە، خەریکە سیق و دیق دەکەم.

١٩٦٩/١١/٧ - هەولێر.

**بۆ بێگانه**

یادی دووپارچه کردنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد له عیراق!

تاك كوردستان! یێك كوردستان!
خاكه و داكه؛ باڵاتره له هەمووتان!
پێش چەند ساڵ بوو، له یادمه! وەك بڵێی لەبەر چاومه!
له هەورازی ماڵ و له نزیك دێ، دراوسێی شار، كێوێكی جوان،
ڕوو له ئاسمان، له سەر خاكمان،
ڕێك چەسپا بوو،
به هێزی یێكبوونی كوردان، داڕێژرا بوو،
كێوێك بەرز، له پۆڵا بوو،
سەر كەش، یێك ڕێز، بێهاوتا بوو.
كه بناری شاخەكانیان ئاگر دەدا،
دووكەڵی ڕەزی گڕگرتوو، بەرەو ئاسمان، هەڵدەكشا
كەس نەبوو قومێك ئاو بێنێ، سەرێك له ئاگر دەربێنێ!
هەر دەسووتا، درشت و ورد،
منداڵ و ژن، هەمووی دەبرد! ئاگرەكەی هەر خۆشتر دەكرد!
گریەی زارۆك، كه له ناو بێشكه دەسووتا،
ئاخ و ئۆفی باوكێك كەوا، كوڕی گەنجی له دار دەدرا!
هیچیان كاریان له شاخ نەكرد،
گیای سەوز و گوڵاڵەیان، له باخ نەكرد!
ئاخر چونكه ئێوه هەبوون، ئومێد هەبوو!
ساڵان هاتن، ڕۆیشت ساڵان؛
له ناو حەوشه، له باوەشی گەوره و منداڵ،
له هەورازی دێ و شار و ماڵ،

گرمەیێک هات، لە هیچ نەچوو!!
دەنگێک وەک خۆی نەبووە و نەبوو!
بەشێک لەو شاخە دارِما، کەل بوو، پەل بوو؛ مێشک جما!
پۆلا پەڕی! ئەشکەوتێکی ڕەشی ناحەز، لێی بوو پەیدا!
لە بەرزترین لووتکەی شاخ، بەشێک ڕزی؛
کەوتە ناو گۆم، لێی بوو جودا؛ بە پێی مێژوو، ئەو بەش دۆڕا!
کە پرسیم: (بۆ؟!)
پێیان گوتم: خۆ فرۆش بوون؛ کڕنۆشیان برد بۆ بێگانە،
بوونەتە پرد بۆ بێگانە، لیترەیی قوڕی بێگانە،
تیزابی چڕی بێگانە،
دایڕزاندن، دایچۆڕاندن،
ئەمەش لە بەختی کوردانە!
هەندێک هەبوو ورەی نەما،
چەندێکی تر،
لە خۆشیان کەوتە سەما،
بەڵام ڕاستی تەنیا ئەمە؛
لە کێوێک، نیوەی نەک کەمی،
بڕزێ و بکەوتە سەر دەمی،
با کوردێک نەبتە دەمدەمی،
کۆلکە مەرجە، کورد قەت ناچێتە بەر کەمی،
قەت نابەزی؛
پێشمەرگە، ئەژنۆی ناتەزی.

١٩٦٩/١١/١٥ - هەولێر.

**من و تۆ**

کوڵم پەمبەی، خەندە شیرین،
کچی تەمەن هەژدە ساڵی،
دەستم دامێنت، بمبینە، بمدوێنە،
بە زەردەخەنەی پڕ سۆزت،
وەك دیدەنیت،
هەست و مێشکم ببزوێنە،
بێ هۆشمکە؛ بمرفێنە،
ئازادمکە لەم دنیایە،
پڕ ئێشە، ژانە، بەڵایە،
ڕزگارمکە لەم جیهانە،
کەم ڕاستەی - پڕ خەڵەتانە،
با من و تۆش، ببین سەرخۆش،
بۆ بێك خولەك، دوور بین لە هۆش، پڕ بین لە جۆش،
بە ساقەت بم، تێکە، فڕکە، بۆم بخوێنە،
بمهەژێنە، بمژیێنە، دڵی هەپڕوون بە هەپڕوونم، دەی سارێژکە،
قوربانی باڵای باریکت،
چیتر دڵەکەم مەشکێنە.
ڤیانی چی؟ نەمانی چی؟
بەهەشتی چی؟ دۆزەخی چی؟
سەما بکە و بیهەژێنە!
سینگ واڵاکە و دەمت بێنە؛
هیتر بە پوولێك مەستێنە!

١٩٦٩/١٢/٥ - هەولێر.

### ١٥٨

سەد و پەنجا و هەشت، چەند کەمە؟!
دار بن، بە سالێك ناشكێن،
شاخ بن، بە قەڕنێك نارمێن،
گوڵ بن؛ دنیا بۆن خۆش دەكەن،
كچ بن، شارێك پڕ جۆش دەكەن،
كوڕ بن، وڵات پڕ هۆش دەكەن،
وێكڕا، هەمووان مەدهۆش دەكەن.
مامۆستانە! دڵنیامە كوردستان ڕوون دەكەنەوە.
١٥٨ین ئێمە،
تا گەیشتینە ئەم ڕۆژە، باوك و دایكان،
بیست ساڵ شەونخوون بوون بۆمان،
بە نەبوونی، بە خەمنۆشی،
هەژاری و بێوەژنكۆشی،
ئەمڕۆش بێ بیر و تێڕوانین، هەمووان دەبەن، بە بێهۆشی!
بۆ ئەم سەد و پەنجاو هەشتە؛
خێزانی كورد لە گریانە،
چاویان لە میهری یەزدانە،
ڕزگاریان كات، مامۆستانە!
ئازادی وان، یێكەم دەنگی ئازادی هەموو ئینسانە.
١٥٨ دڵدارن،
كۆرپەی ئومێدیان دەخنكێ!
ئەسرین لە چاوانیان دەتكێ،
سوپای هێزی ڕووناكینە، چرای دژی تاریكینە،

هەموو، مۆمن داگیرساون،
بۆ فێرکردن ڕاهێنراون،
ئامادەنە، لە دژی نەزانی وەستاون،
بۆ ڕوون کردنەوەی تاریکی، ڕاهێندراون.
١٥٨ مامۆستا،
بە بێ هیوا و بێ ئارەزوو،
چاوەڕێنە،
تا دوژمنان دێن زوو بە زوو،
ڕاياندەماڵن دەيانبەن،
بۆ خودی دوژمنی دڵڕەق،
ناچارن عەسکەری بکەن!
١٥٨ عەقڵی دانا،
ژیر و زانا؛
پەروەردە و ساز،
بۆ ناو پۆلی قوتابخانە،
بەڵام داخم، دیل کرانە!
دوو ملیۆن کورد،
درشت و ورد،
بە پەرۆشن، چاوەڕێنە مامۆستا بێن،
دەرس بە منداڵان بڵێن،
شتێك ئایین، یا بیرکاری،
یا ڕێزمانی کوردەواری،
مێژوو، وەرزش، یان عارەبی،
یا وانەی پڕ لە زانیاری!

دەڵێی تەمای لەتێك نانن،
لە بۆ فێربوون، بێ وچانن،
زانین بۆیان ئامادەیە،
بەڵام سەد داخ!
داگیرکەر دژی بەهرەیە!
دەیان ساڵە لە خوێندنین،
وا ئەو ڕۆژ هات،
چاوەڕوانین!
بۆ منداڵی کوردی ژێر دەست؛
دەیان ساڵە خۆ ڕێك دێنین!
ئەمڕۆ پێویستییان هەیە،
بڵێ! ڕاستی کەی ئەمەیە؟!
١٥٨مامۆستا،
بۆ منداڵی کورد پێویستن،
چرای نێو ماڵانی کوردن،
زۆر مەبەستن!
لە سۆران بێت،
لە بۆتان بێت،
لە شارەزوور،
منداڵی کورد برسیانن،
بەڵام چونکە کوردن،
کەسێك نییە،بایەخ بە ئارەزوویان دا، کوردن و بێ پاسەوانن!
١٩٦٩/١٢/٢٧ - هەولێر.

## جوانی شەقامی کانی

**پێشکەشی ئەو خانمە نەناسراوە بێت کە ئەم تێوارەیە لە سەر شەقامی کانی، هەولێر؛ چاوم پێی کەوت؛ بینیم بە هەناسەیێکی کچانەوە سەیرم دەکات! کە زانی منیش چاوم لێیەتی، بۆم پێکەنی و ئیتر هەر ئەو بوو، جارێکی دیکە نەمدیتەوە بەڵام ئیلهامی ئەم شیعرەی پێ بەخشیم؛ شۆخێ، سوپاس!**

قەشەنگەکەی جادەی کانی!
سەیرە ئاوا پێمدەڕوانی!
دەڵێی ئاگات لە هیچ نییە و هیچ نازانی؟!
جوانکیلە!
کاتی چاوچاوانێ نییە؛
ئێستا کاتی ڕۆیشتنە.
هەر دوو ڕۆژم ماوە؛ دەڕۆم!
بەڵام هەر لەبەر دڵی خۆم؛ پێشی بڕۆم،
تکا دەکەم؛
لە جیاتی تیر تێگرتنم،
قسەیێکم دەگەڵ بکە!
دڵم دەوە؛
چاکەیێکم دەگەڵ بکە!
گوێ بگرە لێم، تا پێت بڵێم:
تۆ قەشەنگی،
تۆ خۆت شایانی هاودەنگی،
بەڵام جوانێ،
گەورەی شەقامی بێدەنگی،
کاتی چاو چاوانێم نییە؛
زەمان هاتووە، ڕوو بە ڕوومە؛

وا عەسکەری، تەواوی ڕێی لێ گرتوومە!

***

خۆ دەتبینم، چاوت شینە،
لێوت پیاڵەی بادەیە،
پێڵووت کڵافەیێك نوورە،
هیوای ژینێکی سادەیە،
ئەو گەنجینەی کە لە بەژن و باڵات هەیە،
مەرهەمی زام و برینە!
جا دەی! کەمێك، گوێ بگرە لێم،
تا پێت بڵێم:
تۆ نێچیری،
بەڵام داخم، هیچ کاتێکی ڕاوم نییە!
ئەوا زەمان ڕوو بە ڕوومە؛
ئەو سەفەرەی هات و نەهات،
تەواوی ڕێی لێ گرتوومە!

***

پڕشنگ دەدەن، خەندە و کوڵمت،
شێتم دەکەن، زەردەخەنەی پڕ لە شەرمت،
سینگی نەرمت؛
دەزانم گەییوی؛ خۆشی،
گۆزەی بادەی پڕ لە جۆشی،
سۆزت وەك ئاگری نەورۆزە،
جەستەت تورتە، ڕێکە، قۆزە،
بەڵام چبکەم؟

داخم سەد داخ! لە چەقی ڕێ،
چم لە دەست دێ؟
چۆن بۆم دەکرێ، تێتبگەینم؟!
دەی! ڕاوەستە،
لە ڕاهی خوای ئەم هەڵبەستە!
گوێ بگرە لێم، دا پێت بڵێم -
- تۆ بێهاوتای، بەڵام داخم!
بەڵام، من، زۆر کاتم تەنگە،
هیچ ماوەی ناو داوم نییە!
زەمان هاتووە، ڕوو بە ڕوومە!
سەفەر سەلیقەی بردوومە!
تەواوی ڕێی لێ گرتوومە!
***
هۆ چەنە چاڵ،
خانم! لێو ئاڵ،
مەمە خڕ و چاو شین زوڵاڵ،
گەردەن بە خاڵ،
دەڵێی ئەتۆش هەر وەك منی؛
گەورەتر نی لە حەڤدە ساڵ؟
جا گەر وایە، ڕاوەستە بۆم!
هەڵوەستەیێکم بۆ بکە، مەبەستە بۆم،
بە گوێچکەتدا بچرپێنم -
- تۆم زۆر دەوێ، بەڵام داخم؛
دەستی پڕتاویم شکاوە!

کاتی دڵداریم نەماوە!
کات نییە بۆم؛
زەمان هاتووە، ڕوو بە ڕوومە!
سەفەر ڕێگای قوت کردوومە!
***
بە ڕەنووسی شیعری جوان،
بە خۆشترین ڕستەی ڤیان،
ناسکترین هێمای ژیان،
بە زمانی چاو، زمانی گوڵ، گەڵا و ڕحان،
پێم ناگوترێ ئامانجی خۆم ڕاست و ڕەوان،
بەرانبەرت نیتم زوبان؛
لە حزوورت ئەوەی بدوێ تەنیا چاوە؛
دەشێ بە بیلبیلەم بیڵێم -
زۆر تۆم دەوێ،
ئا، تۆم دەوێ!
بەڵام داخم!
کاتی بژاریم نەماوە!
زەمان هاتووە، ڕوو بە ڕوومە!
سەفەر ڕێگای لێ کردوومە!
***
جوانی شەقامی کانی،
دەستی زۆردار وا لە شەقام دەمپچڕێنێ!
گەڵای لاویم دەوەرێنێ؛
بەڵام جوانێ، هەر چەند دووربم،

تا دەمرم لەو پەڕ سنووربم،
هەرگیز دیسان، نەتبینمەوە،
چاك بزانە،
هێزیك نییە لە سەر زەوی،
وێنەت لە بیر بباتەوە،
نەرم بڕۆ؛ دا پێت بڵێم -
- زۆر تۆم دەوێ، بەڵام داخم!
ناتوانم من دڵنەوات بم،
ئاخر هەر نەماوە کاتم!
زەمان هاتووە، ڕوو بە ڕوومە!
ڕێگەش ڕێگەی لێ گرتوومە!
***
ئومێد تەنیا هەر خەیاڵە،
خەیاڵیش دووری ناپرسێ،
نەبەزە و لە کەس ناترسێ،
بە خەیاڵ دێمە باوەشت،
ماچ دەکەم، لێو و گەردەنت،
هەڵدەلووشم، کولمی گەشت،
بۆیێ تکا،
چاو جوانێ؛ بێ ئومێد مەبە،
تەنیا لە من نەقەوماوە،
گوێ بگرە لێم، تا پێت بڵێم -
تۆم پێویستە،
بەڵام داخم! بزانە کاتم نەماوە!

کات هەموو کاتی بردوومە!
زەمان هاتووە، ڕوو بە ڕوومە!
سەفەر ڕێگای لێ گرتوومە!
***
شۆخی شەقامی منداڵیم، یادم کەوە،
من، تۆ لە یاد نابەمەوە،
وەك کەزی زەردی هونراوت،
لە ناو شیعرێك دەتهۆنمەوە،
لە ڕەشبەڵەك بە پێزتر بێ؛
لە زەمان زۆر بە هێزتر بێ؛
لە خۆم تەمەن درێژتر بێ،
ئومێد دەکەم،
ئەم هۆنراوە پەیکەرێکت بۆ بتاشێ،
بەڵام چبکەم، چم پێناکرێ،
جگە لەوەی ...
بە قافییە عەرزت بکەم؛
عەرزت بکەم و پێت بڵێم –
- من تۆم دەوێ،
هەتا زیندوو بم، تۆم دەوێ؛
بەڵام داخم! کاتی تاوتاوم نەماوە!
زەمان هاتووە، ڕوو بە ڕوومە!
سەربازی خۆشی بردوومە!
تەمەنی تاڵان کردوومە.

١٩٦٩/١٢/٢٧ – شەقامی کانی - هەولێر.

## دوا قسە

دوا قسەم؛ ڕێمدێ، دەیکەم؟
ئاخر پاشی دوو ڕۆژی تر، زۆر دوور دەڕۆم؛
جوانێ، ئەگەر ئێستا نەیکەم، بڵێ چیبکەم؟
ترسم هەیە لە بیرم کەی!
بچییە نێو دۆڵی بێ یادی؛
ئەڤینم بدەی بە شادی!
ئاخر دووری فیکر دەشواتەوە؛
منت لە بیر دەچێتەوە!
بەڵام، جوانێ،
تۆ دڵنیای و دەزانی چەند تۆم دەوێ؛
تۆم خۆشدەوێ،
لە دووریت دڵم ناسرەوێ،
بێی تۆ گیانە، هێشتا فێر نیم، بنووم شەوێ،
بەڵام... ناچارم، هەر بڕۆم،
هاوار لە خۆم!
خۆشەویستیت، دڵی ژیانە!
داخی دووری تۆم گرانە،
ژیانم بێی تۆ پڕ ژانە!
ناوت بۆ من ئەستێرەیە،
دیدەنیت هەمووی بەهرەیە،
هانم دەدا،
تا ڕۆژێك لە بۆت بێمەوە،

من لەو ڕۆژە زۆر دەترسم،
لێت بپرسم، نەتبینمەوە!
بۆیێ، دڵۆ!
وا بە ڕۆژگارت دەسپێرم،
من لە بیرت نەباتەوە.
ئاخر ئەتۆ کرش و کاڵی،
زۆر منداڵی!
هەر ڕۆژێکت لە دۆخێکە،
هەر ساتێکت بە ڕۆژێکە،
بەڵام من، تۆ لە بیر ناکەم،
نامەی شیعرت بۆت دەنێرم،
یادمکەوە؛ دڵی خۆمت پێدەسپێرم!
وەك یەکەم ڕۆژ کە پێت گوتم:
- (دڵداریت لە خوێنم دەخشی؛
قسەت خۆشیم پێ دەبەخشی.)
ئومێد دەکەم، دڵدارەکەم،
تا ماوم لە بیرم نەکەی؛
تا ماوی، پشتم تێ نەکەی.

١٩٦٩/١٢/٢٩ - هەولێر.

## نـــــاز

ســـاڵ دەرباز بوو، تازە وا دێی، وەکوو تاوس، بە لەنجە نازت دەنوێنی؟
خۆ من هەر نێچیری تۆ بووم، ڕاوچی خۆمی، هۆی چییە دڵ دەلەرزێنی؟
نەکەی! تیری چاوت نەهاوێژە؛ شـووشـەی دڵم زۆر ناسـکە؛ دەیشـکێنی!
عەقڵم هێلانەکەی خۆتە، نازت نەبێ وێرانەیـــە، بیپارێـــزە، نەیهەژێنی!
١٩٦٩/١٢/٢٩ - بەغداد.

## ژیان

ئەم ژیانە زۆر گرانە بۆ گەلانی بێ ژیـان
کوردی بندەسـت تۆش وەرە سەر ڕێگەی ڕاست، بۆ مەیدان
بـە باوەڕێکی بڵند، بـە ئومێدی سەرکەوتـن
ورەی بـەرز پێویستـە، ئیمـــان بە خاك و یەزدان
وا ڕۆژی ڕیزگرتنـە لە پێغەمبـــەری خـــودا،
خۆشەویستمـان (محمــد)، هـــێزی ئازادی ئینسان
پیاوی ڕەفتار بـەرز، خاوەنی ڕێـڕەوی چـــاك
ڕێ نیشانـدەر، پێشـــەوا، خـــاوەن دیـــاری قورئان
خودا! لە بەر دەرگاتم، تەمام بە ڕەحمی تۆیە
توند لێت دەپاڕێمـەوە؛ ببەخشـە لــە گوناهمان
لـێرە پاداشتـــم ناوێ؛ ئومێدم بـــەو دنیایە
لەو دنیاش هەندەم بەسە، سەربەخۆ بێت کوردستان
ئیسلام فەرمانە دەیکا، کەسی ژێردەست نەمێنێ
ئینسان هەموو یێکسانن، عارەب، کورد و تورکمان
١٩٦٩/٩/٢٧ - هەلێر.

## ١٩٧٠

### يادداشت

یادی ئەو ڕۆژەی لێی بێ هیوا بووین
کات نەدەڕۆیی، هەر چەند وێکڕا بووین بووین
داخی ناو هەناو، هەر لە بان زار بوو
جەستەی ماندوومـان، لـە جـل بێزار بوو
گەنجێك لــە خەیـاڵ نەوەستا دەمێك
کــەی ڕزگار دەبین لـە (تەدریب) کەمێك
لەو دوو پێیانەی لە ناو پۆستاڵ بوون؛
دوور لە تـۆ، خووسـاو، سمی ئاژاڵ بوون
قژێکی کــورتی نارێــك، لـە سـەر سەر
دوور لــە دیکــۆر و لــە شانــە و هونەر
لە تەپە تەپی کاتــی (استعــداد)،
بــە ڕیز ڕاوەستان، کـە زابــت دەهات!
تــۆپ هاوێژانی هەمــوو (ڕەعایل)،
قیــت وەکوو قەمیش؛ ئەفســەر ناقایل
ئەو عەریف عەلییەی بە سێ خەتەوە
زمانێکــی پیــس، وەك ژنــی شــەوە،
زۆڵــە کوردێکی بــێ شــەرم و حەیا
لێی دەقیراندیــن، خــوا بیــکا فەنـا!
لە پاش دیدەنی ئەم عەریــف عەلییە
زۆر شەرمــە بلێــم، عەریــف کوردییە!

١٩٧٠/١/٣٠ – العمارة.

## ژیـــــــــــن

ژینی پــــر ئازار، خۆشی لـه دوایه چاو له پاش مردن؛ فرمێسکی نایه
بێ هۆش ڕۆژێکی عەقڵی دێتەوە ژانـــی سەربـــازی بـــیر ناچێتەوە
١٩٧٠/٣/١٤ - ڕێی بەسرە.

## چیت گوت؟

دەژیـــم لـه یادداشتی گورگان،
لـــه سەر پەڕی باڵی چرگان
عەوداڵی ژیـــن و شادیمـــــە،
عەشقـی خۆشـــی و ئازادیمە
بـه هیچ کـــەس هەڵناخەڵەتێم
بۆ هیچ کەس لانادەم له ڕێم
لــه نـــاو قاچــی ئەختەبووتان
سەربەستی دەردێنم بۆتـــان
داگیرکـــەر لـــێرە ڕاو دەکـــەم
کرنـــۆش به دوژمنتان دەبــەم
ئـــازادی لـــه چنـــگ دەردێنم
بـــۆ کـــوردی هـــەژاری دێنم
نـــاوم بـــا بکاتـــه کێوانـــی،
بـــا بلـــێ - بـــرای جووله‌کانی
جا دەپرسم، ئەی تۆ، خۆت چی؟
گـــەر بـاش بی، ئینجا ئینسانی.
١٩٧٠/٣/١٦ - هەولێر.

**بە ڕێگەی خۆم من تۆم دەوێ**

من شاعیرم؛ دیاری من هۆنراوەیە،
قەڵەمدارم؛ دراو لام نەدیتراوەیە،
ڕێم دێ؛ با بۆت ڕوون کەمەوە،
لەم دونیایە،
کەسێك نییە سەرمایەی هێندەی من هەبێ،
من خاوەنی سامانێکم،
موڵکی قاروونی چك دەکا،
من خاوەنی قەڵەمێکم،
لە هەر شیعرێك،
وەکوو بارانی پایزە، پەڵە دەدا!
سەرچاوەی سامانەکەی من،
مێشکە، دڵە، هەستێکی فرە ناسکە،
مەبەستیشم لەگەڵ ڕێبازی عاشقان،
ڕێچکۆڵەیان تێکەڵ دەکا،
ئەمە هەموو سامانمە،
هۆی مانمە!
لای من هیچە،
پارە و پوول و زێڕ و گەوهەر،
بە دڵداریم قایلی گەر،
تا هەڵبەستێکت پێشکەش کەم،
تا هەتایێ
لە بیری کەس نەچیتە دەر.

***

به پاره پەروەردەت ناکەم؛
بە مرواری ئاوت نادەم،
بە لێبووردن پێت دەگەیەنم،
بە ڕووخۆشی تێت دەگەیەنم،
ئەگەر تۆش پشتم تێ دەکەی،
داوای دینارم لێ دەکەی،
بۆت نانووسم شیعر، یەك دێڕ،
بەراوردی ناکەم بە زێڕ،
هێشتا هەر پێت دەڵێم؛
کەوێ،
تۆم خۆش دەوێ،
زۆر تۆم دەوێ،
بەڵام کێوی باوەڕی من،
مەحاڵە نەمێنێ لەوێ،
با هەر دڵ بێی تۆ نەسرەوێ.

١٩٧٠/٣/١٤ - ڕێی بەسرە.

## هیوا

ئومێد، سەیرە!
هەر ڕۆژێك لە ژینم دەڕوا، تێر دەگرییێم،
هەر باییێگ بۆ کوردستان بێ، بۆت پێی دەڵێم -
هیوایێکی سەیرم هەیە،
هەر دێمەوە!
چاوەڕێم بە؛ ڕۆژێك دێ دەگەڕێمەوە،
بە هەموو بوونم دێمەوە.
هەر ڕۆژێك لە دوێنێ پتر،
دڵ بڵێسەی لێ هەڵدەستێ،
هەر چرکەییێك،
گەڵاییێکی عومری لاویم هەڵدەبەستێ،
وای لەم هۆڵە گەورەیەدا،
لەگەڵ کۆمەڵی هاوڕێیان،
دەڵێینەوە، باسی خۆمان،
پلانی دوور، یادی جوان!
کە باسی تۆ دەگێڕمەوە،
قسە خەفەت دەتوێنتەوە؛
هەموو ئومێدی سەر زەمین،
دێنم، کۆیاندەکەمەوە،
ئارام دەگرم تا ئەو کاتێ؛
کە بۆ کوردستانێ دێمەوە.

١٩٧٠/١/١٠ - شاری العمارة.

## پاشی زەردەشت

پاشی زەردەشت، بە دوو هەزار و پێنج گەشت
وا، کەللـــەی کاسمان لێ قەڵەشت؛ دۆزیمانەوە ڕێی بەهەشت!
سەدان ساڵ بوو، بزر بووین، ون،
مێشك پڕ لە فیکری دوژمن!
لانکی دوژمن دەیهەژاندین،
فیکری ئەو بوو دەیخەواندین،
تەکانی ئەو دەیبزواندین! ترسی ئەو بوو دەیخەساندین!
ئێستا وا ئاگا بووینەوە؛
سوپاس، وا خۆمان دۆزییەوە، وا کوردستانمان ناسییەوە!
هەزار ساڵ بوو، دەڕۆیشتین بە گاگۆڵە!
کێ ویستبای هەستێتەوە، پێیان دەگوت کوڕی کافر، داوەڕەوە!
ئێستا کاتە، بە ئاگانە، مەخەونەوە!
بە قسەی ئەو زۆڵانە مەکەن؛ مەنوونەوە!
ڕۆژی خەباتە؛ مەسرەون! تێکۆشن تاکوو سەرکەون!
لە یازدەی مانگی ئادار بوو، کورد بە سەربەرزی ڕزگار بوو،
ئازادی هاتە ئەم ناوە، شار و دێمان وا گەشاوە!
پاشی زەردەشت، بە دوو هەزرا و پێنج سەد گەشت،
ئاڵای ئازادیمان هەڵکرد، ڕەمزی ژێردەستیمان لابرد؛
شکاندمان، پیاڵەی ڕق لە تاکی کورد؛ لە ناومان برد!
لێرەوە کورد، وا هەستاوە؛ وا ژیاوە؛
ناچتەوە خەو، هەر چوار لامان ببێتە شەو!

١٩٧٠/٣/١٢ - بغداد

**بژی مارت**

چ بەزمێکە! چ خۆشییە و پێکەنینە!
چەند سەیرانە، ئەم ژیانە!
سەما و شادی و هەڵپەڕینە!
جیهان خۆشە،
شەو وەك ڕۆژە، ژین پڕ جۆشە،
کچان، کوڕان، گەنجان، پیران،
دایکان، خوشکان، گشت کوردستان،
لە سەیران و پێکەنینە!
وا ئادارە، لەم بەهارە،
سرووشت هەموو ڕازاوەیە،
گوڵ، گوڵییە! گەشاوەیە،
چیتر لادێی کوردەواری وێران ناکرێن؛
چیتر یاراغمان ناکوژرێن،
چیتر باوانمان ناکوژرێن،
چیتر خونچەکان ناسووتێن،
چیتر منداڵ یەتیم ناکرێن،
چیتر هێلانە تێك نادرێن،
لە ڕۆژی یازدەی ئادار بوو،
کۆتایی گشت ئێش و ئازار بوو،
بژی ئادار،
دنیای کوردی کردە بەهار.

١٩٧٠/٣/٢٤ - بەغداد.

**شیرین بەهارە**

لە بەر چاوی دۆست، بە خۆشی دڵدار، وا دەگــێڕمەوە بارستی یادگار
بــە زردەخەنــە و دەم بە پێکەنین، دەهێنمـە سەمـا عــەرشی کردگار
بێ شیریـن زوبـان؛ ڕووناکی چـاوم، هیوا و ئاواتم؛ جــەرگ و هەناوم
زامــت بــە جارێك چارەســەر کــردم، لەگــەڵ ئازادان بنووسـە ناوم
شیریـن بەهــارە بەهـاری شادان بەهرەدار لـە ژیــن، گەل بـە مرادان
جەژن و بەهـار و حوکمی زاتیمـان، گشتی پــیرۆزی کــورد و ئازادان
شیرین بزانــە؛ زامم سارێــژە، تۆش وەك مـن وەرە قسەی خــۆت بێژە
گۆڵمێـــك ئاواتمـان وا هاتۆتــە دی، تامــی سەربەستــی وەرە بچــێژە
نەژیـن بـۆ مردن؛ مردیــن بۆ ژیان ئـەم قازانجەمان؛ پاشکۆیە بـۆ زیان
بێ با هاوبەش بین، لــەم دەستکەوتانــە؛ ببینە بـرا، خۆش دەبێ ژیان
بێ دابنیشــین لـە بــن هەنــاران بــۆت بگێڕمــەوە باسی دڵــداران،
تا لە یاد نەچــن خەباتی سەر شــاخ، شـەوی ناو سەنگـەر، ئاواتی جاران
بێ دابنیشین لە بن داری بــەی، دەفتەری یادگار پــاك بدەین بـە مەی
بزانین کامــە زووتر مەست دەبێ مــن یا تۆ یا ئـەو، یا پـای عەرشەکەی
بێ با بۆت باس کــەم سەیران و خۆشی باسی کێو و دەشت ڕووبار و چۆمی
مێرگ و بــەراو و پاوانی خۆشی، دەتهێننــەوە جۆش، چون وەکوو خۆمی
بــێ دابنیشین بە بـــەزم و شادی، ژیایــن بە مەردی و گەردەن ئـازادی
وەك شــوورەی پۆڵاین بەرانبەر دوژمـن، هیتر کەس نامرێ بە نامورادی
بڵێسـەی ژینم هــا لـە هەولـێرە، جێی دانـا و زانـا و مەڵبەندی شێرە
پەرستگــەی عەشتار، خانــەی موزەففەر، بە باوەڕ بـەرز، بە چاوان تێرە
شیرین! لە پاشی چەند خونچە نێشتن، پەت و سێدارە، پاش ئەشك ڕێشتن
ئێستا سەردەمی بــەزم و سەیرانـە، لــە یێکتر بووردن، ساردی نەهێشتن.

١٩٧٠/٣/٢١ - بەغداد.

تێکەڵەیێکە لە شیرین بەهارەکەی بلە، بە بۆنەی ١٩٧٠/٣/١١ نووسراوە!

## بۆ کوردستان لە نەورۆزی ساڵی حەفتا (٧٠)

ئەم هۆنراوە لە حەفتەنامەی (ژین) لە ساڵی ١٩٧٠ بڵاو کراوەتەوە.

زەردەخەنەی خواوەندانە، پێشکەش بە لێوانت دەکەم،
ڤیانی دوو دڵی خاوێن، پێشکەش بە چاوانت دەکەم،
دڵداریت بۆ دەنەخشێنم،
شیعری بە جۆش، دەهۆنمەوە،
بە باڵاتی هەڵدەواسم،
بە لەنجە و لارتی دەبەخشم،
لێبووردنی هەموو دنیا، وەك چەپکە گوڵێك بۆت دێنم،
خۆشەویستی هەموو خەڵکی،
لە سەر ڕێی خۆشیت دەڕوێنم،
وەك ملوانکە، بە نیشان بۆتی دەهێنم،
ئەم هەموو هەلهەلەی دایکان،
زەماوەند بۆت پێی دەگێڕم،
لە نێو گەلان و وولاتان،
وەکوو بەیداخ هەڵتدەکەم، وات لێدەکەم،
لە فریشتەی ئاسمانی خوا، جوانتر بی،
لە کچی شۆخی گشت جیهان، بەنازتر بی،
وات لێدەکەم، خەڵکی هەموو تۆی خۆش بوێ،
ژین و ئازادی بۆت بوێ،
لە جیهان تاکە ڤیانم،
پێشمەرگەم بۆت کوردستانم،
لێت بێ پیرۆز، جەژنی نەورۆزی کوردانم.

١٩٧٠/٣/٢٧ - هەولێر.

**لە من ناگەی؟**

ئاخ! لە دەست تۆ! بۆ تێناگەی؟
مەگەر بۆ خاکی کوردستان، ئاخێکی وام هەڵکێشا بێ!
ئۆف! لە دەست تۆ! گوێ پێنادەی!
مەگەر بۆ تەرمی شەهیدان، ئۆفێکی وام ڕاکێشا بێ!
دەسکە گوڵێکم هێناوە،
مەگەر ئەمەم بۆ زەماوەندێك بەستا بێ!
لای تۆش دڵێ، نە بارانە، نە زریانە!
بۆ گاڵتە، لە یادم دەکەی،
دەسووتێنی، پەروانەی باڵ ناسکی عیشقم،
دەسڕیەوە خۆشی ژینم،
دڵ لە داخان،
وەکوو زێی هاری بادینان، شەپۆل دەدا!
جەستەم مارێکی دوو سەرە، هەر لوول دەخوا!
ئەتۆش هێشتا، خۆت گێل دەکەی،
وەکوو بڵێی لە من نەگەی،
لە من ناگەی؟
گەر بڵێی نا؛ درۆ دەکەی؛
باش تێدەگەی.

١٩٧٠/٤/١ - هەولێر.

هەولێر

شــاری هەولـــێر، باڵندەیـــە، لـــە ناخ دڵم هەڵنیشتووە؛
گوڵــە، ئــاوە، باخچـەی خوایە، میوەی سەد جۆری گرتووە!
لــە بـیر ناکرێ، قەت شارەکەم جێگــەی یاری و یارم بووە!

١٩٧٠/٧/٨ معسكر الحبانية - الرمادي.

## پیتگـــــــــر

ئەم هۆنراوەیە هەموو پیتەکانی کوردی تێدانە.

کچـــی شیرینی مەڵبەنــــدی کــــوردان،
ئاوازی جـــوانی هەستـــی هۆنــــەران،

هەر هەناسەیێك بۆم هۆنـــــــراوە بێت،
لـــە دڵ، ئاگـــری نەکــــــوژاوە بێت،

هەمووی بە چـاوت لە بـۆم دێنە جـۆش،
بـۆت دەهـۆنـنەوە چـریـکەی زۆر خـۆش،

ئــــەی فەرامۆشی دڵـــەی خوێناویـــم،
زمانــــی تــــەڕی دەریــــای بــێ ئاویم،

هــــــــەر تۆم لە یادە، هەر تۆم لە یادە،
دڵــــم بـــە هیـــوای دیـــدارت شـــادە.

١٩٧٠/٧/٨ معسكر الحبانية - الرمادي.

**کچە عارەب**

کچە شۆخەکەی شوانی عارەب ڕەشەسمەر، تەنك، ناسك بە ئەدەب
ناوقەد باریکی سینە دەربەڕیو ڕوومەتی کوتـــراو، تازە پێگەییو!
چاوڕەشی ڕووگەش، ناسکی زۆر خۆش، کە دێتە باوەش، دەمکاتن سەرخۆش،
ئەم ئۆردووگەیەی سەر ئەو گردانە، بووینە جێی شـــادی و خۆشی زەمانە،
زۆرم نەمـــاوە؛ وا تەسریـح دەبم، ئومێدمـە بشڕۆم، لـە دڵت دەرنەچم!

١٩٧٠/٧/٨ معسكر الحبانية - الرمادي.

### ڕوخسارەکەم

ڕوخساری من،
ووشك بووە؛
وەکوو بەستە؛
وەکوو بت بێ هەست و خوستە!
بێ جوولە و بێ تپل و مستە،
هەر چەندە لێی ورد دەبمەوە،
شتێکی لێ ناخوێنمەوە.
وەك بەردی تاشراو و ڕووتە،
لە سەر ڕێیە،
بێ مەبەستە!
هەر دەمایەکێ کە ساز بم،
سەر لە نوێ دەیشۆمەوە؛
دەینووسمەوە؛
پڕ هەڵبەستە!

١٩٧٠/٧/٣٠ الحبانية - الرمادي.

## گیتار

تۆم خۆش دەوێ،
ئەسرینی شەوی تەنیاییم،
سەمای دڵی بێ نەواییم!
زەردەخەنەی لێوی تینووم!
مەڵبەندی سووری خەناوی؛
سەد بە فیدای تۆ بێ، ژیان!
بە دڵ، بە دەم، بەخت دەکرێی؛
هەر تۆی بۆ من سەر و سامان!
تۆم خۆشدەوێ،
تۆ بەهەشتی،
پڕ لە پەری شیرین زوبان!
شایستەی شادی هەمووانی،
تۆ گیتاری شادی منی؛
دڵی دڵان دەدرێت بە خاکی کوردستان!

١٩٧٠/٨/٢٠ - ئۆردووگەی الحبانیة - الرمادي.

**دوا لاپەڕە**

ژیان، ژیان!
بە چ جۆر و چ شێوەییێك،
بە چ ڕوویێك،
ئاوا ناخۆش هەڵسوکەوتم لەگەڵ دەکەی؟
زێدە لەم هەموو خەڵکانە، وەبەر تیر و توانجم دەدەی؟
چم تێدەگەی؟
تۆش بەم هەموو تەمەنتەوە،
وەکوو خەڵکی، فەرمان لە دژم دەردەکەی؟
بۆ بێ دادی پەیڕەو دەکەی؟
وەك ئەوانی؟
یاخود ئەوان، تۆیان فێری، ستەم کردووە؟
هەرچی و چۆن بێت،
بزانە چیم!!
مرۆڤێکم،
مەحاڵە سەر دانەوێنم.
هەرگیز وازت لێ ناهێنم؛
تاکوو سرووشت لێکمان نەکات.
تەنیا یەك ڕۆژ ژینم مابێت،
ئەو ڕۆژە جەڵەوت دەکەم،
من باوەڕم بە خۆم هەیە،
دەتگەوزێنم!

١٩٧٠/٨/٢٠ - ئۆردووگەی الحبانية - الرمادي.

**به یارمەتیت**

پێشمەرگە بۆچ پێشمەرگەیە؟
ئەگەر بەهار بۆ کوردستان،
نەسازێنێت کاتی زستان!
ئەگەر گوندێك خاپوور کرا،
داینەمەزرێنێت لە ئێسقان!
ئەگەر هەر کۆرپەیێك کوژرا،
تۆڵەی نەستێنێ بۆ دایکان!
ئەگەر باوکێك جەرگی بڕا،
ئومێد نەهێنتەوە ژیان!
ئەگەر ئاوی کانی تکا،
هەڵنەکەنی سەد رووباران!
{تا کاری دەچتە سەر بڵێ:
بە یارمەتیت، لە ڕاهی خوا!
بۆچی خۆی کاری نێتە دەست،
لە لای خۆی کاری خۆی نەڕوا؟}[1]

١٩٧٠/١٠/٣٠ – ئۆردووگەی الحبانیة - الرمادي.

---

[1] ئەم چوار دێڕەی دوواپی!، لە ١٩٧٠!، لە لایەنی وەزارة الإعلام – هیئة رقابة المطبوعات!، لە بەغدادا، (حذف) کرا؛ نەکا چاپ و بڵاو بکرێتەوە.

سەربازی

له یـــادداشــــــتەکەی ڕۆژی نـــاخـــۆشــــمان
له کـــــــــــز و مـــاتی و یـــاد و پەرۆشـــمان
کـــات رادەبـــووردن، ڕەشی بـــــــــێ هـــیـــوا
لــــــــه نـــــــاو پۆســـتـــاڵی گـــــــەرم، بێ پەروا
له ئـــاخ و ئۆفێـــــــــــــــــــك، زاریـــان گرتبوو
جەســـتەیێکی ســـــــــڕ، بێزار و مانــــــــــــدوو
مـــێشــــــکی بـــێ فـــیـــکـــر له هەمـــوو دەمـــێ
نەدەحەســــــــاوە، نـــــــــــه زۆر نــــــه کەمێ
دڵێکی مانــــــدوو، هەر دەهـــــــــــــــــــــەژاوە
هەســتێکی شـــــــــــــێواو، نەدەبــــــــــووژاوە
گەرمـی پـــۆســــتـــاڵـمان، قـــاچـــی ڕزانـــدیـــن
گەرمـــای تەدریـــبـــیـــش خـــڕی بـــرژانـــدیـــن
قژمان مــــــــــــات ببوو، لــــــــــــه بن بێرییه
دیکـــــــــۆری نەبــــــــوو ئـــــــــەو گەنجاتییه
لــــــــــــه تەپـــــــــــه - تەپی کاتی (استعداد)
دەبـــووه قـــیـــژەقـــیـــژ، که زابـــت دەهـــات
تەیـــــــــــــــارە شـــکێنی گشـــت ڕەعیلــــــەکان
ئەفســـــــــــەر ناقایــــــل، لــــــــه عەریفەکان
عەریفی عــــــــــــــــــارەب به ســـێ خەتەوە
قســــــــــــــەی جنێو بوو، خوا بیبـــــــڕێتەوە

۱۹۷۰/۸/۲۰ - ئۆردووگەی الحبانية - الرمادي.

## من پێشمەرگەم

من پێشمەرگــەم!
لە مەیدانی کۆڵنەدانـدا، سەرەتـای ژینـم نووسیەوە!
من پێشمەرگەم!
ڕووبارێکی بیری ڕاستیم، قەت چك ناکـەم، نابڕێمەوە!
من پێشمەرگەم!
داهێنەری مێژووی کوردم، دەستخەتی من ناسڕێتەوە!
مـن پێشمەرگەم!
ئازادی بــۆ وڵات دێنـم، ڕووناکــیم کــــز نابێتەوە!
پارێــــزەری کوردستانــــم،
تـا کــورد مابێ، بەیداخــــم دەشەکێتەوە!
من پێشمەرگەم؛
ئاڵای کــوردم هەڵکــردووە، ناشرێتــەوە؛
بۆ هیــچ هێز دانایێتەوە!
لە چــوار کەلی کوردستانــدا،
لە خەباتــم؛ نەتەوەکــەم دەژیێتەوە!
پێشمەرگەمە،
تــا ئاکاری زۆردار مابــێ، لــە سەنگــەر ناکشێمەوە!
پێشمەرگەمە،
تا کوردستان ئازاد نەکەم،
ناخەوم و ناحەسێمەوە.

١٩٧٠/١١/١٥ - هەولێر.

**له بەر دەستی بارزانیدا**

پێشکەشە بە سەروەری کورد مەلا مستەفا بارزانی.

لـــە داخی بێکاری ئـــەوا، شاخانی کـــورد دەگرمە بـــەر؛
پەردەی شـــەرم، هەڵدەماڵم، دەچمە لای بارزانی سەروەر؛
دەڵێم گـــەورەم، بۆیێ هاتین؛ چونکە کوردین و هەژاریـــن؛
ماف خوراویـن، لێقەوماویـــن؛ بێ پشتیوانین، بێ هاندەر!
گەورەم، ئێمە لە پاش خوێندن، لە قرچەی گەرمای هاوینان،
لە ناو بەفر و سەرمای زستان؛ هیچ کاتمان نەدا بە هەدەر!
تەمامان بـــوو کاتی ئێستا، هەمـــوو ببـــین بـــە مامۆســـتا
کەچی هێشتا، تا ئەم دەمە، بێ دەستکەوتین و دەربەدەر!
لـــە خزمەتی منداڵی کـــورد دابراویـــن، دووره
ڕێمان نادەن، خزمەت بکەین، هیچ کارێکمان ناچێتە سەر
کەسانێـــك ویژدانیان فرۆشت، ئیسقانی کوردانیان کرۆشت
بوونەتـــە پێڵاوی دوژمـــن؛ ئەوان کاریان دەڕوا، یێکسەر
ئێمـــەش هەموو هەتا ئەمڕۆ، هەر چاوەڕێینە و هیچ نییە،
پێشەوای کورد! مافێك نییە بـــۆ گەنجان بکرێ دەستەبەر؟
۱۹۷۰/۱۰/۱۷ - ئازادی - حاجی ئۆمەران.

ـــبله

**جانگ**

هەر هۆنراوێك بۆ كورد نەبێت،
هاوار نەبێت و گورد نەبێت

وەك بڕنەوی پێشمەرگەكان،
شەیدای نەعرەتەی مەرد نەبێت،

زاخاوی ناو مێشكی نەزان
خۆی شیعرێكی بێگەرد نەبێت،

لە بەرانبەر بیری كۆنی
ناو كوردستان، خەرەند نەبێت

گومان نەبێت، هۆ زان نەبێت،
بە قەناعەت، شەوگەرد نەبێت؛

هـــۆزانـــەكان هەڵـــدەواسم؛
وشەكانیان با پەرت نەبێت

٣٠/١٠/١٩٧٠ - الحبانية - الرمادي.

## ١٩٧٢

### نیگاری خۆم

له ئاوێنەی سەر دیواری ناو ماڵەکەم،
لە ڕوخسارم ورد بوومەوە؛
دەمویست شتی لێ هەڵبێنم،
ئاکاری خۆم بدۆزمەوە.
گەرمێك؛ ساردێك!
قسەکی خۆش، یەکی ناخۆش!
هیچم نەدی،
بەس پەیکەرێ؛ بێ واتا و بۆش!
بێ هەست، بێ سۆز، بێ گڕ و جۆش!
لە نووکی هەرە سەرەوەی قژمەوە بێ،
تا دەگاتە نووکی پەنجەی بچووکی پێ،
نازانم چیم! یا چتۆ ناوێکی لێدێ!

### قژم

پرچم پێچاوپێچ، ناڕێکە؛
نە وەك پرچی خەنەبەندانی بووکێکە،
نە وەك کاکۆڵی لاوێکە!
نە زولفی کچە شۆخێکە،
هەر بۆنی داوێکی لێدێ!

### نیوچەوانم

ئەوەی سۆز بێ تێیدا نییە، سارد و سڕە،
نە زیندووە، نەمردووە!

نە شانازە، نە بێ نازە، بێ هەست، کڕە!
ئەوەی زۆر چاك لێی دیار بێ،
پڕی لۆچە، دەڕوا، بێ ڕێ!

**برۆیەکانم**

مووی زبری برۆیەکانم، زۆر شێتانە، لێکیان داوە!
هەر چەندە هیچ دەرنابڕن، بەڵام هێشتا وا دیارە بۆنی لێدێ!

**چاوەکانم**

خەمی دنیایان تێدایە،
وەك بازاڕی شێخەڵڵایە!
گرێ کوێرەی لێ دراوە،
ئەسرینیان تێ قەتیسماوە،
ڕەش و سپییان تێکەڵاوە،
سەرم سوڕما لەم هەرایە! دەی؛ چی لێدێ!

**کوڵمەکانم**

ڕەنگی کوڵمەم کاڵ بۆتەوە،
باڵی گرتووە، هەر نەماوە،
وەك ئاوێکە، لە بیابان وشك دەبێ؛
دڵۆپ، دڵۆپ دەزێتەوە؛
تەنیا سوێراوی لێ ماوە؛
بۆ هیچ کەس نا، تەنیا هەر لە بۆ خۆم دەشێ!

١٩٧٢/٣/١٦ – هەولێر.

## باز و خەو

لە کەنارێکی بێ ووشە، وا بەستوومە!
من لە دووری یار و شارم، وا مەست بوومە!
خودا هاوار؛ ئاواتێکم بۆ دیارکە؛ ئامانج سەلیقەی بردوومە.
ئێوارە هات، تاریکی کرد،
هانام بەرەو ماڵی خوا برد،
جنۆکەکان ڕەوینەوە، دێوەکان کاسیان کردوومە!
ئەو هەندە بیرم کردەوە؛ تا ناو مێشکم پڕ کرم بوو،
مێشوولەکان، خوێنیان مژیم؛ لێم وردبەوە، وا مردوومە!
لە سەرەتای نیسانێ بوو، درۆیان کرد،
ئەمێستا کورد لە کۆزی ئینسان نەماون، جودا بوونە!
مانگی قەشەنگی پێکشەوەش،
تریفەکەی بۆ کورد نییە!
جوانییەکەی بۆ کورد نییە؛
ئاخر تەنیا یێك کوردیش نازانێ، کە پاشەڕۆژ مانای چییە!
هیچ نەتەوە وەك خێلەکانی کورد نییە، نەبووە و نییە!
مرۆڤی کورد وەك کۆترە،
بەڵام زۆر بە هەڵۆ چووە،
لەگەڵ گەردی بەیان چوستە،
لە کاتی هەڵمەت، خەوتووە!

١٩٧٢/١١/٢٠ - کورتاندروو - هەولێر.

## مێژووی قامکە پرسیارێکی ئاگرین

لە دۆزەخی گڕی خامەی دوور لە یادداشت،
ڕاڤەی نووسینی سەر بەردە پاشماوەکەی کۆنی مێژوو، دەشکێنم،
ئەو تەفسیرەی دوژمن کردی،
بە دەستاڕی هەڵبەستێکی هێسک گران، دەشێوێنم!
کەشتی هێزی مانەوەی نووح، ورد دەهاڕم، لە بن دێنم!
کێوی ڕزی درۆزنەکان، لە ڕیشەوە دەردەهێنم،
دەهۆڵی بۆشی بێ شەرمان، دەدڕێنم.
مێژوونووسان تاکەی درۆ کاوێژ دەکەن؟
لە بەر چی ئەسپی ڕاستیی تەروادە ئازاد ناکەن؟
(ژان ڤۆڵژان[١]) ی برسی و هەژار، تاکەی (چاوەڕێی گۆدۆ[٢]) بێ؟
تاکەی ترسی منداڵی کورد، تەشەنە بێ، نەبڕێتەوە؟
بڵێن! تاکەی جوتیاری کورد لە سەر زەوییەکەی دەربکرێ؛
لە بۆ ناو شار ڕاپێچ بدرێ؟
تاکەی (گۆران[٣]) لە زیخ و چەوی بنی ئاو، ڕابمێنێ؟
وەکوو (سارتەر[٤])، دەبا ئەویش، بە تێلیفۆن، لەگەڵ خودا،
مشتومڕیان لێبێ پەیدا؟
ژیان ئاوا، ناچێتە سەر!
(بێرترەند ڕەسڵ[٥]) بۆچ ڕێك نەخا، دادگای گەلان؟

---

[١] ژان ڤۆلژا – پاڵەوانی چیرۆکی (کلۆڵەکان – Les Misérables - ١٨٦٢)، (ڤیکتەر هۆگۆ) نووسیەتی.
[٢] (لە چاوەڕوانی گۆدۆ)، شانۆنامەیێکە (ساموێل بێکت ١٩٠٦ – ١٩٨٩) لە نێوان ٩/١٠/ ١٩٤٨ تا ١٩٤٩/١٢/٢٩ بە زمانی فەرەنسی نووسیەتیەوە و پاشان هەر خۆی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیسی.
[٣] گۆران – شاعیری کورد، لە نێوان ساڵانی ١٩٠٤ – ١٩٦٢/١١/١٨ ژیاوە.
[٤] ژان پۆوڵ سارتەر (١٩٠٥ – ١٩٨٠) فەرەنسییە؛ خاوەن فەلەسفەی (بوونخوازی Existentialism).
[٥] بێرترەند ڕەسڵ (١٨٧٢/٥/١٨ – ١٩٧٠/٢/٢) ماتماتیکزانی بریتانی بەرگر لە بنەماکانی مرۆڤایەتی.

(مەلای گەورە[1]) تاکەی ئاخ هەڵکێشێ لە بۆ ژنان؟
(حاجی قادر[2]) تاکەی پێخاوس، بە بێ کەوش و بە بێ کاڵەك،
ڕێگا ببڕێت، بچتە باڵەك؟
(ڕەزا)ی ڕۆح سووك،
تاکەی جنێو و قسەی سووك،
بۆ (شوکری فەزلی[3]) ڕەوان کا؟
تاکەی مامەی قەحپەژن کا؟
با شێخ ڕەزا، سەڵتەی شێخان بدڕێنێ،
تەکیەی شێخان بڕمێنێ، نووشتەی شێخان بسووتێنێ.
ئاخر ئەویش وەك شێخەکان،
لە بۆ بەرژەوەندی خۆیان،
سووتاندیان خاکی کوردان،
زڕاندیان ناوی کوردان،
ڕماندیان ماڵی کوردان!

* * *

ڕاست و ڕەوا بۆم ڕاڤە کەن؛ (کاوە) تاکەی کورد بمێنێ؟
(ژێهاك[4])ی دادپەروەری کورد،
لە نەورۆزان، مێشکی لاوان دەربهێنێ؟
ئاخر بۆچ ڕاستی نەگوترێ؟
(زەردەشت) تاکەی، ئاڤێستاکەی لە بن تەمی مێژوودا بێ؟
بیشارتەوە و دەری نەکا،

---

[1] مەلای گەورە – مەبەست گیانشاد مەلا محمدی کۆییە.
[2] حاجی قادر ( ١٨١٧-١٨٩٧ز) – مەبەست شاعیری گەورەی کورد حاجی قادری کۆیە.
[3] شوکور فەزلی شاعیر بووە، شێخ ڕەزا کەیفی پێنەهاتووە و بە (پوورە شوکری) ناوی بردووە.
[4] ئەو فەرمانڕەوا دادپەوەرە بووە کە کاوەی ئاسنگەر (پارس بووە) کوشتوویەتی و حوکمەکەی بۆ پارسەکان گەڕاندووەتەوە؛ کورد سەرچیغ براوە و بە پاڵەوانی خۆیانی دەزانن.

نەیداتە بەرد، نەیداتە دار، سەری نەکا؟
یان بڵاوی نەکاتەوە؟
گڕی پرسیار سووتاندمی!
ملکەچی زۆرینەی خەڵکی، برژاندمی،
چاوەڕوانیش وەختە لە پێست دەرمبێنێ!
لەگەڵ لافاو ڕاپێچمدا؛ بمرێنێ،
ئەگەر هەزار قامکە پرسیاری ئاگرین،
بخەمە سەر پشتی ئاسمان،
لێوێك نییە زاتی هەبێ بێتە مەیدان،
ڕاست و ڕەوان،
بۆم ڕاڤە کات هەموو مێژووی تاریکستان!
١٩٧٢/٣/١٦ - هەولێر.

**شایەر**

خۆش بـن، گوتـەی شایــەران،
لـە ناو خەڵكی، هەڵدەدەن،
ڕەوان بـــن، گـــەر زمانیــان
نەختێ تیژ بن پەل دەدەن،
ڕەوەنـدی ناوچـــەی ئێمـــە،
گوتوویانـــە و هەر دەڵێن
(گامێـــش تەیرەكـی سووكـــە
دەفـــڕی وەكـی باشووكـە!
دەچتـــە خاكـی كیستانێ؛
دەخـــوا بەفـــر و كیفارێ!
گێـــوژێ تــە قـــەت تەرانـی،
شفتیێ دەهۆهـــۆی پێوە!
زەلام كەتنە ســەر چـار پــەل؛
كەریــش دەڕۆن بە پێوە!)
شایەر، دەبێ یار هەست بــێ؛
قافەكـەی پـڕ مەبەست بێ
هۆنـراوی مرازبەنـــد بــێ؛
شیعـری ڕێك و سازبەند بێ!
لـە مەنتك (تەهـــا مامـەر)
(مـــەلا قـــادر)ی ڕەنجدەر؛
هیتریـــش لـــە گەرمەســـێر،
بێلـــن، بنـــەڕن وەك شـێر!

ڕێســـــن هەڵبەســتان، تــێر،
بەیتی تــیژی وەك شمشێر!

هۆنراو هــەر لە شایەر دێت؛
مەبەســــــتە شایـەر بیڵێت؛

با هۆنراویـان هەڵواسرێـــت؛
لـەو دەروازەی نـاوی دێت

قســەکانـیان بیسـتراوە؛
شووشەیــە و نەشکاوە

هەڵبەستەکانیان نــاوە،
ئاگـرە و داگیرســـــاوە

ئەگەر بێت، ڕێی پێنەدرێت
بە سووتان چارەی ناکرێت

ئـەو هەڵبەستەی دەنووسرێت
شایـەر نەیڵـێت دەرناچێت

١٩٧٢/٣/١٦ – هەولێر.

## یارەکەم

یارەکەی من هەر خۆیەتی بێ هاوتایە! شیرین شەکرە، جوان هەورە، وەکوو بایە!
بەفری سپی، سەر لووتکەیە، کانی ڕوونە گوڵـە، دڵـە، چاوە، کلــە، دیـــاری خوایە!
قاسپەی کــەوە، دەنگی بولبولی بەیانـە، خۆشی و شادی و ڕووناکییە، هـەر چرایە!
یارەکەی من بە خۆی زینە، شێتی مەمە وێڵـی ژینە، هەمـووی ئومـێد و هیوایە،
دڵدارەکـەم ڕوومەت گەشە، نازدارێکە، هـۆی شادییـە؛ بەهارێکــە، نەبینــدرایە!

۱۹۷۲/۱۲/۷ - گوندی کورتاندروو - هەولێر.

## ئێمە و کوردستان و خۆشەویستی

پێیان گوتم - ئێوەی کورد، کوردستانتان هیچ خۆش ناوێت!
منیش لە وەڵامی هوڕێنەی ئەواندا، یێکسەر نووسیم -

یوبە، یوبە! گوێ لە من بە!
ئێمە کاتێك کوردستانمان خۆشویست،
ئەو دەم هێشتا،
بناغەی زەققوورەکەی ئوور[1]،
لە سۆمەر[2] دانەمەزرا بوو!
هەرەم خۆفۆ[3]،
لە ناو بیابانی میسر، نەچەسپا بوو،
خۆری فەلسەفەی یۆنانی[4]،
هێشتا هەر دانەڕێژرا بوو!
بۆ هیچ کەس و نەتەوەیێك،
مانگی ئاسمان،
نەببوە سەرچاوەی تەقویم،
یێك ڕەمەزان نەگیرا بوو!
کە کورد بە خوێن خاکی کوردستانی ئاودا،
عیسای مەسیح،
هێشتا، لە خاچێ نەدرا بوو!
ئاڤێستا ئەو کات یاسا بوو!

---

[1] زەققورەی ئوور – پاشماوەی پێتەختی سۆمەرە لە نزیك شاری ناصریە، باشووری عیراق ماوە.
[2] دەولەتی سۆمەری کۆنترین شارستانیەکی ناسراوە، لە ٦٠٠٠ ساڵەی پێش زایین دروست بووە.
[3] ، ە خۆفۆ – گۆڕی شا خۆفۆیە (٢٥٨٩- پ.ز.٢٥٦٦) بەرزییەکەی ١٤٦.٥م، لە نێوان ١٠ تا ٢٠ ساڵی پێنچ ەواو دروست کراوە.
[4] فەل ی یۆنانی – بە توێکڵی هەموو فەلسەفەکان دەناسرێت؛ لە یۆنان لە ٦٠٠ ساڵی پێش زایین، گەشەی ،ووە، بابەتەکانی سیاسی و ڕەفتار و میتافیزیك و زانستی هەبوون و هزربەندی و زیندەوەرزانی و گفتسازی و جوانناسی و زۆر بابەتی دیکەشی گرتووەتەوە و بایەخی پێیان داوە.

پێشتر، مرۆڤ هەر مەیموون بوو،
ئەهریمەنێك گەورەی فریشتانی خوا بوو!
قفا نبكِ إمروءُ القَیس[1]،
ڕێك نەخرا بوو!
هێشتا جبریل،
قورئانی پێ نەسپێرا بوو!
کە کوردستانمان خۆش دەویست،
مێژوو دەستکاری نەکرا بوو!
نەبوونی کورد و کوردستان،
لە خەواڵووی زەمانێکا،
بە قەڵەمی ناهەقنووسان، نەنووسرا بوو!
ئێستاش هاتووین،
لە ناو ڕیشی پیسی دەروێش، ئازادی کەین،
لە ناو جغزی ملکەچیدا، دەری دێنین،
گەورەی دەکەین؛
مەزن، بەرەو ئاسمان دەیبەین،
با هەر چێرچڵ[2] قایل نەبێت،
دا کوردستانمان ئازاد بێت!
کوردین، خۆمان گەورەی دەکەین،
ئۆقرە ناگرین؛ هەر سەربەخۆیی پێی دەدەین!

١٩٧٢/٥/٣٠ - هەولێر.

---

[1] إمروء القیس گەورە شاعیری سەردەمی جەهالەتی عارەبی بووە و هەڵبەستی (قفا نبك) داناوە.
[2] ونستن چێرچل (١٨٧٤/١١/٣٠ - ١٩٦٥/١٢/٢٤) پیاوی دەوڵەت و سەرباز و نووسەرێکی بریتانی بوو کە لە ١٩٤٠ تا ١٩٤٥ سەرۆك وەزیرانی شانشینی یەکگرتوو بووە؛ هەر ئەو چێرچڵە بوو نەیهێشت دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ، هاوکێشەی تورکیا و ئێران و دەوڵەتانی عارەبی، لە کوردستان، پەیدا ببێت و بە نارەوایی، کوردستانی بە سەر پێنج ولاتدا دابەش کرد و تا ئێستاش کوردان دەکوژن.

## ده گوێ بگرن

مرۆڤێکم ئارەزوومە دەنگ هەڵبڕم؛
بیروڕاییێك وەك خۆم سادە، دەردەبڕم،
ئەمن کوردم،
مێشکی ناو هێسکیشم کوردە؛ کوردە، گوردە!
باوکم کورد بوو،
دایکم لە هەموان کوردتر بوو،
فێریانکردم، کوردم بوێ،
ئەم کوردستانەم خۆش بوێ،
فێریانکردم؛ لێیان فێر بووم،
لەم شاخانە، کولێرەی ڕۆژێم پەیدا کەم،
دەستم بۆ کەس درێژ ناکەم،
برین بە کەس سارێژ ناکەم.
من خۆم کوردم، پیاوی باشم،
بە جەمانەی سەر ناسراوم،
بە کەرکم بە کڵاشم.
گوێ بگرن لێم!
بەگزادە نیم؛ جووتیارێکم،
بێ کێشەمە، هەژارێکم،
کوردم لە کوردستانێکم،
ڕەگم کۆنترە لە ئاشوور،
لە بابل و مەئرەب و توور!
مرۆڤم من، ئاشتی پەروەر،
لە شەڕ بە دوور.

هێشتا ماومە؛ گوێم لێ بگرن!
باوکم پەروەردەی کتێب بوو،
دایکم بۆ خۆی کیژە شێخ بوو،
بەڵام هێشتا، هەر جووتیار بوون؛
خاوەنی (داس) و (هەوجاڕ) بوون،
(پەرێز)؛ (گیشە)؛
(شەغرە)؛ (جۆخین)؛
(جەنجەڕ)؛ (شەنە)؛ جا (شەنەبا)؛
ئینجا کاتی (دانەوێڵە)؛
کاری دەستیان وەك ڕەهێڵە،
هەموو شت، کاری دەستیان بوو،
(جۆخین،) (جەنجەڕ) و (مەڕداری)
هۆی ئازادی ژیانیان بوو،
هەتا مردن (کا) و (قشپل) ئاگریان بوو،
شیری مەڕیان هێوێن دەکرد،
ئاویان بە (کۆتك) فڕ دەکرد،
بە (دەستاڕ) دانیان دەهاڕی،
میواندارییان، ئەگەر چاك با،
باوەڕکەن، (شلە ساوار) بوو،
(نیسك) یان (نۆك،) یان هەر (ماش) بوو؛
(دۆ) یان (دۆشاو) بادەی باش بوو؛
ساڵ دووازدە مانگ،
نانی سبەینە (مزاش) بوو؛
ماڵمان خانوێکی جزیری؛

نه هی ئاغا، نه هی میری؛
هێشتا ڕازی؛ ئێمه بڵێین، تۆش گوێ بگری؟
ده گوێ بگرن!
تا باسی کەم، له بۆتانی ڕوون کەمەوه،
(تەمۆخ) وەك ناو لەپم دڕه،
جل و بەرگم فره شڕه!
تۆ خزمەتچی ملکەچت هەس،
بەڵام ئێمه، له بەر دەرگا، سەگمان هەیه؛ ئەویش دڕه!
ڕوومەتێ وه، بۆر، چڵکنه،
ڕوخسارێ مه، زۆر کوڵکنه!
سوور هەڵگەڕاوه له هەتاو،
ئەوەی دەیبەن ڕەنجمانه، شکۆفه دەدا له دوڕ چاو،
لەو گەڕەکەی ئێمه دەژین،
ساڵێ یێك جار گۆشت دەبینین،
جەژنی قوربان، خێر دێ بۆمان؛
نەك لای عارەب، هەر لای خۆمان!
جا وا باشه هاوار هەڵدەم، بەرەو ئاسمان!
یێکسەر بەرەو (ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتان)
ئەی ئەندامان؛ ئەگەر دەکرێ بێنه لامان؛
بەراوردێك بکەن بۆمان!
ئەوەتا ناوو نیشانمان:
کۆڕی گەله ژێردەستەکان،
چەوساوەکان،
له وڵاتی بێ وڵاتەکان؛

لە ک.. و... ر... د... سـ... تـ...ا... ن!
ئەرێ بە ڕاست، وڵات چییە؟!
لەم خاکەدا،
لەم نیشتمانە چاکەدا،
باکوور، باشوور، ڕۆژهەڵات، ڕۆژئاوا، نییە؟!
هۆ! ئەندامانی ئەنجومەن!
لە لای ئێوە، وا بزانم،
هیچ (نیشتمانی جوان[1]) نییە!
دەی گوێ بگرن -
(ماڵیان بردین، سەریان بڕین،
گەنجیان کوشتین، زگیان دڕین،
لە دایك و باوك و لە برا،
لە ژن و منداڵیان کردین!)
کەسێك نەما،
بۆ کوردێکی وێرانە ماڵ،
بۆ کوردێکی لادێ سووتاو، ببتە پەنا،
ئێوەن پەنای هەموو دنیا.
گوێتان لێبێ -
ئێمە کوردین؛
ئێمە گەلێکی زۆر مەردین،
کوردین و دژی مرۆڤ نین؛
بەڵام، بەڵام،
ئەگەر ڕۆژێك هات لەم شارە،

[1] لە گۆرانییەکەی (کوردستان نیشتمانی جوان) هاتووە.

مرۆڤمان خوارد،
هیچ سەیرانتان پێمان نەیێ؛
گشت ئەندامانی ئەنجومەن،
بێ دەنگینە،
وڵاتانی خاوەن تۆپ و سەر مەرگینە،
ئاخر هەمووتان دەزانن،
ئاگاداری سەر مەیدانن،
دەزانن کورد چەند برسییە،
چەندە ماندووی ئازادییە!
چەندە تێنووی ڕزگارییە!

١٩٧٢/١٢/٦ - کورتاندروو[1] -هەولێر.

[1] کوردتاندروو – لادێیەکی کورد بوو لە بناری چیای قەرەچووغ – دەڤەری کەندێناوە – بەعس کاولی کرد.

١٩٧٣

**بەندەکانم**

له سەر سینەی گۆڕی مردوو
له باخەڵی مێشکی هزرێکی با بردوو،
له ناو کونی زوڕناکانی بێ زوڕنا ژەن،
له سەر پەڕی باڵی حوشتر، من دامهێنان،
لەمەش پتر، من ڕامهێنان.
*
بەندەکانم،
له ناو ئەو گۆڕە تارانەی هێشتا بۆتان لێ نەدراون،
هەستنەوە!
هەر کێ هەیە، لەز کەن، ڕابن،
له جەسته بێ ڕۆحەکانتان، خۆ ڕزگار کەن،
دوورکەونەوە!
ببنە لافاو!
لافاو کەی ئاوی ویستووە؟!
ببنە نووسەر،
قەڵەم، ترسی نەبیستووە.
*
هۆ بەندەینە! هۆ بەندینە!
وشکی و گەرما و بیابان بێ،
دەتخنکێنن.
زۆنگاو و ئاو و باران بێ،
دەتخنکێنن.

شمشێر جەستەت دەپاچێنن،
گوللـــەمێشکت دەپرژێنن،
زیندان ورەت پێ بەردەدەن،
داتدەڕزێنن!
برین و جەنگاوەر یێکن،
مردن لە ڕێ گەوراتییە،
گەر لە مردن ڕزگارت کەن، دەتژیێنن.
*
ستەم چییە؟ ستەم ترسە، ملکەچییە؛ نەهێشتنی مەرداتییە.
قایلنەبوون بە ستەمکار، یێکەم پەیژەی سەروەرییە.
*
بەندەکانم! چاو هەڵبڕن!
بە دوای چارەنووسدا مەچن؛
یاسای چەوسانەوەی مرۆڤ، زوو بدڕن؛
کاری بۆ بکەن؛ ببن بە یێك! بۆی ڕاپەڕن!
ڕۆژ ڕۆژی کوردایەتییە،
خاکمان جێی مەردایەتییە!
*
بەندەکانم! من بناسن؛ ئەگەر ئێستاکەش نەمناسن؛
ڕۆژێك هەر دێ، ڕۆژێك هەڵبێ، ناچارتان دەکا بمناسن؛
چونکە مۆری خوێنی ئێوە، بە دەست منە!
من و ئێوەش، زیندەگی ئازادمان دەوێ؛
تاجی سەری شای ژیانیش، ئازادییە.
١٩٧٣/٥/١٨ – کورتاندروو – هەولێر.

**بێزاری و درۆ**

چاك دەزانم كە ئاسمانیش،
وەك خۆم ئاسا، لێم بێزارە،
دڵی ئێوە لە هەڵوێستم بریندارە،
منیش لە خۆم زۆر بیزارم؛
دڵم خۆ هەر برین نییە،
شەبەق شەبەقی لێ دیارە.
ئەسپی هیوام چوار قاچی لێ كرووزاوە،
گڵپەی هەستم،
لە لیخناوی بێ تاوانیدا خنكاوە.
بزەی خامەم،
لە سەر لێوی كیژۆڵاندا، دارِساوە،
ڕووناكی ئەستێرەی جوانی تاقی ئاسمانی دوو كوڵمەم،
لە سەر گۆڕستانی مەند و تاریك، چەقێندراوە.
دەنگی گەورەی شمشاڵی قاقای دەروونم،
بە پینەی ڕزی سەر گوفەك، تەپ كراوە.
گەنجە شەنگەكەی ڤیانم،
بە پێچەوانەی مێژووە،
بە كاریتەی ئاسمانی شەو،
سەر و ژێر وا هەڵواسراوە.
هەموو یاساییێكم ڕەتدا،
هەموو ڕیژێمێكم تەنی،
لە گشت باوەڕێكم لادا،

پیتۆڵانم لە لا شێت بوون،
لە هۆشیاران لە هەڵلامدا،
گەلۆ! سووتام،
لە باخی بێباوەڕیدا؛
گێژم لە ناخ بێ هۆشیدا،
چاوم پەرست، چاو ڕەش نەبوو،
قاچم پەرست، ڕانم پەرست، کوڵمم پەرست،
سینەی سپی و مەمەی خڕ و لەبم پەرست،
باڵا و سمتی پڕم پەرست،
سوودیان نەبوو!
گەڕامەوە بەرەو یاسا دەستکارییەکان،
بەرەو درووشمە شێتەکان،
بەرەو کووتاڵی نووسراوی،
هەڵواسراوی،
ناوەڕاستی شەقامەکان.
بەرەو چەپڵە، بەرەو شایی،
بەرەو هەڵپەڕکێی ڕەشبەڵەک،
بەرەو مێژووی ڕەوانبێژی، بەرەو گێژی،
بەرەو ئەو ڕەشەبای سامناک،
فووی دێوی درۆ و دەڵەسان،
دیسان دە پەنجەی خۆمم گەست،
نەفرەتم کرد لە درۆزنان.

١٩٧٣/١٠/١٤ - هەولێر.

ئێوارەیێکی ڕەمەزان، لەماڵێدا، تەنیا و ماندووبووم.

## هەڵەپاس[1]

بــە ڕیشت، عابــدی غــاری؛ هەیئەتت نوور لێی دەباری!
مەقامــت لای خەڵکــی زۆرە، وەك عەلەمــی شــڕ دیاری!
زوبــــان شیرینی بــەر و ڕوو، شەکــر لـە حەرفان دەهاڕی!
هەمیشە دەست بـە دەستنێژی ئیمـــام و خەتیب و قـــاری
صاحبی مزگــەوت و حوجرەی پایــزی و زاهــیر بەهــاری!
ئەوەی لات بێت، برای پشتێی؛ لە دووریش بـۆی ژاری ماری!
ڕیشـت بتاشــە، بــۆت باشــە؛ کەوا و جوببەت بــە بازاری!
زمانــت بــبڕە لـــە ڕیشــە؛ کەســـــیتر نەدڕە؛ هەوجاڕی!
قسـەت سەریح بکە، ڕاست بە، تا ناوت نەچێتــە ســەر زاری!
ئیمــام و خەتیبــی، نابێــت، لەگـەڵ فیتنە و بــەدڕەفتاری!
لێت پرسی بــووم - قادر چییە؟ گوتــم شیوعی؛ بـــە ناچاری،
خــۆت دەزانی عەیبی نییــــە، فیکــری ڕاستی کــوردەواری!
چلــۆن وابـوو، تۆی ڕیش سپی، قسـەت گــۆڕی، بــێ ویقاری!
لــە مەیدانی ئیمــان، مەجیــد وا جێی هێشتی بــە قـەرداری
خــۆ ئینکاری چاکــــەت ناکەم لە بـــەر چاوە، وەك ڕووباری
بەڵام چی بکــەم، مەلا، تو خوا، دەڵێن لە کـــــن دەعوەتداری،

۱۹۷۳/۱۰/۱۸ - کورتاندروو - هەولێر.

[1] - ئەم شیعرەم لە وەڵامی ڕەفتاری مەلای گوندێك نووسییەوە.

## ١٩٧٤

### منـــدالْ

له جیاتی وشەی تفت و تاڵ
بۆت بنووسم ناسکترین وشەی هەستم،
وشەی قشتی لێو بە خەندە، وشەی چاو کاڵ،
زۆر شاد دەبووم بۆت بنێرم،
دەسکە گوڵێکی پەممە و ئاڵ.
بە حەسرەت بووم،
ئازادت کەم لە گێژەنی بیری پووچی پیرێژنان،
دەرتبێنم لە نێو پەشمە، لە ژوور، لە چاڵ!
بە ئاوات بووم، زەردەخەنەت پێشکەش بکەم،
باوەشم بۆت بکەمەوە، فرمێسکت بۆ بسڕمەوە،
لە تەنگانە، هەردوو دیدەم، بێم و دڵت بدەمەوە،
وردە ماچی وەکوو جاران،
بڕنم لە لێو، لە کوڵم و خاڵ!
زۆر پێم خۆشە، لە ناخی دڵی ئاوارەی شارە ناودارەکەی خۆمان
پەنا و پەسیو بپشکنم، بەرزی و نزمی بکەم بە باڵ.
کون، کون، ڕێ، ڕێ، ئەم شارەمان،
بگەڕێم کۆڵان بە کۆڵان، گەڕەك، گەڕەك و ماڵ بە ماڵ،
لە هەموو کووچە و کۆڵانێك، لە هەر بانێك،
لە بڵندگۆی هەر مزگەوتێکی ئەم شارە،
پڕ بە دەم لە بۆ تۆ بانگدەم -
خۆشم دەوێی، خۆشم دەوێی، گەورە منداڵ؛ منداڵ، منداڵ.
١٠/٦/ ١٩٧٤ - هەولێر.

## خۆم و خۆت

شەپۆلی زەنگی بەرزاتی ئەگەر ڤینۆس لە ئاسماندا، بسازێنێ،
شەققــــەی باڵی بـــازی بەختــــت دەوروبـــەرت بتاسێنێ،
ئەگـــەر زرمـــەی بازووی لاویت کێــوی قەندیل بلەرزێنێ؛
باوەڕت بێ؛ تۆ هەر خۆتی، منیش هەر خۆم.
گـــەر لـە ژیـــان بـە دڵسۆزی، هەتا مـردن چـــاوەڕێ بی،
بـــە دڵســـاردی بمێنییەوە، بــێ ئارەزوو، بــە بــێ جــێ بی،
زەمـــان هەرگیز گوێت پێنادات، ئەگەر تەنیا خۆت لە ڕێ بی،
باوەڕت بێ؛ تۆ خۆت دەبی؛ منیش هەر خۆم!
ئـەم هەمـــوو هـــات و نەهاتـــە، بە تەنیا تـــەق و تۆقێکە،
لــە کن هەندێك هـــەر شێوەنـــە، لە لایێ بـــەزم و ڕەزمێکە،
لــە خاکێکی نەناســراودا، جــێ و شوێنمان چەنـــد بستێکە؛
باوەڕت بێ؛ تۆش هەر خۆتی، منیش هەر خۆم.

١٩٧٤/٦/١١ - هەولێر.

**چارۆگ سپی**

چارۆگ سپی، کراس پەممە، کەوا سەد تەرزی بێ تۆزە
لەرەی مەمەت خۆخی کاڵە، باڵاکەت شەنگەبێ قۆزە
کوڵیك و نێرگز و ڕێحـــان، حاجیلە و پوونگی بێن خۆشی
هەنگاو داوێی بە شەرمەوە، لەنجەت ئاوازی نەورۆزە،
سۆتکە و پیفۆك و کەنگری، لە سەر تا پای قەدت تەرزە؛
قژت تاریکی ئێـوارە، ڕوومەتی گرتـووە، بە سـۆزە
لێوت تکە خوێنی دڵە، دەمت زامی جەستـەی کولە
زەردەخەنەت شکۆفەیـــە، نـاوت ئـــاوازی پـیرۆزە.

١٩٧٤/٥/١٩ -کورتاندروو - هەولێر.

**له ڕێگا بەرەو قۆناغێکی بێ خانە خوێ**

قاچەکانم، ماڵیان نەڕمێ؛
هەر ئەوەتا هەنگاو دەنێن!
کووڕ بۆتەوە پشتی لاویم،
کەللـــەی سەرم گەرم بووە؛
هیچ کامێکیان، بۆم ناسازێن!
ژێر و ژوور بێت، یان پاش و پێش،
نە ئاوارەم، نە هەژارێکم، نە دەروێش؛
- ئەی بۆچ ئاوا سەرهەڵگرتووی؛
به دەشت کەوتووی؟
- ها! ها! برا!
- سەگەکەت دیت، چۆن ڕای دەکرد؟
پەنای بۆ سێبەری تانکی نامەردەکان، دەبرد!
- ئەی بێچوە پشیلە جوانەکە؟
ڕۆیی هەرگیز نایێتەوە!
- مریشکەکەی ماڵی بێریت،
بە چاوان دیت؟
- ئەی بەستە زمان!
جێی هێلانەی لێ چووە ئاسمان!
سەمای دەکرد، وەکوو مەیموون!
- ها! ها! ئەی خۆم؟!
منت بینی بە چاوی خۆت؟
دەڕۆیشتم؛ سەودا سەر بووم؛
لە گوندی خۆم، دەربەدەر بووم!

من، خۆم، تۆ، ئەو، گشتی ئەوان؛
وەکوو یەکین، هەر هەموومان!
من هەم - دوو گوێ، هەر وەك هیوان!
دوو دەست، دوو پێ، هەر وەك هیوان!
لە ڕێ دەڕۆم، منی ئینسان؛
وەك عارەبان!
خۆ هەیتیشم؛
دوو ڕێز برژانگ، دوو برۆی پان،
وەك عارەبان!
زگ و پشت و سەر و کەللـــە و سمێڵ قەیتان،
وەك عارەبان!
دفن و کوڵم و پەنجە و سمت و ئامرازی نێرینەکەشم، ڕێك و جوان،
وەك عارەبان!
من هەر من و ئەوان، ئەوان،
وەك عارەبان!
خۆ ئەوانیش هیچیان لە من پتر نییە؛ وەك من ئاسان،
ئەم ئەندامانە هەس لایان.
پارەم، پوولی گیرفانی وان!
قڕڕڕ..قڕڕڕ.. تەق، تەق، گرم، گرم.. بم، بم، بشووووو. تپ.
نە تۆپ نە تانك نە فڕۆکەی مێگی ڕووسی،
باوەڕ نەبێ؛ کوردایەتی لێ بترازێ، هیچمان نییە!
تانك و فڕۆکە شکێنیش؛
-هووووشششش.
- ئەها! ئەها! بە خوا ئەوا سەرانگێو بوو.

کەچی ئێمە هیچمان نییە!
من، من، من، من، باوەڕێکم بە خۆم هەیە،
وا چەسپاوە، هەڵناتەکێ، نابڕێتەوە؛ ئەوان، نیتیان.
ئاخ! ئاخ! سەرم! بۆم ناسازێ.
ژێر و ژوور بێت، یا بەر و پێش.
هەر ئەوەتە هەست پێدەکەم قاچم هەیە!
هیچ مزگێنیم پێنەدراوە؛
هەر نازانم، ڕێگاکانم، بۆ کوێم دەبەن؟
نە ئاوارەم، نە دەربەدەر،
نە گێژ و وێژ، نە سەوداسەر!
ئەی هۆی چییە، عارەبەکان،
دەرمان دەکەن لە ماڵ خۆمان!
دێن و دەخۆن؛ ئەگەر لە پاش خواردنی خۆیان،
شتێك ماوە، ئەویش دەبەن بۆ ڕەفیقان!
نان و ماست و ماستاو و دۆ!
ساوار، نیسك، گەنم و جۆ! هەمووی دەبەن،
ئینجا پاشان هاوار دەکەن،
دەقیڕێنن، نەکەن؛ قەت لێرە نەمێنن!
هـــــاوار، هاوار؛ خودای ئاسمان!
دەرمان دەکەن! ماڵەکەمان تاڵان دەبەن!!
هاوار بۆ کێ ببەم؛ یەزدان!
بڵێن هاواری کێ بکــەم،
ئەی نەتەوە یێکگرتووەکان؟

١٩٧٤/٥/٢٩ - هەولێر.

**هاتووین**

هاتووین، گۆڕی مێژوو دەکەینەوە،
تەرمی پاشا درۆزنەکان،
لە قەبرەکان، دەردەهێنین،
ئاڵای درۆی نەبوونیمان دەسووتێنین.
بەیداخی وجوودی کوردی،
لە سەر شادەماری مێژوو،
ڕاست و ڕەوان، وەك کوردستان،
لە شوێن ئاڵای درۆزنەکان،
بەرز، بەرز هەڵیدەدەین، تا دەگاتە تاقی ئاسمان.
ناوی گۆڕاوی باوکەکان دیسانە دەگۆڕینەوە،
ئەم ناوانەی ئێستاکە هەن،
پارچە دەکەین، دەسووتێنین،
دوا پەڕی ژێر دەستیمان،
دەدڕێنین،
قەڵەمی زۆردار دەشکێنین،
داگیرکەران دەبەزێنین.
پێیان دەڵێین –
- ئێمە گەلین، ئێمە کوردین،
مەگەر خۆمان، خۆمان بخۆین،
دەنا قەت، قەت نادۆڕێنین.

١٩٧٤/٦/١٤ – هەولێر.

## خەیاماوی

بێ ویستی خۆم داتهێناوم، بێ ویستی خۆم دەممرێنی!
دەڵێن لە پاش مردنیشم، بێ ویستی خۆم، دووبارە دەمژیێنییەوە،
جا گەر وایە، بڵێ، بۆ چی، دەمخەیە بەر گڕی پرسیار؟
خۆ دەزانی، من بەرپرسی جووڵەی خۆم نیم،
کەی رەوایە لە ناو دۆزەخ دەمهێلیەوە؟

١٩٧٤/٦/١ - هەولێر.

## دوا لاپەڕە

ژیان، بە چ جۆر، بە چ شێوەیێك،
بە کام ڕوخسارت، بۆم هەڵدەسووڕێی؟
زێدە لەم هەموو ئەو خەڵکە زۆرە،
وا ڕووی ناخۆشیت لە من کردووە، پێمدا هەر دەڵێی؟
فەرمانی نارێك لە دژم دەردەکەی؟
تۆ هەر چی و چۆن بیت... بزانە من چیم!!
من ئەم مرۆڤەم، سەرم شۆڕناکەم.
وازت لێ ناینم؛ تا هەردووك مابین
تا یێك ڕۆژ مابێ لەم ژینە تاڵەم،
دەبێ ئەو ڕۆژە جڵەوت بکەم.

١٩٧٤/٨/٢٠ - گوندی تل الخیم - هەولێر.

**جوانی ڕێی ئاو**

نەرم نــەرم کارمامزی دێ، هەنگاوی نا، هات بۆ کانی
بــە شێنەیی لام تێپــەڕی، زەینــی دامێ بکــوژانی
نیگای لە چەشنی برووسکی، جگەری کردم بە خەڵووز
زەردەخەنــەی بــە ئاستەمی، دڵی بــردم بــە ئاسانی
لەنجە، بەژن، زەردەخەنە، ناسك، تەنك، وا دیار بوون
سەمای دەکرد، دڵی دەبرد، گۆزەڵەکەی لە سەر شانی.

١٩٧٤/١٠/٩ - گوندی تل الخیم - هەولێر.

**پاشی بیست ساڵ**

ئەگەر پاشی بیست ساڵی تر لێیان پرسین:-

- کوڕی کێنە؟ دەی! باوکتان، ناوی چ بوو؟

کوڕی کێ بوو؟ خەڵکی کوێ بوو؟

- ڕۆڵەکانم، ئەمە سەرباسی باوتانە؛

لە دووکەڵی دارستانێك پەیدا بووە،

بەر لەوەی کە بیسووتێنن،

سێبەری لە کورد کردووە!

ڕۆڵەکانم، کێ کورد بووە؛

لە شەوی تاریکی کەرکووك؛

لە ڕۆشنایی بڵێسەکەی باوەگوڕگوڕ، فرچك بووە،

لە ناو گڕی بیری ئاگر، تێهەڵچووە،

هەر بەو گڕە، تا سەر ئێسقانی سووتاوە،

گۆی دووچاوی لەوێ ماوە.

زۆرترین جۆگەڵەی خوێنی،

بە کووچەی تەپە و قۆریەدا شەپۆل دێنی،

کەللـــەی سەری لێ پژاوە.

ڕاستی ڕۆڵە، قرتقرتۆکی تەنگی باوکت،

لوولەی پشووی شای سەر تەختە!

باوکت بە خۆی، ئەهریمەنی ناشیرینی، خەوی حاکمی بێبەختە!

قرێژە لە بن نینۆکی خوا نەناسێك،

کە کوردستان داگیر دەکات،

ئاگر ناو دەبات بە شەختە!

ڕوخسارەکەی دیکەی باوکت؛

ڕووناکی پێڵووی دڵداره،
بێشکەی کۆرپەی منداڵێکه،
هێشتا هەر وا له گروگاڵه.
باوکت شەوقی کازیوەیه،
له بۆ ئاینده بەهرەیه،
له بۆ یاران، باوکت گوڵه!
بۆ چاوی کاڵی ئەو کچه،
ئێستا خەریکه فێر دەبێت،
سورمه بکات، باوکت کله.
باوکت کۆڕی ناڵەی خامەی شاعیرانه،
باوکت هێزی وشەی ڕاست و زۆر جوانی نووسەرانه،
باوکت پیرێکه هیوادار؛ شەیدای تریوەی ئاسمانه!
خەونی هەیه، جەلەی نوێ و کەونی هەیه؛
باوکت کوڕی پیاوێك بوو؛ خۆزگەی گەورەی گەلی هەبوو؛
بۆیێ نووسی –
گەر ببینم سەربەخۆیی کورد و کوردستانەکەم
سەد هەزار کاوڕبەرانی مەنتکی قوربان ئەکەم
قوربانمان دا، سەربەخۆییمان ئەگەر هات، وەك باپیرەت:-
بێ ژمار حەیران و لۆلۆ و لاوکی پێ هەر دەڵێم؛
تا بمێنم بەزم و ڕەزم و ئەگلەنجه و سەیران ئەکەم
ئەو بێهێز بوو بەس نەبەزی؛
ناچار منی نارده کاروان؛ ناسیتان، کێیه باوکتان؟؟
١٩٧٤/٦/٩ – هەولێر.

## باوەڕی من

زۆر دوو دڵم، لە هەنگاونانی سەر ڕێگا؛
زۆر ڕاڕاییم، لە خەو بینینی ناو جێگا؛
من تۆقیوم، لە ڕۆیشتن بۆ لای ڕاستم، بۆ لای چەپم.
زۆر دوو دڵم، لەم تیۆرە ئەنتیکانە!
لە قەوانی ئەم هەموو مان و نەمانە!
لەم قسە بێ قەوارانە،
زۆر دوو دڵم، زۆر ڕاڕامە؛ لە هەنگاونانی سەر ڕێگا؛
زۆر دەشترسم، لە هەڵنەستانی نێو جێگا!
زۆر دوو دڵم، لە دوو دڵیم؛
لەم دوو هەوارە نارێکە،
هەر یێکە شێتی چاوێکە!!
هەر یێك ئاشنای ناوێکە!
هەر یێك خەریکی داوێکە!
دوو هەوارە! دوو بەهارە! دوو شەو و دوو ڕۆژ دیارە!
هەر لە کاتی منداڵیمدا؛
لە تاریکی شەوە زەنگدا، ترسێندراوم ،
لە بەرزی دەنگ، تۆقێندراوم!
لە پسە پس؛ لە مل بادان، لە خەوە کوتکەی سەر چۆکان،
ڕاهێندراوم!
زۆر دوو دڵم، ڕاڕاییمە، لە تیۆری ماددییەکان،
لە بوونی هەست نەکراوەکان؛
چونکە لە ناخی ناخی مێشکمدا، من باوەڕ دەکەم بە یەزدان!
١٩٧٤/١٠/٣ - گوندی تل الخيم - هەولێر.

## ١٩٧٥

### خەڵەتــان

لە ناو ماڵێك، لە ماڵەکانی کوردستان،
لە بناران، لە نساران، بە هەڵاتن و بە گریان!
سەر لێ شێواو و ماڵوێران؛
ساتمەیان دەکرد؛ دەوەستان!
لە هەندێ کەڕەت دەخنکان!
منداڵەکان! هەموو، هەموو منداڵەکان!
دەستیان لەبۆ ئاسمان دەبەن؛ تەختی ئاسمان.
هاوار دەکەن، گشت بە یێك دەنگ –
(دایکی ئێمە شیری سەگی، هەرگیز هەوێن نەکردووە!
باوکی ئێمە، هەرگیز کرنۆشی ژێردەستی، نەبردووە!)
هاوارەکان بزر دەبن، لە ناو قوڕگی باڵندەکان؛
یان دەخورێن!
پەڕاوەکان سەیر ناکرێن کە دەدڕێن!
لە ناو دەریا، تینوو دەبن تا دەخنکێن،
ئینجا پاشان، لە بیر دەکرێن.
هەر لە لاڕا،
مێژوو نووسێك پەیدا دەبێ؛
مێژووی گێلەکانی دنیا دەنووستەوە!
برینی خۆی لە بیر دەکا، نایلێستەوە،
لە دێڕێکدا، وشەییکی سەیر هەیە، دەیڵێتەوە –
(باپیرە بوو، ڕەشکی بە سەر هەموو ناوەکاندا هێنا،
چی نەهیلا!)

بەر لەو ڕستە، هیچ شت نییە،
هەر بە تەنیا دڵۆپێك خوێن وا ڕژاوە؛
لە پاش ئەو ڕستە هیچ نییە!
برینێکە، بە جێماوە، نەبەستراوە!
لە کتێبی منداڵەکان، فریشتە هەن؛ جنۆکە هەن،
شەمشەمە کوێر، بووکۆکە هەن،
ڕێگای سەخت و شەکرۆکە هەن!
جورج و مشك و تەڵۆکە هەن؛
داپیرۆچکە و تەونۆکە هەن!
قۆڵ و باسك و دوو چاوی تیژ،
چەندان دارەبازۆکە هەن!
یێك هەستیاری مردووش هەیە،
ئەوەی باوە، شاعیرەکە وا مردووە؛
منداڵەکە ئەو دیوانە جێماوەکەی بە چاوان دیت،
هاواری کرد – (نامرێ، نامرێ؛ نەمردووە.)
جەستەی هەستیار نەمردووە و هەرگیز نامرێ!
گۆرانییە خۆشەکانی گوێی پێدەدرێ، قەت ناخورێ!
چرای ڕووناکی بەردەستە،
ئاوازی خۆش، هەزاران لاوك و بەستە!
شتن؛ دەکرێ ببەخشرێ!
نانی جەژن، بە هەموو هەژاران دەدرێ؛
لە ناو چاوە تیژەکانی دنیایێکە،
پەنجەکانی دارستانن،
قەڵەمەکەی ئەو شاعیرە، قەڵەمێکە!

داستانەکان دەنووستەوە، ئازادی نابەستێتەوە!
سەربەستی وا لە سێبەرێش، ناشرێتەوە؛
سەربردەی دەخوێندرێتەوە.
منداڵەکان هاوار دەکەن -
ئا ئەوەتا هەستیارەکە، وشەی وەك باران دەبارێت!
وەکوو درەخت هەڵدەکشێت، وەکوو دەستاڕیش دەهاڕێت.
شیعر دەنگ دەلەرێنتەوە،
بە بێ چاوێلکەکەی نەنکم[1]،
شیعرەکە دەخوێندرێتەوە.
لە کاتی شایی و زەماوەند، هۆنراوە و دەگوترێتەوە.
شیعرە تێکەڵی ئارد بووە، بە بێ ئاو دەخورێتەوە.
لەگەڵ باوکان، لەگەڵ دایکان،
لە جغزی کۆڕی منداڵان، ناشرێتەوە!
دەنگی زەنگی ئازادییە، بەردەبێ و ناگیرێتەوە.
ڕژێمە سووتێنەرەکان، لادێ و زەوی تێکدەرەکان،
ڕاست و درۆ لێکدەرەکان، پەڕاوە پڕ گەردەکەیان،
ڕەحمی بە لادا ڕەت نابێ، گەورەکەیان،
هەر چەند تاریکی لای هەیە، هەمووی بێنێ،
ڕووناکی پێ داناپۆشرێ،
ڕووناکی نووکی پەنجەمە، ناشرێتەوە، نابڕێتەوە؛
ئەویش تەنیا، خەڵکەکەی خۆی، فریو دەدا،
خراپ خۆیشی دەخەڵەتێ و هیچی لە بۆ نامێنتەوە.
١٩٧٥/١/١٧- هەولێر.

---

[1] بابەتێکی خوێندنی پۆلی دووی سەرەتایی بوو.

## پێناسە

ئەم پێناسانە هی سەردەمی بەعسییەکان بوو؛ لە بەرواری نووسینەوەی دیارە!

**دادوەر:**

هەر کتومت شای شەترەنجە؛
کەسێك هەیە، لە پەناوە، دەیجوولێنێ!
سەربازێکی پاڵپشت کراو،
ئەگەر ویستی، قۆشەنی لێ دەشکێنێ!

**داد:**

داد، بە تەنیا، گۆلمێك ئاوە؛
بۆمان ناکرێ،
لە سەر نووکی تیژی دەرزی، ڕابگیرێ!

**پۆلیس:**

لە مرۆڤاتییەکەی دوور بێت،
ڕێوییێکە؛
پاسەوانی جووجەڵەکانی داد دەکات.

**گومان - لێکراو:**

گومان لێکراوان کەلاکن،
پۆلیس بە ناوی عەدالەت، دەیانگرن،
هەتا گێژ و هوڕیان دەکەن، دەیانهاڕن،
ئینجا پاشان
لە سەر مێزی
نانخواردنی
حاکمێکی دەست بە خوێندا، ڕایاندەخەن!

١٩٧٥/١/١٧ - تل الخيم.

**لە بری گەمان**

لە پای غاردان، ساتمە دەکەن و دەکەون،
جا ڕەت دەبن،
دەبنە هاوار، بەرەو حەوتەم ئاسمان دەچن!
هەر بە غاردان، دەزیڕێنن: - نا! نا! نا! نا!
ئێمە هەرگیز شیری مەمکێکی حەرامیمان نەمژتووە،
قەت دەرۆزەی نانمان لە کەس نەکردووە؛
هاوارەکان، لە قوڕگە بریندارەکان، بزر دەبن!
کتێبەکان هیچ خوێندەوارێکیان نییە،
بەرازەکان، لە ناو خۆیان، دەیان نێژن!
دەریا با هەر ئاوی زۆر بێ؛
کەسی تێنوو ڕەباس ناکات؛ بیخواتەوە دەیخنکێنێ!
لە یاد نەکەن؛
لە سەر بەرزترین لووتکەی ئەم هەورانە بنووسنەوە،
مێژووی خۆتان ڕەشکەنەوە،
جا دووبارە، بینووسنەوە،
تا خودای شەڕ بیخوێنێتەوە!
ئاخر ئەگەر نەیخوێنێتەوە،
ناترسێ؛ ناخەوێتەوە.
هەرچی مێژووی کۆنتان هەیە،
ڕەشکی بە سەردا دەڕێژێ،
هەمووتان لە هێلەگ دەدا؛ دەتانبێژی!
دەبنە کەپەك! لە بن گوفەك دەتاننێژی!

لە ناو کێڵگەیێکی چەقێن،
وەك گۆلمێك ئارد،
پەرتتان دەکات؛ دەتانڕێژی!
بەر لە مێژوو،
دنیای ئێوە هەمووی خوێن بوو،
ئێستاش سەیرە! مێژوو خوێنە!
لە پەڕاوی منداڵێکدا، وێنەی فریشتەیێك هەبوو،
تا بیناسێ، مامۆستاکەی هێلانەیێکی نارێکی،
لە تەنیشتییەوە درووست کرد ؛
شەمشەکوێرێك،
لە دووررا، دیار بوو، هات، لە ناوی بنیشێتەوە!
بووکە شووشەیێك ڕێی لێگرت!
نەیهێشت بچێت؛ بۆیێ شکا.
ڕێگای ماڵی منداڵەکان،
هەموو، نوقڵی لێ دەبارێ،
جورج و مشك و پند و کرم،
لەم ناوەدا گەلێك زۆرن؛ هاتوون، نوقڵ دەقۆزنەوە.
جاڵجاڵۆکەیێك چووە جێی، کاروباری فوق (العادة)؛
ناوی خۆی و دایکیان گۆڕی!
بۆیی بووە داپیرۆچکە! جاڵجاڵۆچکە!
هەستیارێکی تازە مردوو،
لە سەر گڵکۆیە تازەکەی خودی شاعیر،
دانیشتبوو،
کەچی سەردوولکەیێکی بە گوڕی،

لە بۆ گۆڕی کەمال ئەتاتورك دەگوت!
دارەبازەییێکیان هێنا؛
لە ئەستومبۆڵ، تەرمی شاعیریان خستە سەر،
بە چوار قۆڵی بۆ قەبرستانێکی زۆر کۆنی یۆنانیان برد.
بەڵام لەوێدا نەنێژرا!!
پاشان وێستگەی هەواڵەکان ڕایانگەیاند،
تەرمی بۆرە ئەدەب دۆستێك،
کە گۆرانی بۆ دوژمنی باوکی دەگوت،
کاتێك لە گۆرانی گوتن بوەوە،
لە بن خەرەندێکی بێ بن، خۆی دۆزیەوە؛
بۆیێ ئێستا جێیەك نییە کە تەرمەکەی لێ بنێژرێ!
دراوسێکان، جوامێر بوون،
هەموو بۆ پرسەی شاعیر چوون،
هەگبەییێکی پڕ لە شتی، نازانم چی،
بۆ خاوەن مردوویان بردبوو،
لە مزگەوتێ، کەسێك نەبوو
دیارییێکەی ئاغا و کرمانجان وەربگرێ!
دارستانە جەنجاڵەکەی،
لە نزیکی مزگەوتەکە،
ئەڕژەنگێکی لێ هاتە دەر،
ئەو جاغەکەی کە دیاری لە ناودا بوو،
هەڵگرت، بردی؛
بەڵام پرسی بە کەس نەکرد،
کەسێك نەبوو، تاکوو دەمێك،

بەرگری لە تەرمی شاعیری شەیدای کچی دوژمن، بکات!
منداڵێک لەوێ بە دەرکەوت،
دیار بوو چاوی بڕیبووە ناو هەگبەکە،
جا قیژاندی: باوە! باوە! وا ئەم دزە دیارییێکەی برد!
باوکە گوتی:
ئەوەی بردی با بۆ ئەو بێت!
ئەمە قوڕقوشمی خۆیان بوو،
بۆ شاعیری دۆڕاویان بوو.
ڕۆڵە! شاعیر دەبێ شیعر بۆ خۆی بڵێ؛
شیعرەکانی لەگەڵ باران،
لە ناو وەردان، داببارن،
لەگەڵ درەختان هەڵکشێن،
هۆنراوەکان تەزووی عیشقن،
بە ناو مێشکدا دەخشێن،
دەبنە گۆرانی و هەڵپەڕکێ،
دەنگی زەنگی ئازادیمان،
لەگەڵ شیعری شاعیرێک دێ،
نەک بۆ خەڵک،
بەس بۆ خۆی گۆرانی بڵێ!
چونکە کاتێک کە هەڵبەستێک دەبێتە فیکرێکی تازە،
لە بۆ لاوێک، بۆ ئەڤینێک،
بۆ دڵدارێک، بۆ داماوێک،
لە بناغەی ماڵە ڕمێنراوەکانی کوردان،
دەبتە چاوێک،

دەبتە پەنا بۆ کەسێکی پەناهەندە،
بە پانی سەحرا بگەڕێ،
بە ئاشکرا و دوور لە پەردە،
زوو یان درەنگ؛
گرینگ نییە، ئەمە گوڵاوێکی زەردە،
ئەڤینی تۆ چاوی منە!
قەدەری تۆ،
بە ڕێکەوتێکی سەرەڕێ، دەستی پێکرد،
بۆیێ چارەنووسی زاتت، لە باوەشم دەبڕێتەوە،
کۆتاییشت، تو خوا، گومانت لێی نەبێت،
خورپەی دڵ و دۆزەخی هەناوی منە؛
لە ناو ناچێت!
من چاوەڕێم؛
تۆش هەر بڕۆ،
چیت لە دڵی کوڵاوی منە!
قۆجە شارەکانی جیهان پێناسەکە،
نیشتمانە ئازادەکان پێناسەکە،
هەموو گەلە سەربەخۆکان، پێناسەکە؛
مەڕی کێوی، بزنی کێوی، کەری کێوی،
کەمتیار و هرس و گورگ،
دەعبا و دڕندە و دێو و مەل،
مێروو و چەقەڵ،
مار و مشك و شێر و چرگ،
ئەوی جوولە دەکا هەموو،

ئەوەی مردوو؛
ئەوەی وەکوو خۆت با بردوو؛
هەموو، هەمووی، پێناسەکە،
قەناعەتکە، نییە وەك من،
دوا نازناوێك هەڵگرێ؛
پێی قایل بێ!
بێگومان بە،
ناو تەنیا هەر ناوی منە!
چاوەڕێتم، تا دێیتەوە،
کە هاتییەوە،
دنیات ڕووناك دەبێتەوە؛
جا تێدەگەی؛
خۆشیت، نان و ئاوی منە،
گوڵاو هەر گوڵاوی منە!

١٩٧٥/١/١٧ - تل الخيم / گوێر/ هەولێر
سعات ١٢ی شەو تەواو بوو.

**گێلە پیاوێك**

هات پەڕاوی بێ گەردمان بشێوێنێ،
تاریکی شەوی هێنا بوو، گەرەکی بوو،
دوا زەردایی خۆری ڕۆژێکمان لێ بمرێنێ،
بێژینگێکی بیری کۆنی هەڵگرتبوو،
تاکوو ڕستەییێکی ناهەق لە ناو مێژوو بسەپێنێ،
خاوەنی درۆ و دەڵەسە،
تەنیا هەر خۆی فریو دەدا؛ کەسی دی ناخەڵەتێنێ!

١٩٧٥/١/١٨ - تل الخيم - هەولێر.

**لای لایە**

تۆم خۆشدەوێ؛ ئاخر دڵم زۆر تۆی دەوێ!
وەك پەروانەی شەوی تاریك،
شەیدای چرای ڕوخسارتم،
بە ئومێدی دیدارتم.
تۆ تێکەڵی دڵ و خوێنی،
لە ناو مێشکم، ڕەگ و ڕیشت داکوتاوە!
گەشە بکە، نامەوێ قەت دەرت بێنم؛
هەتا کەللــەی سەرم ماوە!
ئارەزوومە هەموو ژینم لەگەڵ تۆ بێ،
خۆت ساباتی؛ سێبەر لە سەحرای دڵ دەکەی،
خۆت ڕووباری؛ هەزار ئومێد بە گوڵ دەدەی!
١٩٧٥/١/١٩ - تل الخیم - هەولێر.

## سەفەر

منداڵانی کوردی هەژار،
وەرن با سەفەرێك بکەین، هەر بە خەیاڵ!
بڕۆین بۆ خاکی ڕەشەکان، ئەفریقیای دڵگەشەکان،
بچین تا خاکیان بناسین، بزانین چۆنە وڵاتیان!
ئەرێ توخوا، دەبێ چۆن بێ، هەموو ڕوخسارەکەت ڕەش بێ؟
خۆ ئێمەی کورد لەم وڵاتە، لە عارەبان سپی ترین،
گەلەك ڕاست و خۆش مەعشەرین.
وەك گەلانی قاڕەی ڕەشیش،
شەیدای ئازادی و سەروەرین،
هێشتا لێرە هەر لە پایەی دووەمینین؛
بێ رەهبەرین!

٢٢/١٠/١٩٧٥ - هەولێر.

**بۆ خۆم**

بگری، بگری، تا هەردووك دیدەت کوێر دەبن،
دەنگتان بێت؛ با گریان بێت،
تا بە وجود لە ناو نەچن،
برادەران، گەر نەگریێن، نەڵێن هاوار بۆ کێ بەرین؟
ئێمە هەموو نەناسراوین،
قەرەج ئاسا، دەربەدەرین!
لە ناو وڵاتی خۆمانین، بەڵام هێشتا هەر ئاوارە و سەودا سەرین،
سووك کراوین، ناو سڕاوین،
ڕاستە دەژین؛ بەڵام بێ سەنگ!
بێ ناو، بەبێ قەڵەم، بێ ڕەنگ!
بێ ڕابردوو، بە بێ ئاوات و بێ مراز؛ کپ و بێ دەنگ!
زۆر حەز دەکەم، هاوار بکەین! بڵێین سووتاین! هاوار لێمان!
هەزاران هاوار بۆ خۆمان!
چی بکەین باشە؛ خزمان، نەماین!
خودی خۆمان، دەبا هەر خۆمان ببینین!
ئێمە هەموو وەرەمدارین، بە جەستە هەموو نەساغین!
پێشی نەمان، چارەسەرێك، بڕەخسینن!
زمان بڕا، قاچمان شکا، لەوحەی گەورەی ناوی باوکمان، ئەوا دڕا!
ئەوەی ماوین، گومانێکە، گومان دەکەم کە مێشکمان پڕ باوەڕ بێ!
گومان دەکەم کە وا ڕۆژێك نیهاد بمرێ یان بکوژرێ،
ئەم نیهادە هەر دەمێنێ، دەمانژیێنێ؛
بە خۆی دەژی تا ئەو ڕۆژی (بەعسی) لەم ناوە نامێنێ.

١٩٧٥/٩/٢٥ - هەولێر.

**بۆ کوردستان**

وا کاروانە، لە سەر ڕێیە،
کاروانی کوردی بێبەشە،
لە سەر سەری قافڵەچیان،
تۆز و بایە؛ هەوری ڕەشە،
لە دواوەیان گورگی برسی،
ڕایدەماڵێ بەرەو قیبلەی، گۆڕستانە!
لە سەر ڕێشیان،
پەتی سێدارە و زیندانە!
**

کوردستانە،
دۆڵی، هەردی، شاخی، بەردی،
ئەم وڵاتە، دەشت و دەری، کێڵگە و وەردی،
گوڵستانە.
**

کوردستانە؛ گەنجی تەرزە،
بیری پڕ حیکمەت و بەرزە،
ژنی ناسك وەك قەنەوزە،
بۆ ژیان، لە مردن دانە؛
**

ئاخر ئێرە وەك نیشتمانی کەس نییە،
کەس وەك ئێرە، ژێر دەس نییە!
چارەنووسی ئێرە چییە؟ هەر بەرزییە،
کوردستانمان خۆی ئاسمانە.

**

له ڕاهی ئەم کوردستانە،
خەباتێکی بێ وچانە!
له حوزنی قووڵی چاوی یار، له خڕخاڵی بەلەکی خڕ،
تپل باریك، ناسك، دڵبڕ، بازنی دەورەی قامکێکی پڕ،
گەلۆ! چبکەین؟ لە جێ ژوانمان، خوێن بارانە.
بۆ ئازادی ئەم وڵاتە، سەرتاپای خاکە دەسووتێ؛
گوندەکانمان خاپوور دەکرێ؛
سەر و ماڵ بە تاڵان دەبرێ؛ ئابڕوو دەچێ، لاو دەکوژرێ؛
ئاخر لەم سەدەی بیستە،
لە لای یەکگرتووی ئومەمە، ئازادی کورد موحەڕەمە!!
لەگەڵ ئەمەشدا هەر دەڕوا، قەت ناوەستێ ئەم کاروانە!
کاروانی خەباتی گەلە، بۆ ئازادی؛ ئەمڕۆ هەلە،
ئازادیش قوربانی دەوێ، ژن بەند دەبێ،
هەستیاری کورد لە خاچ دەدرێ،
لە دەشت و دەر، هاوار هەر دێ؛
با کەس نەبێ، بێتە هاواری کوردی مەرد،
بەڵام هێشتا، کوڕی نەبەرد،
باوەڕت بێ؛ هەڵبەست و هەست،
هیوا و مەبەست، عاشق و مەست،
هەموو وێکڕا فیدای خاکی کوردستانە؛
ڕاناوەستێ ئەم کاروانە؛
دژی ویستی ئینگلیزانە.

١٩٧٥/١٠/٢١ - تل الخيم - هەولێر.

**پێشەوا**

ڕێی بە تەنیا، دەداتەوە کێڵگەی ئاسن!
نەشارەزا، مەڕۆ شەوێ،
کوردە، شەوڕۆی پاشی شۆڕش، زانای دەوێ!
گەڕیدەی شەو بێچارەیە، هانای دەوێ!
وەرە، مەرد بە، لێی دەرمەچۆ؛
کوردستان بێی تۆ ناخەوێ!
هەموو گەلی کورد هی تۆیە؛ تۆیان دەوێ!
بڵێ، چییە؟
جگە لە کورد، کەسێکی دی، مافی لەم خاکەدا نییە!
هەر لە شیڤێ، لە هەندرێن،
لە بازیانی دوژمن بەزێن،
دەشتی هەولێر؛ بیابانی توزخورماتوو،
تا دەگاتە خانەقین و چیای شەنگاڵ؛ سلێمانی،
کەرکوك، کەلار، پردێ، مەخمور؛ ئەوەی هەیە ئاوەدانی،
هەموو هەر خاکی کوردانی؛
سنووری چی! ئەم وڵاتە هەر هی خۆمە،
ئەوەی غەیری ئەمە بڵێ، یان قەرەجە، یاخود دۆمە!
ئەی پێشەوا! برا گەورە!
من دەزانم مۆرانەمان لە ناو زۆرە،
هەندێك جاشە، هەندێك بەعسی مشەخۆرە!
بەڵام لەوەش دڵنیامە، ئەم وڵاتە خۆڕاگرە،
گەشاوەیە، نەك بیابانێکی بۆرە!
کوردستانم پاسپۆرتێکە دەتژیێنێ،

وەکوو بێشکە و دەستی دایکت، دەتهەژێنێ،
زۆر پڕ ڕەحمە، دەتخەوێنێ،
دایك و زمان؛ خاك و ئاوات،
هەموو وێکڕا، دەبنە مۆمێك لە شەوەزەنگ،
دەبنە ئەتۆم، لە کاتی جەنگ،
سەد پایزی چاوەڕوانی، کۆتا دێنن،
هەزار کۆرپەی کامەرانی، دەخولقێنن،
ئیتر هەرگیز ناتوەستێنن،
پەتی سێدارە دەپسێنن!
بگەڕێوە!
ئینجا بە دوای زمان دەچین،
بە دوای کتێب، عەودالْ دەبین؛
لێرە و دووا، قەل نامێنن؛ تا بقرن!
دەو دادڕاو، بەندی زێڕە،
لەم کوردستانە نامێنن، مەبەستی کورد بزرێنن!
لە پاشەڕۆژ، گوللـــە نیهاد وشیار دەکات،
گوللـــە لە ماف پرسیار دەکات،
پێشەوای خیانەت لێکراو!
تفەنگی دەستی پێشمەرگە،
کوردستانمان ڕزگار دەکات!
گۆپاڵەکەت،
وەکوو گۆچانەکەی مووسا، دەشێت دەریا لێك کاتەوە؛
پاڕانەوەت،
وەکوو پاڕانەوەی عیسا، مردوو زیندوو دەکاتەوە،

وەکوو زەردەشت، (هۆرا) دەناسێنێتەوە؛
وەکوو پێشەوا (محمد)، قورئان دیسان دەڵێتەوە؛
باش سەیریکەن؛ شەیتانەکان دەسڕێتەوە!
هزری پاك و خاوێنی من، بە کەس شێلوێ نابێتەوە!
لە دەست خۆتە، بە دەست خۆتە،
مەگەر هەر کورد بیباتەوە!
زۆر وریابە! سەربردەی کورد بە مۆرانە نابڕێتەوە!
بە سیسرکە ناسڕێتەوە! بە مردووان ناشرێتەوە!
سەرۆك!
چیتر دوژمنەکان،
لە گۆڕستانی نەبووەکان،
هەرگیز، نادەن گۆڕەشارمان!
لە ناو شاران،
شاری دژی مەسئوولە بێ دەرپێیەکان،
ئیتر ترس، کەس ناکوژێت،
شمشێری دەستی نامەردان،
وا کولبووە؛ سەرنابڕێت!
خەڵك دەژی، مێژوو خۆی و کفنی ڕەشی،
لە ناو کەندی کۆنی گڵکەند بزر دەبێ،
لە ناو دەچێت!
دەی، بارزانی، ئامادە بە؛ تۆش وەرەوە، ڕێبەرمان بە،
کە تۆ هەبێ، کورد هەر دەبێ؛
جا مەحاڵە بە مۆرانە، گەلەکەی تۆ، لە ناو بچی.
١٩٧٥/١٠/٢٢ – تل الخیم - هەولێر.

**١٩٧٦**

## هەڵبەستی خۆشەویستی

ئەگەر هەموو خەڵکی جیهان
دەست کەنە شەڕ،
ئەگەر ئەگەر،
گەورە بچووك، سەر ببڕێ،
هێزدار بێ هێز، بگلێنێ،
خوێن لە شەقام،
کانی ئاسا، هەڵبقوڵێ،

ئەوکات بۆتان،
بە پێچەوانەی هەموویان؛

هەڵبەستێکی
خۆشەویستی
دەنووسمەوە.

١٩٧٦/٨/١٤ - هەولێر.

**خودا هاوار**

خودا هاوار؛ ژیان بە خۆشی بێت تا سەر[١]،

بۆ خۆت نەبی، بۆ کەسی دی، شۆڕنەکەین سەر[٢]،

حەق لە لامان گەورە بێت و ڕابگیرێت هەر لە سەر سەر[٣]،

لەگەڵ هاوڕێ و خزمەکانمان، بە خۆشەویستی بچێتە سەر[٤]،

خودا هاوار! باوەڕمان پێت بتەوتر بێت، ورە بەرز بین هەتا سەر.

١٩٧٦/١٢/٢٠ - هەولێر.

---

[١] سەر = النهایە

[٢] سەر = الرأس

[٣] سەر = أعلی

[٤] سەر = تنقضي

**مێژووی مردنی ئەستێرەکان**

لە ناو تووکی قازەکانی ناو سەرینی بێ هەستەکان،
دەمپشکنی؛
گەردەلوولی مەهابادم دادەگیرساند،
کە سەرچۆپی ڕەشبەڵەکی سوڵتان عەوڵا درا دەستم،
تۆزی ژێر پێم لە قەرەداخ،
بەرەو چیای شنگاڵ دەچوو!
بێ قەزابن! ئەلحەدی زاو و زێی ژیان،
ڕووە و کوورەی باوە گوڕگوڕ
ئاوا دەبوو!
شێرپەنجەی دڵ، مووەی مێشك،
گەشکەی منداڵێکی ساوا،
تەرمی بووکێکی بێ زاوا،
تاڤی نیوەڕۆی مانگی ئاب،
سووتاندمیان، ئاخر دڵیان کردە کەباب.
زەردەخەنەی گریانی گەڵا گوێزەکان،
وەرەرمی بەڕووە تازەکان،
کۆترەباریکەی دەریای وان،
باسکە مەلەی پڵنگی ڕووباری ئاراس،
کوتەی دڵیان،
ناردرایە عارەبستان!

١٩٧٦/٨/٢٢ – هەولێر.

دوای پیلانەکەی ئەلجەزایر پێشمەرگە گەڕاوەکان ڕەوانەی باشووری ئێراقێ کران.

**چوار وەرزی ساڵ**

کە زستان دێ،
کوردستانمان دەبتە باران،
دەبتە بەفر، دەبتە زریان،
لە شەرمی سەهۆڵبەندانا،
شاخ سەرپۆشی سپی خاوێن دەخاتە سەر،
هەر چیایێکی ئێرانە دەبتە پەیکەرێکی گەوهەر،
کەو لە سەرمان و لە برسان،
پەنایان دێننە بەر ئینسان،
بزنە کێوی، لە قەد پاڵی شاخی بەرز، دادەبەزێ و دێتە نەوی،
ڕاوچیش بە فێڵ خۆی بۆ دەخاتە ناو بۆسە؛
ڕاو هەر چی بێت گرینگ نییە،
هرسە، ئاسکە، کەوە یان بزنە کێوییە!
ڕاوی دەکەن دەیبەنەوە،
بەس، بێ ویژدان ڕاویان مەکەن! ڕەگەزیان قەت نەبڕنەوە؛
خۆ ئەوانیش وەکوو ئێمە، هاووڵاتی ئەم وڵاتەن!
* * *
کە بەهار هات، کوردستانمان دەژیێتەوە!
لە هەر لایێك خوڕەی ئاوە، قاسپەی کەوە،
دەنگی نەرمی کوکوختییە؛
کوردی ماندوو گوێی لێ بگرە؛ لێی پاڵدەوە!
منداڵانیش بە گۆرانی، بەرەو بەهار و سەیرانی،
بۆ دەوری گوند هەڵدەکشێن، بەستە بۆ وڵاتیان دەڵێن،
بە کۆمەڵ دەچنە پیفۆکان؛

کچۆڵە شۆخ و جوانەکان، شەنگتر لە مێرگی بەهاران،
هەزار ڕەنگن، دەچن لە بۆ کەنگر کردن،
مامۆستا و قوتابییێکانیش، لە سەیرانن بە دڵی خۆش،
یاری تا ئێوارێ دەکرێ، پەلیك یان کێلەبەردانێ،
یان قاشوانێ، یان غاردانێ!
دیمەنێکە هەموو هەستێك دەبزوێنێ، ڕکی دەریاش دادەمرێنێ،
مەڵبەندێکە، دنیا هەموو دەسازێنێ، هەستی پیرۆزیت دێنێ،
ئاوا ئینسان دەشواتەوە،
ئاوا پاکی دەکاتەوە،
دیمەنێکی تازە دەدا، مرۆڤ لە خۆشیا مەست دەبێ،
وەکوو ئاسمان، سەربەست دەبێ!
* * *
هاوینانیش دەشتی هەولێر،
گەردەلوولی پڕی لە خێر،
دێت و پێیدا تێدەپەڕێ، گەڵای لاواز دەوەرێنی،
دڕکە زەردە لە ڕێگەی کاروان لادەدا،
جووتیارانیش، چ زۆر چ کەم؛
خەرمانیان بۆ دێتە بەرهەم،
هاوینی ئێرە، پڕ بێرە، ماست و پەنیر و شیر زۆرە!
* * *
پایزی کوردستان زۆر خۆشە، خاکی وڵاتمان خامۆشە،
تا دەیبینی هەمووی زەردە، قەشەنگ و مات و سەرخۆشە.
لاوی کوردیش پڕ لە جۆشە، وای کوردستان چەندە خۆشە!!!
١٩٧٦/٨/٢٢ - هەولێر.

## کوردم

ووتوویانە، هەر بمێنی لەم ژیانە،
هەتا دەستهاڕ، دەهاڕێت و بەرهەمی دەچتە سەر شانە،
مرۆڤینە، ئەی برادەر و خزمینە، من بەرپرسم لەم قسانە!
هەر دەمێنین،
ئەندامانی بەعسی عەرەب هەموومان لێ کۆبنەوە و بمانکوژن،
ئێمە نامرین، چونکە کوردین، ناچار، دەژین!
نامە گۆچانی ئەنکڵ سام!
نامە بەندەی شا ئیسماعیلی سەفەوی!
نامە یوزباشی عوسمانی،
ئەتاتورکیش چی من نییە، با بخەوی!
ئامادە نیم، لە ناو حەوزی بادەی ڕەشید،
لەگەڵ جارییە جوانەکان،
مەلە بکەم هەتاکوو دڵم بسرەوی!
باش بمناسن؛ من خۆم کوردم!
خاوەن هەستێکی ناسك و زۆر نەبەردم!
ئاواتم هەس،
لە کوردستان سەربەست ببم! ئازاد بژیم!
خاوەن گەلێکی ڕەشید و وڵاتێکی بەرین و پان،
سەروەتێکی تێرایی خۆم، گەلێك جوان،
ئامادەشین، کوردستانمان بپارێزین،
تا ئەو دەمی سەربەخۆیە،
بە کوێرایی چاوی بەدی دوژمن، هەر دەمێنین.

١٩٧٦/٩/٦ - هەولێر.

## بەڵێ باوە

بەڵێ، باوە؛ کە لە بەر چاو تێدەپەڕێ
بە تیچاوی وەك خەنجەرێ، لە عەقڵم دەباتە دەرێ!
بەڵێ بابە؛ لە ڕاهی خوا چارەسەرێ!
شوورەییيە ئەگەر نەڵێم، دڵم عەشقێکی تێدابێ!
شوورە نەبێ، دەبێ ڕووحم بۆی سووتابێ!
شەرم نەبێ، دەبێ بیڵێم - عیشقێك لە مێشکم چەسپابێ!
بڵێ بابە، لە ڕاهی خوا، چارەسەرێ!
ئەری باوە، هەر دەمهەوێ، هەر دەمهەوێ!
چاوم دوور لەو، ناچتە خەوێ!
دڵی هەژارم ناسرەوێ، لە ناو سێنەمدا ناخەوێ!
بڵێ بابە، لە ڕاهی خوا، چارەسەرێ!
بەڵێ باوە! لە ناو پەڕی کتێبەکەمدا دەیبێنم!
کە هەتاو بێت، ئەویش نەبێت، من سێبەرەکەی دەدوێنم!
بەخوا باوە، لە ناو نوێژ، لەگەڵ فاتیحە دەیخوێنم!
بڵێ بابە، تو پێغەمبەر، چارەسەرێ!
بەڵێ باوە، دەینووسمەوە لە سەر پەڕە سپییەکانی ناو دەفتەرم،
ڕاستی دەڵێم، بۆ ئەو شۆخە، لە ناو مێشکم، دەربەدەرم!
بابە، خێرا، بیخوازە بۆم،
لە دووری ئەو، سەودا سەرم!
لە ڕاهی خودا و پێغەمبەر، چارەسەرێ.

١٩٧٦/١٢/٧ - گوندی تل الخیم - هەولێر.

هزرەکەی لە گۆرانی (بابە بابە بۆ وەتکەی) وەرگیراوە.

## ١٩٧٧

### سۆز و وەرچەرخانەوە

ئەم هاوارەم بۆ پێشەوا بارزانی نارد.

دەڵێی مەیلەکەی گەڕانەوەیە، وەریچەرخاندووی؟
فرمێسکی ئاڵی لە چاو پژاندووی؟
گوڵی سەربەستی دڵی ڕفاندووی؟
ملت داوتە ڕێ؛ بێ ترس و لەرز، تانك و فڕۆکە ورەی نەڕماندووی!
بۆ کوێ وا دەڕۆی، لێوت بە خەندە؟
ڕێگاکەت دوورە و ئێرە خۆی بەندە!
بڕۆ، بۆی دەرچە، بڕۆ ڕێکەوە، کاروانچی هەندە!
بڵێ بە شیرین[1]، ئەگەر تووشی بووی، بلا بێتەوە!
بە لەیلا[2] بڵێ – ئەژنۆی نەلەرزی،
پەنجەی نەتەزی، ئاسوودە بنوێ، دلێر[3] نەبەزی!
بڵێن بە شیرین – چاومان لە ڕێیە،
ئەو لە هەر کوێ بێ، دڵمان لەوێیە!
پێی بڵێن، توخوا – شەوانی گریان هیوا دەهاڕێ،
هێزمان باراشە، نابرێتە لاڕێ.
گەورە، پێشەوا، زووکە وەرەوە، بێی تۆی شارەزا، ڕێ نابڕێتەوە!
کێ دەگاتە لای خودی بارزانی،
پێی ڕابگەینی، تا باش بزانی، لە پێشوازینە، دەروێشەکانی!
هەر ئامادەنە، (پێمیمەکانی)؛ ئارام ناگرن، لە چاوەڕوانی!
کە دەستیت ماچ کرد بڵێ بە سەروەر –

---

[1] مەبەست پێشەوا مەلا مستەفا بارزانییە.
[2] مەبەست شەهید لەیلا قاسمە.
[3] مەبەست شەهید جعفر دلێرە.

دەربەندی بازیان هەر ئاوەدانە،
شێخی هەر لێیە، پڕ قارەمانە.
سەرۆك هاوارە!! لە دووریت خانزاد[1]، میرە ناسکەکەم، دڵ بریندارە!
ئێستاش چاوەڕێی هاتنەوەی تۆیە، لە ئینتزارە!
هەر بە تەمایە، بگەڕێیەوە، بێی و ئومێدی جاران بێنیەوە!
هەر وەکوو پێشان،
گوڵێکی سووری خاکی کوردستان،
بێنە بۆ هەمووان!
خەبەرت لێبێ - گەورە، بارزانی - وا چەوساوەکان، وا دڵدارەکان،
لە ماڵ بە دەرن، هاتوونە سەیران،
لە هەر هەنگاوێ هەزار ئومێدە،
لە دوای هەر شەوێك، ڕوونە سپێدە؛
ئەمڕۆ ڕێگامان ڕاستە بە تاڵە،
لمە، قومە، زیخە، ڕیخە، لێڵە، کاڵە،
کەژاوە ڕەشە، زاوا شەهیدە، بووك بەرگی سوورە،
ئەسپ ماندووە، زین بزمار ڕێژە، قۆناغیش دوورە،
دیدە تەم و مژ، هەناسە گڕە، خواردن زەرەندە،
پێکەنین ساردە، گاڵتە مردنە، هەڵپەڕکێ دەردە،
جارێك سەرانگێو، دە جار خەڵەتاو، ئەمجارە ئاوات، لادەدا پەردە،
شەومان ئاوسە! ئاسۆ ڕووناکە، دەریا شەپۆلە،
قسەمان تیغە، وڵاتمان چیغە، زەنگمان دەهۆڵە،
ڕێگامان با هەر کێو و تەلان بێ، قۆناغمان چۆڵە!
ڕەشەبا، با بێ، تەرزە بباریێ، تەلار بڕووخێ، داس بێتە خوارێ،

---

[1] خانزادی میری سۆران.

برووسك و باسك، تۆز و با هەڵکا، ئەم ڕێگە دەبڕین، وەرزی بەهاریێ!
سەرداری نەبەرد ، مەلای کوردستان -
فەقێیەکانت، فەتوایان داوە،
لە هەموو لایێك قسە واباوە،
شیری دێڵە سەگ، کابانی ئێمە هێوێنی ناکا،
شازادەی جنان عاشقی ئێمە، دڵی پێ نادا.
ئەو دەروازەیەی تۆ خۆت داتمەزراند،
بەرزوو واڵایە،
کەس پێی ناگیرێ، کاروان سەرایە،
گۆشتی بۆگەنی حوشتری مردار،
پێمان ناخورێ، ناخورێ، وایە!
دەی شیرین؛ وەرە -
وا چەوساوەکان، دەسووتێن دەمرن، کۆت دەپسێنن،
خەبەرت لێبێ، دڵ فەراهەم بە، گەنم دەڕوێنن.
ئاخر خەمی تۆ، شی ناکرێتەوە!
گوێت لێم بێ شیرین -
وا ئاوارەکان، دوور خراوەکان،
هەموویان چران، گشت داگیرساون،
نە کەسیان دیلە، نە هیچ داماون،
سەرۆك مزگێنی، لە خاکی بارزان، حیلەی ئەسپەکان، لە سەر کێوەکان،
دەگاتە ئاسمان، دەزرینگێتەوە، وەك دەنگی یەزدان،
و......ە......ك د......ە......ن......گ......ی یەزدان.
پوخت دەنگی یەزدان!

١٩٧٧/١/٤ - هەولێر.

**سنوور بەزێن**

بۆ حەزرەتی لەیلا قاسم، قاشی تاجی ئازادی کورد.

لەیلا خانم، هیچ دوورییەك وەك جودایی تۆ، نەبووە!
لە دووری تۆ، باوەگوڕگوڕ وا دەسوتێ، دەسووتێ، گڕی گرتووە،
زەمان، جۆرە ئازارێکە، نابڕێتەوە، قەت کۆتایی نەهاتووە،
لە دووری تۆ پێکەنینمان، بۆتە چەقۆ، لێو دەبڕێ،
هەناسەشمان وا بۆتە تیر، سینگی ورد و درشت دەدڕێ،
لە سەر کەلاوەی یادداشتمان، قەلێك دەقڕێ!
لەیلای کوردان!
سەفەری بێ ئیجازەی تۆ، سەبر و ئارامی هەڵگرتین،
ئاسمان بۆتە ئەشکەوتی خەم،
شەو ڕەوەندە، ژیان، ستەم،
لە دووری تۆ - ئێشمان زۆرە، خۆشیمان کەم، لەیلا! گوڵە ئەسیرەکەم،
هەموو سنوورێکت بەزاند، خۆت نەبەزی،
چۆن هەلهەلەت بۆ لێنەدەم،
ئاخر لەیلا، گوڵە گەشەکەی خانەقین،
پەتی قەنارەکەت هەژاند؛ کەچی ئەژنۆکەت نەلەرزی!
هەموو سنوورێکت بەزاند! بەڵام، تۆ خۆت، قەت نەبەزی!
لە زۆنگاوی ترسی مردن سلت نەکرد،
پەتی سێدارەکەی سەدام هاتە ملت، بەرانبەرت، ملی کەچ کرد!
ئەتۆش ئەی کچی پڕ باوەڕ،
کڕنۆشت بۆ دوژمن نەبرد.

١٩٧٧/١/٧ - تل الخیم - هەولێر.

**فریشتەی خەم**

زۆر ئەستەمە، فریشتەی خەم!
هاتووەتە لام، بووەتە پەرکەم!
زمانی لێ پەل کردوومە،
وەکوو ئاشێکی بێ ئاوە، دەخولێتەوە، بەڵام کەم - کەم!
وزەی مێشکم دەسووتێنێ،
برووسکەی ڕێواسەی خۆشیم، دەپچڕێنێ؛
بووەتە ستەم!
لەم زستانە بێ بارانە،
ڕۆژانێکی بێ ژیانە،
پاشکۆی گەرمای هاوینەیە، کەوتە بن تەم!
زۆر بە بێ تام،
ڕەزا قوڕس، پیس و بەسام!
وا لەم شەوە، هاتووەتە لام؛
سوپاییێکی ترسنۆکی، شەڕفرۆشی، بەر فەرمانە و منیش تەنیام.
پێی ناوەستم، بەڵام هەر هەم!
بێ هەڤاڵم، بێ هاوسەرم، بێ هاوخەمم،
بەڵام خاوەن زمانێکم، خاوەن نان و خەرمانێکم، خاوەن قەڵەم!
نەشتەری تیژی هەڵبەستم،
مەگەر بکا، ڕزگارم کا؛ ڕێگە نەدا، بچتە بەر کەم،
نەشتەری تیژی هەڵبەستم،
لە سێدارەی سپی و جوانی وشەی هۆنراوەی دەبەستم،
زیندوومکەوە، تا قووتیدەم، فریشتەی خەم.
١٩٧٧/١/٧ - گوندی تل الخیم – هەولێر.

**ئاوات**

هاتە دەرێ!

زەینم دایێ؛ شۆڕەسوار بوو!

چواردە سەدە چاوەنوار بوو!

قەشەنگ، شاباز؛ نەبەز، بە ناز؛

باڵا بڵند؛ زۆر جوان بوو!

- ناوت چییە؟

- ................

- خەڵکی کام لای؟

- هی ئەم ناوە.

- باوکت کێ بوو؟ باوکت چ بوو؟

- نوژدارێك بوو؛ خۆی نەخۆش بوو!

ئەگەر قسەی ڕاستت دەوێ، باوکم نەبوو!

- ئەی باوکی کێی؟

- بۆچ دەپرسی؟ باوکی خۆمم!

دەستی دایە گۆپاڵەکەی ویستی بڕوا!

- نا،نا! مەڕۆ! نەڕۆی، نەڕۆی! بۆ کوێ دەچی؟

دەستێکی بۆ ئاسمانێ برد.

- نا،نا! نەڕۆی!

ئاوی پاکی خواردنەوە، لەو گەڕەکی پەیدا نابێ!

ئەوێ ڕێی هاتوونەهاتە،

دەداتەوە کێڵگەی ئاسن؛ کۆتای نییە کۆتا نابێ!

- من گەڕۆکم؛ وێڵی ئاوی حەیاتێمە!

گەڕۆك، بێکار، بێ دەسەڵات،

بێ دەنگ، بێ ڕەنگ، هەر هاتە هات!

- هەڵمێ، مەڕۆ، ئەم زمانەی شەکرە سێوت،

پاسپۆرتێکە، خەندە لێوت،

دەنگ هەڵبڕە، سنووری چی؟

نیشتمان با هەر پارچە بێ، بەڵام هەموو، کوردستانە،

جێی پێشمەرگەی قارەمانە،

دەنگی زەنگی بێ پسانە،

هی ئینسانە، لە بیر نەکەی، نیشتمانم کوردستانە.

هەر یێك دەگرێ،

سنووری دەستی دوژمنان، ڕۆژێك دەپسێ.

هەر لە هەولێر تا سلێمانی، تا مەندەلی، تا خانەقین،

تا کەرکووکی باوەگوڕگوڕ، تاکو شەنگاڵ؛ سڵاو دەکەن لە یێك سەردار،

لە ئامەد و ماردین و وان،

سابڵاخ، ورمێ تا کرماشان،

لە ئاراس ڕا، تا دەگاتە کێوی حەمرین،

سنە، غازی ئەنتاب، عەفرین،

پێناسەمان یێك مۆر دەبێ،

چاومان بۆ یێك ئاڵا دەچێ،

- ڕاوەستە، دەی! بئاخێوە! بەم زمانە شەکرە سێوە،

بچریکێنە، هەر خۆی لێوە!

دەی! بە کوردی بئاخێوە،

بە کوردی ناوت بنووسە،

ناوی کوردی بۆ منداڵت هەڵبژێرە،

بە زمانێکی کوردی ڕەوان،
سەد پایزی چاوەڕوانی، کۆتا دێنی؛
هەزار کۆرپەی کامەرانی، دەخولقێنێ!
**
نەڕۆی! نەڕۆی! کوردە، نەڕۆی!
نەکەی، قەت مەیدان چۆل نەکەی!
هەرگیز نەکەی، قەت کۆڵ نەدەی!
وەرە بە دووای تەرمی لاوێنیت بگەڕێ،
بۆرژان بەسە! خەوتن بەسە،
وەڵامی بانگی خۆت دەوە، دەهەستەوە!
گەر هەڵنەستی؛ کەوڵت دەکەن،
خوێنت دەمژن، تەرمت دەبەن،
هەستە بێژە، با حەیران بێ،
دەی دەنگت بێ؛ با گریان بێ!
تۆ نەبێژی، ئەو دەتنێژی.
دەنگوباسی ئەم ڕۆژهەڵاتەی ناوەڕاست، بزانە چییە!
خەبەر وایە کە دەریاچەی تەبەرییەش، هیشك بییە!
گوێم لێدەبوو کە دەیانگوت، بنی نییە!
**
لە ئایندە، لەم مەڵبەندە،
کانی برین هەڵدەقوڵێ، ڕووباری خوێن، شەپۆل دەدا!
لەم وڵاتە، بە بێ ژمار، خەڵك دەمرن؛ گوللـــە نیهاد وشیار دەکا،
خەڵك لێرە، کەڕ دەبن، کوێر،
ئەو دوژمنەی کە تۆ هەتە، بەس بۆ گوللـــە کڕنۆش دەبا!

گوللـــه لە ماف پرسیار دەکا،
گوللـــە مرۆڤ ڕزگار دەکا.
شیعری منیش،
هەزار نەفرەت لە گوللـــە و گوللـــەدار دەکا.
دەشێ ئێمە، جۆم لە ڕووبار بکەینەوە؛
دەشێ چیا دەگەڵ چیا، بەردەینەوە،
بەم شیعرانە، پێمان دەکرێ، مردووان زیندوو کەینەوە!
هێزی مێشکی منی هەستیار، بە پشتیوانی تۆی هەژار،
دڵی کوردان دەژیێنتەوە!
دێتەوە بەر دەستی خۆمان، مەحاڵە ناچەوسێینەوە،
ژەنگ ناگرین؛ نەڕزیوین، ناڕزێینەوە،
ستەمکاران لە ناو دەبەین،
بۆ خۆشمان، دەگەشێینەوە،
هی خۆمە خۆم؛ نەك هی دوژمن،
کوردە، جا دەحەسێینەوە!
**
مردووەکان،
لە گۆڕستانی دوژمنان، چیتر گۆڕەشار نادرێن،
لە شارەکان، چیتر ترس نامانکوژێ،
لاوەکانمان، سەر نابڕێن.
مرۆی خاوەن دەنگی بەرز،
سەد مەحاڵە، لە ناو ناچن، لە ناو نابرێن!
مێژوو خۆی و کفنی ڕەشی،
لە ناو چاڵی، گڵی مەنارەی مزگەوتان،

دەفن دەکرێن.
هۆ پیرەمێرد!
من دەتناسم، تۆ پسپۆری دەردی منی!
بە ساقەت بم!
چونکە تۆ ڕەنگ زەردی منی!
ئاوڕ دەوە! بمناسەوە!
وەرە، وەرە، با پێکەوە،
زەینێکی نەخشە دەینەوە،
با هەر گوندێك دەرگای هەبێت، بیکەینەوە،
با شارەکان ڕێکخەینەوە،
ئینجا گرەو دەبەینەوە.
ترس لە هیچ شوێنێك نابێ؛
کەس لە ڕێگا، بزر نابێ،
ڕاستە، دانای ئەم سەردەمە!
ژیان بووە، مردن بووە،
ڕۆژیش بووە، شەویش بووە،
دوژمن بووە، دۆستیش بووە،
هێسك، باوەڕ، خوێن، سێدارە،
ستەم و داد و ئازادی،
ئەمیش بووە و ئەویش بووە.
بۆیێ، حەکیم!
لە ئاکامی بێ ئاکامی،
کوردستان سەربەخۆ بووە.

١٩٧٧/١/٩ - هەولێر.

## پیره بەڕوو

پیره بەڕوو!
لە نزمترین دامێنت، هەر چرۆییێك، با سەر دەركا؛
ئاخر گەڵا و لق و پۆپت وا وشك بوون،
هەر چرۆییێك، لە بۆ سێبەر، پشكۆ بدا.
كوڕەكانم، لە نێو خۆیانەوە، گوتیان –
بۆ بنەگە، ئەم ساڵ ڕەشماڵیشمان نییە!
دایكم گوتی – بۆ پێخەوتن، هەر یێك بەرماڵیشمان نییە!
بڵێن لە كوێ منداڵەكان بخەوێنم؟
مێرگی پارمان لافاو بردی،
بۆ ئایندەش، هێشتا هیچمان نەكردووە!
خۆم ڕێك نەخەم؛ دەدۆڕێنم!
پیره بەڕوو!
هاوسێكەمان پێش ماوەیێك، لەبەره خۆی، قسەی دەكرد –
ڕانە مەڕێك، جووتێك مانگا، جاش ماكەرێكی پشت نەكراو!
ئەسپێكی ڕەسەن، قاش لە چاو؛
خودای خودان! ئالیكیان لە كوێ بۆ بێنم؟
دار بەڕووەكە، دیارە ئەم ساڵ، چرۆ ناكا!
خوا نەخواستە گەر بە جارێك وشك ببێت،
نە مەڕەكان، نە مانگاكان،
هیچیان شیریان نادەن پێمان!
خودا هاوار بژیێنەوە پیره بەڕوو!
كوڕ و كچەكانم ئەمڕۆ، قسەیان بۆ یێكتر دەكرد،
بەڵام دەتگوت هیچ باوەڕیان بە قسە نەبوو!

نە ئیمانیان بە نزای گەرم، نە بە پسکەپسك هەبوو!
پاشان هاتن، هەر بۆ پرس، پێیان گوتم -
باوە، باوە!
ئەم دار بەڕووە، گەلێك بە ناو ساڵدا چووە؛
هەر نەماوە! باوەڕ ناکەین بژییێتەوە؛ هیشك بووە!
ئەگەر لە دنیا تێبگەین، ئەم پیرە دارە، مردووە!
باوە، باوە! خۆ دیارە؛ داری مردوو ناژییێتەوە!
ئارەزووم بوو باوەڕ بەم کوڕانەم بێنم، پێیان بڵێم -
ژیاندنەوە، لە لای خودا زۆر ئاسانە،
ئاخر خودا، خۆی ناندەر و پارێزەر و پەنامانە!
بەڵام بەر لەوەی بتوانم بە زمانم، وەڵامەکەم بدەمەوە،
چاك، چاك، دیتم؛ دوودەوێکیان گرتۆتە دەست،
هەموو وێکڕا چوونە سەر ڕێ، بۆ یێك مەبەست!
پرسیم -
ئەرێ کوڕەکانم، بە تەمای چین؟
گوتیان -
باوە! ئێستا ئەم دارە مردووە، کرمی بووە،
چاوەڕێی هەرەوەز ناکەین،
لە ڕەگیەوە دەری دێنین،
تەنیا خۆمان، لە شوێن ئەوا،
نەمامێ تازە دەڕوێنین،
واز ناهێنین،
باوە بە خوا، واز ناهێنین.

١٩٧٧/١/١١ - هەولێر.

**ئیمان و یاسا و ڕژێم**

دڵ برینــداره لــه دەستی ڕژێمــی تاریکەشــەو
مێشکــم سووتاوه لــه داخــی باوەڕێکــی نا بتــەو
شاد دەبم گەر وەك کونده بۆ، بنیشمه سەر کەلاوەی
حاکــم و یاسا و ڕژێمێك، کـــه هۆشیار دەباته خەو،
گــەر بــه گەنجێتی، ئەزیــزم، ژیانــت نەبەیتــه ســەر،
له دۆڵان نەفڕی بـۆ سەر شاخ، نەقاسپێنی وەکــوو
هەر باڵاییێك ئارەزووت کرد، نەیخەیه باوەشتــــەوە،
یان هەر لێوێکی که ویستت، نەیخەیه سەر لێوی دەو
وا درووست بووی گورد و ئازاد، ڕەند و شاد، بێ کۆت و
دڵ بگێڕە، گـــوڵ ببژێرە، بۆنی خــۆش بێت، چاره نەو
گوێ مەده یاسای فریشته، با بەزمت بێ، سەر تا سەر
زیندەگی هەر تاکه جاره، خۆت مەپۆشه، مەچووە
١٩٧٧/١/١٢ - هەولێر.

**به یادی خەیام...**

دەی تێکە، ئەم پێکە بەهەشتێك دەكڕێ، بە پەنجـە و بە جام خەفەتە دەبڕێ!
ئەم بادە، زۆر سادە دەمـــژیێنێتەوە مەستییە ژێردەستی لــە خۆوە دەدڕێ
پڕکەوە، مەسڵــەوە زەوقـــم ئێستایە دوێنێ چوو زووکە زوو بەیانەش نایە!
کە گێژ بم من خۆمم، بۆیێش شیرینـم بێرەوە تێکـەوە؛ مەســـــتیم بڕوایە!
دەی زووکە پەنامدە بە سینە و مەمەت ژین گرەوە، بیبەرەوە، هەر بە گەمەت
ناسەی سارد بێ فریاد بــۆم چارە نابێ! دەی بمبە قووتمدە، بەم چاوە شینەت.

۱۹۷۷/۱۱/۱۷ - هەولێر.

## کۆتاییەکان

گوتوویانە - هەموو شتێك کۆتایی دێت!
ئەرێ دەبێ نیهایەتی شتان چۆن بێت؟
دەبێت کۆتایی شت، بۆ بێت؟
کۆتایی ڕۆژ، کۆتایی گوڵ، کۆتایی ژین، هی زۆردارێك،
هی شاعیرێك؛ نەوبەهارێك؛
دەبێ چۆن بێت؟
خۆ دەزانم، کە ڕۆژ نەما، باڵندە لە ئاسمان نابێ!
کە گوڵ نەما، دیاری بۆ یاران نابێ!
عیشق نەما، دڵداری وەك جاران نابێ!
بەڵام کاتێك کە ئاوزینگ دەدا، زۆرداریێ،
سەدان مەشکە دەچنە دارێ!
زستان دەچێتە بەهارێ!
ئەو کات دەبێ ژیان چاك بێ!
یێکتری دەگوشن، دەستەکان،
ئایەغ دەبنەوە، مەستەکان،
دەژیێنەوە، مەبەستەکان!
ئازادی خونچە دەردەکا، ژین بۆ مرۆڤ کڕنۆش دەبا،
سینگ باوەشی دەکاتەوە؛
هەینێ زۆر خۆش دەبێ دنیا،
زەمان دەبتە شایی و سەما،
کۆتایی بێ کۆتاکان دێت!

۱۹۷۷/۱/۱۸ - هەولێر.

## دڵنەوایی

لەم وڵاتە، پەت بۆ گەردەن ئازادەکان، وەك خەڵاتە!
لێرە دەشێ چاوی خۆریش دەربهێندرێ،
ئەشکەنجەدان، ئازار کێشان،
تا ئازادی وەدەستهێنان، کرۆکی ڕێگەی خەباتە!
لەم ناوچەیە، زەمان جموجۆڵی هەیە!
هەموو شتێك لێرە دەبێ! بیرەوەریش لە یاد دەچێ!
منداڵ لە دایکی دەسێندرێ؛
ئەوەی ڕاستە، هەموو شتێ، بە زۆر دەکرێ!
تەنیا شتێ، لەم ناوەدا، نابێ، ناکرێ؛
هەرگیز ناشێ تیرت کەوانم هەڵیدا،
دەنگت لە قوڕگم بێتەدەر؛
جەمانە بکەیتە پێڵاو، یەمەنیش بخەیتە سەر سەر!
دڵنیابە (الحُرُماتُ قِصاصٌ)،
چاو بە چاوە، دڵ بە دڵە!
کوڕ بە کوڕە، گڵ بە گڵە!
دڵمان وەکوو دڵی خەڵکە،
درەختێکی هەردەم سەوزە، پڕی پەلکە!
دەیسووتێنن! ماڵی خۆتان کاول دەکەن!
بۆیێ گەلۆ! بە ناپاڵم، دەسووتێنن ڕەزەکانمان،
خاپوور دەکەن دێیەکانمان،
تێکدەدەن شارێیەکانمان،
ئەمەش بە ڕاست وەك ئەوەیە؛
ئاگر لە خۆیان بەر بدەن!

گۆشتی خۆیان پەلپەل بکەن.
ئاخر سەرم وەکوو کەللـــەی زلی ئەوان وایە؛
بەڵام هی من؛
دوو شتی دژ بە یێکتری، لە ناو دایە،
خۆشەویستی هەموو مرۆڤ، ڕقێکی زۆر لە زۆرداران.
ستەم و کوشتاری ئێوە، منی خستۆتە گومانێك،
ژیان بۆتە چوڕە ژانێك،
هەر ڕۆژ سەد جار دەیخۆمەوە.
زۆردار وەختە دیدەم سوور کات،
کڕنۆشی شێتیم پێ ببات،
بەڵام هێشتا، دەستم لە دەستت دانانێم، دەستم نادەم!
خەووم نییە، لە وشیاریش پەشیمان نیم؛ دڵی خۆشم بە تۆ نادەم!
ڕۆژێ سێ جار،
بە ڕەشپۆشی، دەستگیرانەکەم دەبینم،
ڕۆژێ دە جار،
بە هەتیوی، کۆرپەی هاوسێکەم دەبینم،
ڕۆژێ چەند جار؟ بە بێ ژمار،
دێتە گوێم نزگرەی دایکی ئێش و ئازار،
ڕۆژێ سەد جار،
دێنەوە یاد گوندی دەکان، شەهیدانی قەڵادزێ،
دێنە بەر چاو... پەت، سێدارە؛ لە سەر دڵم دەبنە گرێ!
پەشیمان نیم؛ لە وشیاریم.
دڵنیامە، گەردەلوولی هاوینی تۆ، تەڕ و وشکی دارستانمان ڕادەماڵێ،
دڵنیاشم، بەهار هەر دێ؛ بەهاری من لە چاوی تۆ دێتە دەرێ،

هەر دوو جەژنت لێ تاڵ دەبێ،
هیچ کوڕێکتان دەسگیرانەکەی نابینێ،
هیچ بووکێکتان لە ئامێزی زاوای باوکی، تێر نامینێ،
ئەمە سیستەمی ژیانە؛
وەکوو گژلۆك بۆت دێمە خوار، ڕێك، وەك گڕکان، لێت هەڵدەچم،
لە ناو چێشتت سەر هەڵدەدەم، لە ناو پێکت بۆت دەردەچم،
لە سەر سیسەمی خەوتنت، وەك عیزرائیل دێمە کنت.
دەرسێکی گەورەی زەمانەم وەرگرتووە؛
فرێو نادرێم؛ بۆیێ هەر دێم.
دڵنیابە، هێزم ماوە،
بۆ ئازادی خەبات دەکەم؛ ئاخر من مافم خوراوە!
ئەگەر هەستی خواردنی ماف، لای مافخوراو پەنگاو بدا؛
هەناسەی بڵێسە دەکا،
گڕ دەردەدا،
شتی بناو، سەر ئاو دەخا.
مێژوو، هەزار بەردی بە دوو؛ پاشەڕۆژ ڕووناکی دەدا!
ژیلەمۆ بە نمەباییك گڕ دەستێنێ،
کۆرپە، گاگۆڵە، پێرەوکە، گەنجایەتیش، سام دەنوێنێ!
دڵنیامە! ئێسقان دەشکێ، نەرم نابێ،
خاك دەسووتێ، گەرم نابێ،
نامووس نەبێ؛ بەرانبەرت شەرم نابێ!
دەبێ زەوی بە دەوری ڕۆژ، بخولێتەوە،
ئەستێرەش بدرەوشێتەوە،
چیا لە عارد نابێتەوە، ڕۆژ بە بێژینگ ناشرێتەوە،

بۆیێ من زۆر دڵنیامە،
هەموو ساڵێك بەهارێکی هەر تێدایە،
هەموو باخێك، درەختێکی هەر تێدایە،
هەر تەمەنێك داوەتێکی هەر تێدایە!
دز و کوشتار و ستەمکار، سێدارە و لێدان و ئازار،
هەرگیز زیندوو ناترسێنن، کەس پێی پاشگەز نابێتەوە!
زەویم دەبەی! دەمکوژی پەلپەلم دەکەی!
ڕاوەست تا کورد، خەویان خۆشیان دەڕەوتەوە!
ئەوەی کوشتت، دزیت، بڕیت، ئازاریت دا،
لە دایکی ئەشکەنجەدانت دەبێ پەیدا،
دەبتە سوار، سەر هەڵدەدا!
تاتار بی یان مۆسۆلینی،
هیتلەر بی، نێرۆن یان ڕۆمێل،
ڕاپەڕینێك بۆ من بەسە،
ئییان سمیت بی، یان سەدام،
گرینگ نییە، چ هەی، چ بووی،
ڕاپەڕینێکە و لە ناو چووی.

١٩٧٧/١/٢٢ - هەولێر.

**لەیلا**

لەیلا خانم! چیای دووریت، بیابانە!
درەختیش، خۆی، بێ زمانە!
مردوو خەوی خۆشی ناوێ؛
جەستە، بۆ خۆی، کوورەی ژانە؛
شەیدایی تۆ،
دەماری پڕ لە خوێ کردم؛
شەیتان دەیهەوێ ئاوزینگ دەم،
کەچی لەیلا،
دووا هەناسەی خانمێك،
چاوی قاژقاژەی ژیانە!
ژیان ژانە، نەمان مانە،
ئاژەڵێکی گۆشتخۆر ئەمڕۆ،
پۆشاکی وەکوو ئینسانە،
ڕەگ و ڕیشەی حوشترالووکە،
لە ناخی مەیلەو گەڵێکدا،
گەورە دەبێ و سەرۆکیانە!
وەکوو تەمۆخ ڕەق و وشکە؛
دوور بارانە،
لەگەڵ پیپی نەوت دەنوێ،
لەگەڵ خودی شەیتان دەدوێ،
دەبێ ئەمە عەقڵی چۆن بێ!
چەند هەرزانە.
سێدارەی تۆ نەفرەت نییە،

مردنت قوڕگی ژیانه؛
مردنی تۆ زندەگییه؛ کانی سافه؛
له چەقفەی هەست هەڵدەقوڵێ،
ژانەکەی تۆ تووڕەییيه،
چەرخی زەمانی پێدەسوێ؛
ژان، لەیلایه، دەبته چرا،
دەبێته پەپوولەی شەیدا،
پەڕ و باڵی بۆ دەڕوێ.
لەیلا، ئازار هەستی پاکه،
دادەخزێته مێشك وەك خەو،
برین لەیلا،
ڕووبارێکه بێ زیخ و چەو،
لەیلا گوڵه ئەستێرەکەم،
چەوسانەوە،
مردووی هەموو ژیاندەوە؛
سیمای له جاران گەشتری پێدانەوە،
لەیلێ، دڵێ، شەو باوێشك دەباتەوە، له باوەشی ڕۆژی ڕەنگ زەرد،
گەردەلوول سەما دەگێڕێ، له ئەشکەوتی تاریکی دەرد،
لەیلا، گریان شەپۆل دەدا، قەراخی دەریای کرده بەرد،
کورد بۆشایی سینگی نەما؛
ئازارەکان
له سەر زۆردار
کراون به قەرد.

١٩٧٧/١٠/١٤ – هەولێر.

## دڵ و لەیلا

لەیلۆ! دڵۆ!
نە شێتم من نە شێواوم!
چاوەڕێتم؛ لە سەر پەیمانەکەم ماوم!
وەك مراوریم، نەدەگۆڕێم، نەگۆڕاوم!
چاوەڕێمە،
هەوری بەهار بمبارێنێ،
گەرمای هاوین وشکم بکا،
زەردەی پایز بمخارێنی.
پاش سەد مردن،
ئەشکەنجە دان، ئیعدام کردن،
ئینجا لێیان ببمە سەد دەم،
نەیانجووم؛ هەر قووتیان دەم.
دڵۆ! لەیلا!
ئازار هەستێکی زۆر سەختە، لە مێشك دەچەقی وەك داس،
خۆشەویستیش لافاوێکە، وەك دڵداری خەزار و لاس،
لەیلا قاسم،
چەوسانەوە، مردووی هەموو ژیاندنەوە!
وێنەی لە جاران جوانتری پێدانەوە،
لەیلۆ! دڵۆ!
شەو باوێشك دەباتەوە، لە باوەشی ڕۆژی ڕەنگ زەرد،
گەردەلوولە سەما دەکات، لە ئەشکەوتی تاریکی دەرد،
ئازار، لەیلا!
شەپۆل دەدات؛ قەراخی دەریای کردە بەرد!

ژووری سینگم دارماڵ بووە،
زۆر ئازاری داوین نامەردا!
دڵۆ! لەیلۆ!
ئێستا، چیا بیابانە،
درەخت خاوەن زمانە،
مردوو خەوی نەرمی ناوێ،
ئاخر مردن سەرلووتکەی ژیانە!
دڵداری تۆ جۆشێکی تایبەتی هەیە،
خڕۆکەی سووری ناو خوێنم، بەرانبەرت سەما دەکا!
دەك ڕسوا بی ئەم تاوانە!
نەهەنگ دەیەوێ ئاوزینگ دەم،
من خۆم چاوم لە ژیانە!
ژانی مردن ڕەگوو ڕیشەی حوشترالووکە،
لە ناخی دڵم ڕواوە،
وەك لوولەی بوڕکانی تەقیو،
لە ناو مێشکم گڕی داوە!
ژانی پەتی قەنارەی تۆ، وەك کانییە!
لە ناو بیابانی هەستم هەڵدەقوڵێ،
ژانی مەرگی لاوێتی تۆ،
چەرخی زەمانی پی دەسوێ،
ژان لەیلایە! پەڕ و باڵی لە بۆ دەڕوێ،
پەت نۆبەرەی ئازادییە؛ لە باوەشی هیوات دەنوێ،
لەیلا لایلایەی بۆ دەڵی!

١٩٧٧/١٠/١٤ – هەولێر.

**تەنیایی و قەرد**

تەنیا خۆمم، دەڕۆم و دێم!
لە دۆزەخی بێ ویژدانی نا ئینسانانندا، دەسووتێم!
لە سەر و ژێر، لە هەر چوار لام، داگیرساوم!
لە کوورەی بیری بێ ڕایان قەتیسماوم،
تەنیا خۆمم هەنگاو دەنێم، تا دەبرژێم!
بەرەو زینی ئەسپی ژیلەی ئەڤینداران، دەڕۆم و نایێم.
گورزی زبری گرێی پەتی قەنارەکان،
لە گۆبەندی دەستی هەتاو، دێنە سەر ڕێم.
چڵکی پەتی ملی خنکاوە نەمرەکان، بە دڵ، دەخۆم.
هەر خۆم، هەر خۆم!
کفنی زەردی لەیلا قاسم دەشۆمەوە،
ئاونگی ئازاری گلێنەی لە دوو قولینچکی چاوانی، دەخۆمەوە،
بە هیوا و یادی ئازادی، لە شوێن پێی ئەو،
پاژنەم دادەچەقێنمەوە.
ئەرێ تەنیا هەر خۆمم خۆم،
بەرەو خۆری ئاوات دەڕۆم؟
پایز زەردە! دیمەن هەمووی تۆز و گەردە،
دڵ پڕ دەردە،
زمان پۆشراوە بە پەردە،
ناوێرێ بیڵێ، نامەردە.
داپۆشراوم، لەو دەمییەوە،
کە لە شەڕی سەدەی حەوتەمیندا، بەزیم،
مافی خۆمم بە عارەب دا؛

بۆیێکە بێ دەستکەوت دەژیم!
خودان هەڵوێست کەسی مەردە،
باوەڕ کێوە؛ سینگی هەردە،
مافی قەردە!
بێ هەڵوێست نیم،
لە ڕێی خەڵکی لامنەداوە،
لە شەقامێ نەترازاوم!
نەتوامەوە!
بۆیێ ئاوا بەسترامەوە!
وەکوو تۆپێکی سەهۆڵبەند،
وەکوو شەختە،
لەم زەمانە زۆر بێ شەرم و زۆر بێ بەختە،
لە مۆڵەق ماو و حەپەسام!
لە ناوەندی ڕێ ڕاوەستام!
شەقام ڕەت بوو؛
بەڵام هێشتا من قووت نەدرام!
کات تێپەڕی؛
من هەر لە شوێن خۆمدا، وەستام!
ترسم هاتێ؛ سام گرتمی،
هێشتا هیچ کەس نەهاتە لام،
(شت بپێوێ بە کڵاوم!)[1]
لە حەژمەتان پەنجەی خۆم گەست،
ئاخر گەلۆ، مێژوو خۆم بووم،

---

[1] قسەیێکی باوی ناو کوردەوارییە.

شوێنەواری مێژووش، خۆمم،
هێشتا وادەزانم، مردووم.
سووڕام، گەڕام!
لە لێواری تریفەی ئەستێرەییێکدا،
باوەڕم کرد؛ ئاوی حەیاتێم خواردەوە!
پاشان زانیم کە خۆم دۆڕاند؛
ئێستاکە وا بە بێ ناوم!
کێوی زوخاڵم بردەوە،
سەری خۆم بۆیان دانواند، زەمانێك بوو،
شەو دەگەڵ بۆرژاوەکاندا، دانیشتبووم،
لە سەر گۆڕی چەند مردووێك،
ڕێك، نووستبووم!
لەو کاتەی تەلقینم دەدان،
ووشە لە گەرووم دەوەرین،
دەژیانەوە لە سەر زمان،
ئارەزوویان کرد هەستنەوە؛
کڕنۆش بووە شیلەی ژیان!
دەهاتنە قسە لەگەڵمان،
من ئەو کاتە لە ناو دەچووم،
کە زۆنگاوی بیری کۆن بوو، بووە داوم،
بزر دەبووم، بزر دەبووم؛ ئاگر پڕە لە هەناوم!
١٩٧٧/١١/١١ – هەولێر.

## بزربوون

به ویستی خۆم لە شەقامێ داترازام!
لە سەر ڕێگەی خەڵکیم لادا؛
بێ هەڵوێست مام!
وەکوو شەختە، توامەوە!
بە سەد زنجیر، بەسترامەوە!
وەکوو تۆپێك ئاوی مەییو،
لە مۆڵەق مام و حەپەسام!
لە ناوەندی ڕێگا وەستام!
شەقام ڕەتبوو؛
قووتی نەدام!
منی لە بن هیچ شت نەدی!
منی نەفام!
کاتێکم بۆ ژوان دانا؛
کات هات، ڕەت بوو؛
بەڵام لە شوێن خۆم ڕاوەستام!
ترسم هاتێ؛
سام گرتوو بووم،
بەڵام، داخم!
هیچ کەسێکتان نەهاتە لام!
لە حەژمەتی کات بە سەر چوون،
هەر دە پەنجەی دەستی خۆم گەست،
(مێژوو خۆم بووم،
شوێنەواری مێژووییش خۆم،

هێشتا وامزانی کە مردووم!)
سوورڕام! گەڕام!
لە ناو کۆڵانان، داترازام،
لە لێواری تریفەی ئەستێرەیەکدا،
ئاوی حەیاتێم خواردەوە!
ئاخ! خۆم دۆڕاند!
سەد وا وەیلام!
کێوی زوخاڵم بردەوە،
هزری عارەبم گرتەوە!
شەوێك،
دەگەڵ چەند خەوتووێك دانیشتبووم،
لە سەر گۆڕی چەند مردووێك،
ڕێك، نووستبووم!
لەو کاتەی تەڵقینم دەدان،
ووشە لە گەرووم دەوەرین،
دەژیانەوە لە سەر زمان،
ئارەزوویان دەکردە هەست،
نۆشیان دەکرد شیلەی ژیان!
دەهاتنە قسە لەگەڵمان،
من ئەو کاتە لە ناو دەچووم،
لە زۆنگاوی بیرێکی ڕەشدا ڕوو دەچووم،
بزر دەبووم،
بزر دەبووم!

١٩٧٧/١١/١١ - هەولێر.

١٩٧٨

## کورت ڤاڵدهایم

سکرتێری گشتی UN هاتە ئەنکارا و تەهران! بە ئاسمانی کوردستاندا ڕەت بوو.

گەورەی ئۆفیسەکەی مرۆڤ، نەك مرۆڤ خۆی،
کورت ڤاڵدهایم، هاتییە خۆرەڵاتی ناڤین!
ئارەزوومە منی کوردی لەخۆبردووی، مەرد و چالاك، دڵ پڕ ئەڤین!
وەك خاوەن خاكی ویژدان پاك، زۆر دوور لە ڤین!
لە مەجلیست دابنیشم، هەڵبڕێژم زام و برین،
کەچی وا دیارە گوێ ناگری، لە گرفتی کوردی دێرین!
ئارەزوومە، منی مرۆڤ داوای هەڵوێستت لێ بکەم!
گوێ ناگری لێم! گەلێ سەیرە! بە ئاسمانی کورستانم تێدەپەڕی؛
کەی ڕەوایە؛ سەیری ناو خاکەکەم نەکەی، هەر دەرپەڕی!
هاتییە ئێرە، ئا لەم ناوە و لەم دەڤەرە،
گازی خاکم دەسووتێنی، تاوەکوو گەرم ببیەوە؛
تا لە سەرمان، لە چەشنی منداڵی کوردان، ڕەق نەبیەوە!
میوەی ڕەزی خاکی کوردان، زۆر بە ڕەهایی نۆش دەکەی،
کەی ڕەوایە، هێشتا پرسیارم لێ نەکەی!
هاتی! هاتووی، لە ڕووناکی دایانناوی؛ یێك هەنگاوێك، بۆ دەرەوە؛
تاریکی سەدەی حەوتەمت بیر دێنتەوە!
ئەو کورسییەی وا تۆیان لە سەر داناوە،
قاچەکانی سێپێکی سێدارەیەکن، زۆر گەنجی پێ هەڵواسراوە!
ژێیەکانی قەنارەنە،
شوێن پشتەکەت، دەرگەی ئەوان زیندانە زۆر ڕەشانەنە،
کە کوردیان تێدا گیراون!

بۆیێش لە ژێریان داناوی، تا نەزانی چ کارەنە!
هاتووی! لێرە دانابەزی!
دەدابەزە لە سەر زینی قەنارەکان،
سێ چوار هەنگاو بنێ بۆ ناو، گەنجە بزر کراوەکان!
هەر تەنیا چوار قسە بکە، لەگەڵ دیلە زمان بڕاوەکان!
لەگەڵ دایکی گەنجە ئیعدام کراوەکان،
هێر ڤاڵدهایم! تەنیا بۆ یێك جار دابەزە؛
وەرە بۆ ناو ئەم چەند ڕەزە،
خاوەنەکانیان بناسە، گرفتەکانیان بخوازە!
هاتووی کێشەی قیبرس سووك کەی! خۆری ئاشتی لەوێ هەڵکەی!
ئاخر هەندێك خەڵکی قیبرس، دیارە لە لاتان ئینسانن،
ئەی کورد چینە؟ دەی باسێکی ئێمەش بکەن، تا بزانن!
تۆ گشت دنیای، زەویش هەر تۆی!
دەڵێن کە وا تۆ مرۆڤی، ئەویش هەر تۆی!
تۆ یەزدان نیت، ئەویش نە تۆی،
لەو عەداڵەت هەڵدەقوڵێ، عەداڵەتیش، بە ڕاست، نە تۆی!
ئەی کە تۆ بۆ کوردستان نێی، من چیم؟ نەڵێی!
هەر هێندە وا سکرتێری، ئەی پێشینەت؟
تۆ هیتلەریی،
تۆ بکوژی جوولەکانی،
تۆ لە ناوبەری ئینسانی!
نێیتە ئێرە، وەك ئەوانی!١٠/١/١٩٧٨ - هەولێر.

## هەر گەڕام

هەر گەڕاوم، نەمدیتیەوە!
سوورترین دڵۆپی خوێنی ناو لەشمی، نەمدۆزیەوە!
گورجترین تیشووی مێشکمی، نەمخوێندییەوە؛
خورپەی دڵی، سۆز و هەستی،
دڵۆپە فرمێسکی خەستی؛
لە ناو بیلبیلەکەی چاوم، وەك بەربەستی؛
نە ون دەبی، نە بن دەچی،
نە دادەڕسێی، نە دێیتە خوار،
ئایا تاکەی لەو هەندەرە ڕادەوەستی؟
لە بەر چاوم لە دار درای،
دەڵێی قورقوشم، پێ خورای،
جەستەت پڕ کردوومە لە ژار،
بەرگت پڕ کردوومە لە مار، زمانت کردوومە بێ زار!
ژیانت پڕ ژان کردوومە،
هەستت لێ ڕەوان کردوومە،
خەوت زڕاندوومە، شەوان!
ئەی دڵ، ئەی چاو، ئەی هەست، ئەی هۆش،
وەرن لەگەڵ جامی سەرم، ببنە سەرخۆش،
بنوون، بنوون، هەڵمەستنەوە،
کە ڕۆژ ڕۆیشت زۆر بە سستی،
جا وەرنەوە!

١٩٧٨/٣/٣٠ - هەولێر.

## ڕەخنە

ڕەخنەگرانی ئاڤێستا! ڕامتەکێنن!
بە کوێرترین بزماری دار، وەکوو عیسا، لە خاچم دەن!
ڕەخنەگران لە سەر ئەرکی بیر و بڕوا، لە چاپم دەن!
لە سەر نووکی خامەکەمدا، فەلاقم کەن!
زەردەواڵەی دنیا هەموو کۆ کەنەوە،
جا هەموویانم تێبەربدەن،
تێکڕا بمخۆن، لە پاشان بمڕشێننەوە!
ئێستا چۆنم، هەینێش هەر وا دەخولێمەوە!
چاوچنۆکان، وەك داوە دەزی، ڕوخساری نازدارەکانم پێ هەڵگرن،
بمکەن بە ڕەنگ؛ لێوی نەرمی قەشەنگانم پێ بنەخشن،
بمکەن بە توول؛ یا بە گوریس؛
ئاوم لە بیر پێ هەڵێنجن، شیم کەنەوە!
وەکوو هەویر، بمشێلن و بمشێلنەوە،
ئینجا بە ئارەزووی خۆتان، وەکوو شتێك، دامڕێژنەوە!
جوان، کرێت، شێوەیێکم پێ ببەخشن!
ناووم لێنێن! ناز ناوم بۆ بدۆزنەوە؛
ناوی دایکم، ناوی باوکم، هی باپیرم، هی داپیرم،
بە زەوقی خۆتان بیگۆڕن؛ هەر چی دەکەن بیکەن؛
لە لای من هیچ گرینگ نییە؛
چونکە کاتێك قەلەمەکەم دەگرمە دەست،
پێشان کێ بووم، ئێستاش هەوم؛
شەیدای کێو و قاسپەی کەوم.

١٩٧٨/٥/١٨ - هەولێر.

**دەشتی هەولێر**

دەناڵێنم، دەنگم نییە!
سەرهەڵدەبڕم، ڕەنگم نییە!
دەست هەڵێنم، هەندەی ئەوان هێزم نییە!
فیدای بازووی تۆزاویت بم، ئەی پێشمەرگە!
سەر هەڵبڕە، لەو دەشتە بەرینەی هەولێر، سەدای مەرگە!
سەد جار قوربان ئەم دوو چاوە تیژانەت بم، ئەی پێشمەرگە!
لە کوردستان، فڕۆکەکان، برینت لێ گەورە دەکەن،
گوێی پێمەدەن!
خۆیان بچووك، سەد بەهرە بە ئێوە دەدەن،
تانکی ڕووسی، کە بە زنجیر دەشتی هەولێر زامدار دەکەن،
گەورەی دەکەن،
زرێپۆشی ئیشتراکی، لە بن سەربازی بێ ورە و گەلێك برسی،
دەشتی هەولێر هەڵدەدڕی،
لە مافی هیچ کەس ناپرسی!
من دەزانم بێدەسەڵات، ژانی زۆرە!
تەختەی پەراسووی ناو سینگی، هەر کلۆرە!
یێکەم بروسکی گرانە؛ تار و بۆرە!
زۆردار هیچ ئاوات ناهێڵێ،
بەڵام ئەگەر هەموو چقڵی دونیا، دڕك - دڕك لە چاو ڕاچێ،
ئەگەر مرۆڤ داسی دوژمن هەڵیپاچێ،
هیچ ئاواتێکی بەرزی کورد لە ناو ناچێ.

١٩٧٨/٥/٣١ - هەولێر.

**لە ناو هەڵبەست**

ئەگەر ڕۆژێك
لە ناو هەڵبەست،
بوویە سەر مەست؛
هەڵوێستت بوو،
ئارەزووت بوو
ببیە مەبەست،
ببیە بناری سۆز و هەست،
هاتنە ڕێبازی ئازادی،
هیچ سل نەکەی،
چونکە لێرە،
ئەم وڵاتە،
پڕ گوجیلە و بە بێ شێرە،
هەموو نارێکییێك دەکرێ،
نییە بەربەست!
تەنیا بەعسە،
بەعسیش هێمای دیلی کوردە،
کوردی بندەستە!

١٩٧٨/٦/٨ – هەولێر.

**هۆزان و هۆزانڤان**

وشەی هۆزان، لەو دەمانەی کە هاتییە سەر نووکی قەڵەم،
گەورە دەبیت، تا وات لێدێ، بۆ هۆزانڤان بەس دەبییە خەم!
بە ئەسکوردی هەستیاراندا، شۆڕ دەبیەوە،
لەگەڵ جەستەی شاعیرانی ئەم وولاتە، قەت نابییە تەم،
ئەو دەسووتێ، لە دار دەدرێ، لە ناو دەچێ،
ئەتۆش هێشتا گەورە دەبی، دوور لە ستەم!
١٩٧٨/٦/٨ - هەولێر.

هیوا

کە درووشم نووسرانەوە لە دیواران،
بە پوختەیی، بە دەرکەوتن، ئاواتەکان،
ئەو ڕۆژ هەرگیز بزر نابن ڕێبازەکان؛
بە خێرایی، ڕێگـــە دەبڕن هەژارەکان!
ترس و تۆقین کۆتاییان دێ لە شارەکان،
چاك دەچەسپن ئاواتەکان، ناوماڵەکان؛
دەبووژێنــەوە مێرگەکان، کانیاوەکان،
ئازادی دەبتە ئەستێرە لــە سەر ڕێمان.
١٩٧٨/٨/٩ - هەولێر.

**زەنـــگ**

لە قەراخی پەردەی گوێی بچووکم،
زەنگییان لێدا، شاییان دابەست،
لە قەد میلی ڕادیۆی زڕە زۆنگاوەکان، دەنگیان هات؛
زاو و زێ کردن، یاسای هەیە، ڕێسا و مەبەست؛
زەماوەند گێڕان بێ پرس، ناڕێکییە،
بەڵام چی بکەین؛ کوردە، کەسی نایێتە دەست!
بیانووی دەنگت پێدەگرن، نابێ، هەرگیز، لە کورد دەرچێت،
نە خوست نە هەست!
کوردە، ووس بە، با زمانت نەکەوتە بەر تیخی مەقەست!
هەر لە بانی باکووڕەوە،
با تێمهەڵدەن - وەك ئێستا چۆن تێهەڵدراوم،
با سیمایەکەم بگۆڕن - وەك گۆڕینی هەموو ناوم!
وەك ئەستێرەی دوور لە گەردوون، هەڵواسراوم
کۆرپەیێکم، وا خەریکم، تازە گغەگغم لێدێ، لە بۆ دایکم،
ئاگادار بن، هێشتا ماوم!
گوێم دابووە زایەڵەی سەمتووری کوردان،
لەو دەمیدا، لە سەری دام، ئێستاش هەر لە کەللـــەی داوم!
پیرەمێرد هات، لە سەر هەردووك کێلەکانی خۆی ڕاوەستا،
تەماشای چاپەکەی دەکرد، تا بزانێت هەر کار دەکات، یانە وەستا!
منی تەنیا، هێندە شەرمەزاری ئەو پیاوە بووم،
نەکرا، تەنیا سەیری بکەم؛ بەس حەپەسام!
تا ئێستاش ودم کراوم!

١٩٧٨/٧/٩ - هەولێر.

## هیوا

به هیوا بی،
که هەر سەر بەرز و باڵا بی،
که چاوانت له هێلانه و له ڕاوکه بی،
دەزانی ژین ڕاپەڕینه و پڕ هەڵمەته؛
عەقڵ دەبته دەریاییێکی پڕ کەژ و کێو!
پڕ له زەمانی ئاینده، زمان و لێو،
لەگەڵ بەفر هەڵدەکشێ،
لەگەڵ هەور دادەبەزێ،
لەگەڵ هەڵم دەبێته بارستەی سەهۆڵ،
جا دەیبەستێ،
وەکوو شەختەی ناو ئەشکەتێ،
وەك دڵی مرۆڤ دەکوتێ!
قەت ناوەستێ!

١٩٧٨/٨/٩ - هەولێر.

**شارەکەمان**

شارەکانمــــان، چەند گیانــداری بریندارن، هــێرە دەکــــەن،
بەرانبەریان، جاشی نامەرد، لە بۆ دوژمن گــێرە دەکەن،
دەبنە زنجیر، دەبنە داردەست، دەبنە گوللــــە، دەتەقنەوە؛
مێشکی کوردان دەپرووژێنن، پەنا و پەسیو سێرە دەکەن؛
خاکفرۆشــن، خۆفرۆشن لــە بـن دەستیان دەبێ دەرچین،
زۆر گڵاون، پـاك نابنـەوە؛ خراپەشـــــیان لــێرە دەکەن!

١٩٧٨/٨/١٦ - هەولێر.

## ترس

تۆ کە ترسای، بوویە بەندە؛ بوویە پەیکەرێك، بێ بنکە!
ڕەش و ڕووت و ڕاگوێزراوان سەیرت دەکەن،
زۆریش بە زەبیت پێدەبەن!
تۆی ترسنۆك، چاو لەبەری، زمان شڕی، قوڕ بە سەری!
گەر نەترسێی، سەیری پاشکۆی شانۆی ژین کە،
پەردەیێکی لە سەر نییە، تۆش پەلەکە، ئەسپت زین کە!
ڕابردووت، ئێستات، داهاتووت، لە ناو ترس جێیان نییە!
جێی ترسنۆك ژێردەستییە!
خۆت ڕاگرە، داهاتووی کورد، بێ گومان بە، ڕەشەبایە!
گەردەلوولە، سەهۆڵبەندێکە، سەرمایە!
لە سەر پێست و ناو دەماری جەستەی کوردە،
برین قەتماخە قەت ناگرێ؛ چونکە ژانێکی ڕزگاری لە دووادایە!
چاوی ترس، وەك ڕاوچی بەر خۆرەتاوە،
شەماڵ دەیبا، نایهێنتەوە، وەکوو زەوییێکی بەراوە!
چاوی ترس، جاشکۆڵەی کلك بڕاوە!
دڵی ترساو، ئازارێکی بێ کۆتایی، نەقەتیاوە!
ترسنۆکێك چۆڕاوکەیێکی سووری لیچ،
بە سەر کوڵمی ڕێچکە دەکات، ناسڕێتەوە؛ نەسڕاوە!
دەوروبەری ترسنۆکان بەرد بارانە،
لە بن سێدارەی زۆرداران، سەراو ژێرە، نەوێرانە!
شێخ سەلام و قازی و سمکۆ،
ڕەجمی ترسنۆکان دەکەن، ترسنۆکان بێ بەهانە!

١٩٧٨/٨/١٦ - هەولێر

## دڵـــم و دایکم

شەوێك، دایکم تەنیای بینیم؛
سەری خستمە سەر کۆشی خۆی،
بۆ من گریا، گریام لە بۆی!
دڵم چەشنی دڵی دایکم، دایە کوتان!
هەردووك دڵمان هاتنە لەرزان!
دایکم پرسی - ڕۆڵە! دڵت چی دەوێ لێت؟
هێشتا گچکەی،
ماندووی مەکە، با بسرەوێت!
ڕۆڵە دڵت بە کێ داوە؛
تا بەیانی، خوازبێنی کەم،
بەڵام ئێستا با بخەوێت!
گوتم - دایە! ئەم دڵەی من دڵی خۆمە!
بولبولێکە، وا نیشتووە؛
ئێستاش لە سەر چڵی خۆمە!
دایە، دڵم، پێڵووی چاو و کلی خۆمە!
حەزی لە ئاسۆی بەرینە،
مێژووی دنیای بێ پەرژینە!
دار و بەرد و زێ و ڕووباری،
جل و بەرگی هەر هی خۆمە!
چاو و دیدی سەری منە!
مێشك و عەقڵ و هزری منە
خۆڵ و هەرد و بەردی منە!
جەستەی هەموو جەستەی منە!

مۆری پوختەی دڵی منە،
پێناسەشی،
هەر ئایندەی دڵی منە،
هەموو خرپەی دڵی منە!
دڵم، دڵم کە ناتوانێت پرسیار بکات،
پەیکەرێکە ڕێی نەدراوە هاوار بکات؛
تەنیا یێك خودا دەناسێت،
تەنیا یێك خوا دەپەرستێت،
ئەو خودایە
داهێنەری
گیانی ژینی سەربەستییە
بۆ ئەوانەی شەوەکانیان زۆر درێژە،
بە ڕۆژ ناچار، نوێژ دەکەن،
بن نینۆکیان پڕ قرێژە،
دڵم ڕێگەی دڵدارانە،
هی عیشق و ئەویندارانە،
دڵم بیری لەناوچوونی زۆردارانە،
دڵم مەرگی ئەمرۆی تاڵە،
سۆزی ژیانی بەیانـە!
ئۆخەی دڵم، کاتێك خاکی پڕ لە پیتی داری گوێزە
کاتێك وزەی بازووی کوردی، کوردپەروەری زۆر بە هێزە؛
ئۆخەی دڵم
پشتیوانی هەر کەسێکە، کە لەم خاکە پەراوێزە.
١٩٧٨/٨/١٦ - هەولێر.

## تەنیایی

کە تەنیایی،
مچوڕکی ساردی جودایی،
بە گوڕ، بە تاو، یان ئەسپایی،
گەمارۆی دڵەکەم دەدات، هەستم دەپووکێنێتەوە،
ئا، لەو دەمی، ڕاست لەو دەمی،
تنۆك - تنۆك، لە باوەشی گەرمی تۆدا، دەتوێمەوە!
کە ئێوارەش هاتە لام و باوەشی ئاوەرەیی خۆی بۆم کردەوە،
ڕاست لەو دەمی،
وەکوو ساوا، لە باوەشت دەنوومەوە! خاو دەبمەوە!
خۆشەویستیت، بۆ هەوارە دوورەکەی خۆت، دڵم دێنێت،
لە سەر سینەت، پێڵووەکانی ڕاست دەنوێنێت!
سەهۆڵ ئاسا، لە باوەشی دڵە خەیاڵاوییەکەتدا، دەتوێمەوە!
تا بەیانی، کە تیشکی خۆر دای لە هەردوو چاوی جوانی،
شیعر دێت و خۆی لە نووکی خامەم دەدا،
چاوەڕێیە، تا بزانێت؛
لە ناو وشەم دەبتە شەکر! دەبتە سەیران، دەبتە شایی،
دەبتە هەڵبەست، پڕ قسەی خۆش. پڕی ڕەحمەتی خودایی!
وشە بە وشەی، دێڕ بە دێڕی،
وەك ملوانکەی خۆرەتاو و گوڵی هەڵبەست
لە ئەسکوردی سپیت دەکەم، هەر بە مەبەست؛
تا ببڕێتەوە تەنیایی، پاشتر بژین دەست لە ناو دەست!
١٩٧٩/٣/٤ - هەولێر

**پەنجە و سەر**

لە ناو خوێنم، ماسی دەگرێ! دەمهەژێنێ!
کانی بیرم وشك دەکات، ئەو دەنگی قوڕگم، دەردەکات؛
بەرەو درۆ، لە گەڵ کۆرپە ساواکانم، هانم دەدات!
ئەستێرە بە ڕۆژ دەردەخات!
خۆر کاتی شەو تیشك دەدات!
سەدان مێدالییای چەوتی، لە مل دەکات!
بەم هەڵسوکەوتە نارێکە، دۆستەکانی فریو دەبات!
قرچەی گەرمای هاوین کەمە،
بە مەرگی خۆی دەکات گەمە،
عاشق زۆرن، دۆستیش زۆرن،
لە خۆم زۆر باشتریش، زۆرن،
هێشتا برا، مردن کەمە! بۆ هەژاری ئەم سەردەمە؛
لە بۆ بێکەس، لە بۆ نەزان، ئەم ژیانە، پڕ ستەمە!
هەر چەندە سەدەی بیستەمە!
پەنجەکانم ، گرێ، گرێ، لێك ترازاون!
بە تیشکی تاو هەڵبەستراون!
لە یێك مەمك شیر دراون،
لە یێکتر وشت، ڕاوەستاون!
جووڵە باوەڕ بە کەس ناکات!
خوێنی ناو دڵ، لە گوێچکۆڵەکان دەترسێت!
ئێسقانەکان، ئاولەمەنە!
بۆ بێکەسان، سەدەی بیستەم هەر وا دەبێت!

١٩٧٩/١٢/١٨ - هەولێر

**که هاتیەوە**

که هاتیەوە، من کوێت ماچ کەم؟
گەر شێخیش بیت،
قایل نابم دابێمەوە و دەستت ماچ کەم!
گەر هاتیەوە،
شایستەی کوڵمت هەڵمژم،
خۆ دەزانی، تۆ گیانمی،
نەك هەر بە تەنیا یارمی،
تۆ تەمەن و بەهارمی،
بە تەنیا خۆت،
هەم گوڵ و هەم گوڵزارمی!
جا کوێت ماچ کەم،
تا دڵم ئاو بخواتەوە؟
لە گلێنەی هەردووك چاوت،
عیشق پەنگاو بداتەوە؟
لە خۆم گەلێك پیرۆزتری،
لە خۆم گەلێك بە سۆزتری،
ئارەزوومە،
هەردووك لێوم،
لە ناو گلێنەکەی چاوت،
ڕنگداتەوە!

١٩٧٩/١٢/٢٤ – هەولێر

لە ناو ئۆتۆمۆبیل لە ڕێی هەولێر بۆ موسڵ!

## ١٩٨٠

### تۆم دیت!

تۆم دیت - خۆم دیت!
دڵت و دڵم، دوو باڵداری پەڕ سووتاو بوون!
لەو کۆشکە دیوار لێکراوە،
لەو ماڵە سەد سنوور دراوە، خۆم دیت؛ خۆمی نەناسییەوە،
خۆم دیت، شیعری خۆمی نەخوێندەوە!
زەینم دایێ تا بزانم چی قەوماوە! چییە بووە!
کە سەیرم کرد، یێکسەر بینیم، شەیتان بۆ ئێرە هاتووە!
قسەی خوایان حەشار داوە،
لێوی دێویان هەسار ناوە!
ئەوەی لەم ناوە نووسرابوو، هەر چیم کرد، بۆم نەخوێندراوە!
لەو تەلارە، لەو کۆشکە پڕ بن دیوارە،
لەو ڕەشماڵە بێ هەوارە،
بە چاوی خۆم، ئەتۆم بینی! فریشتە بووی!
کەچی منت نەناسییەوە،
سەیرت کردم، لە نیگام زۆر ورد بوویەوە!
منت بینی، دەمامکێکم بە ڕوودا بوو،
خوری و گنجی لێ سووا بوو،
هەزار ماکی قێزەوەنی پێ لکێنرا بوو!
لەو کۆشك و تەلارە گەورە، بەهرەیێك نەهاتە بەر چاو،
وێنەیێك هەڵنەواسرابوو!
نەشدەوێرام بانگت بکەم، ئاخر ڕوخسارت گۆڕا بوو!
١٩٨٠/٥/٢ - هەولێر.

## شـــەو

شەوی تاریك و تەنیایی،
هات سەنگەری بەرزی دڵی داگیرکردم!
داڵم بووە باڵندەییێك،
لە بەندی پەراسووی سینەم،
هاتە دەر و لە شەققەی باڵیدا؛ فڕی!
یێکە یێکە، هەر حەوت ئاسمانی پشکنی،
لە بەرزایی، جۆلانەییێکی هەڵچنی!
بەڵام لەورە، نە حەواوە،
لە تیشکی خۆری خواردەوە،
نە حەواوە!
تریفەی مانگی وەرئاڵاند،
نە پساوە!
ئەستێرەکانی یێك بە یێك، هوناندەوە!
نە حەساوە!
ناچار، وەکوو ووشت کرابێت،
خۆی لە ناو سینەم کوتاوە!
دڵی سادەم، ئۆقرەی لێگرت!
ئۆخەی، سەد ئۆخەی؛ گەڕاوە!

١٩٨٠/٨/٤ - هەولێر

**ڕۆیشتی**

درەختە بەرزە پیرەکەی، لە گۆڕستان،
ئێستا سێبەریماڵتە!
پاش مەرگی تۆ، نەمامێکی ناسکی داوە!
هەر چەند جاری، دێمە دیداری گڵکۆی تۆ، لە بەر دەرگا؛
زەردەخەنەیێکی زۆر ناسك بۆم هەڵدەکا!
گوڵم، گەلێك لە گەشانەوەی تۆ دەکا!
لێی دەچمە پێش،
سەرم نزم دەکەمەوە؛ تا لێی ڕەت بم!
ئەویش، گوڵێ!
پڕ لە ڕیز و خۆشەویستی،
بە لەنجە بۆم شۆر دەبتەوە!
مرواریيە ناسکەکانی قژی ڕەشی
بە شێنەیی و خۆشەویستی،
بە سەر سەرم شۆڕ دەبنەوە.

١٩٨٠/٧/٢٠ - هەولێر.

## ١٩٨١

**زەمـــان**

**کۆرپە -**

کۆرپە بووم، برسی بام، دەگریام؛

کپ دەبووم کە شیری خاویان لە دەم دەنام.

**منداڵ -**

منداڵ بووم، پێخاوس، یێکەم جار کە پەنجەم هەڵقۆچا،

ڕامکردە لای دایکم، ئەویش برینەکەی بۆ پێچام.

**گرفت -**

باوکم بوو یێکەم کەس، گرفتی بۆ نواندم!

بخوێنە بە گوێیدا چرپاندم،

پاشان چوو، سیپارەی بۆ هێنام!

**شادە هێنان -**

شادە هێنان؛ ئیسلام بوون، نوێژ کردن، بۆ حەج چوون،

ڕۆژووی ڕەمەزان، زەکاتی هەبووەکان، بۆ برسی و هەژاران.

بە ڕاست و جوانی، ڕێگەی بۆ دانام!

**ئامۆژگاری -**

باوکم، هەر بە خۆی، پێی گوتم: ڕۆڵە، خودا بناسە!

داهێنەرە، پارێزەرە، سەر و بەری هەموو باسە.

وا لێم شێوا! ڕاست ڕاوەستام!

**پرسیار -**

پرسیارم کرد ووتم:-

باوە! خوا لە کوێیە؟ ئەو مەزنەی باسی دەکەی بڵێ کێیە؟

گوتی - ڕۆڵە، خوا خۆی خوایە! هەر کوێ بڵێی، ئەو لەوێیە!

هەڵوەستەم کرد؛ هێندە ترسام!

**ماندوو -**

گەرووی باوکم ڕاست وشك بوو، ئارەقەی ڕەش و شینی ڕشت،

لە قسەی ئەو نەگەیشتم لە ورد تا درشت!

ناچار ملم خۆمم کەچ کرد؛ لەبۆی دامام!

**ئاسمان -**

پرسیارە بێ لانەکانی، هەمووی پەیوەست بوون بە ئاسمان!

لێم بوونە مەیل؛ بوونە ئەستەم، پرسی ئاسان!

هەر بێ وەڵام بۆم مانەوە؛ قسەی پەند و مەیلی زۆر جوان!

هاوار؛ هاوارە حەپەسام!

**ساڵان -**

ساڵان، لە جاران، خێراتر هاتن، خێراتریش چوون!

منداڵ گەورە بوو، بووە پیاو زۆر زوو؛

داهێنەر، ڕاهێنەر، خۆری گەش، یان سێبەر،

هەر چۆن بێت، مرۆڤ بوو،

لە شادی دەگەڕاین! ئاخ! ژیان هەر تاڵ بوو!

ماندوو بووم؛ نەوەستام!

**نەخۆشی -**

کەلــــە زل! هەست بتەو! زەغەلی دایە مۆخ!

ناوەندی ئەم ژینەی کردە ڕۆخ!

واق وڕمام! هێزی سەر زەوی هاتنە هاوارمان!

نەهێلن بڕواتن، گوڵی ژیانمان،

گوڵ سیس بوو، من نەمام!

**دکتۆران -**



دکتۆر و زانا، زۆر بە دەست و برد،
کاریان دەست پێکرد!
پشکنینیان کرد، نەبێتە هاوار.
زۆر هەوڵییان دا، هیچ کۆڵیان نەدا،
سەرەدەر نەبوون،
شێوان لە باسدا!
گشت دادەمان،
زۆر هوڕ دەبوون!
تیچاویان دەدامێ!
سەر لە نوێ دەگەڕان،
بۆ ئەنجامێ!
ئەنجامی ڕووت و ڕوون،
پێم نەدرا، تا داتەپام!

١٩٨١/٥/٨ - هەولێر

**شیعر**

ئەی شیعری تەڕ! دێڕی ناسك!
چۆنە وا لێم بە کێو کەوتی؟
تۆراوی وەك بێچوە ئاسك!
خۆت دەزانی من هیچ کاتێك ڕاوچیت نەبووم،
تێنووی بەیتی خەنیت نەبووم،
بۆ پێشبڕکێی خەونی سەوزت، هەرگیز نەچووم،
ئەی ئیلهامی خوای جوانی،
خۆت دەزانی،
تۆ چەندە بۆم دەستەمۆ بووی!
ئاشنای خامە و زۆر کەمۆ بووی!
کە بە ناو مێشکمدا دەچووی،
نەرم و نیان وەك پەمۆ بووی!
هۆ شیعری گوڵ!
مۆزیقا سۆزی لە تۆیە،
ئاواز، پیرۆزی لە تۆیە!
تۆ نەبی ڕووناکی درۆیە!
تۆ نەبی ڕاستی کەم هۆیە!
بۆم بەڵگە بووی،
عەقیدەیێکی چەسپاو بووی،
هەر چەند زۆرتر دەسووتێنرای،
ئەو هێندە پتر هەڵدەچووی!
هۆ شیعری مەل!
بۆ وا لە من، چوویتیە سەر کەل؟

منت تەنیا جێهێشتووە!
سوارێکی بە بێ شمشێر، لە مەیدانێکی بێ سەنگەر!
بۆ وشەیێك بە ئاسمانێ هەڵدەگەڕێم،
بۆ پیتێکی ناو شیعرێکی بەختەوەری وا دەسووتێم!
هەست و دڵم داڕزاون،
وا تێك دەشکێم!
شیعرۆکەی تەڕ! سەنگی زەمان،
هاتتە سەر شان،
باڵتەی گەردوون، هێدی هێدی وا دەهاڕێ، مۆخی ئێسقان!
هاوار بۆ کێ بەرم شیعرۆ؟
من کێم هەیە لە چەشنی تۆ؟
گەر تۆ نەبی؛
دەریای خەونم وشك دەبی،
کانی خامەم لێ چك دەبی!
لێبووردنم بە ڕك دەبی،
بێستانم بێ برك دەبی!
هاوار هۆنراو!
وەرەوە مەیدانی سواران،
ببە بە خوا، بە پێغەمبەر، ببە گەوهەر،
بژیێنەوە عیشقی دڵبەر!!
بۆم ببە با؛ ببە بە دەنگ!
ببە باران، بۆم بە بەزەنگ!
بە سروودێکی دژە جەنگ!
هۆ شیعرۆکە!

دەزانم ئەی شیعری هەژار!
تۆش وەك مرۆڤ؛ هەزارانت دراون لە دار!
تۆش قلێکت کامەرانە،
سەدانی دیت مردنیان لە نێو چەوانە،
تۆش ڕۆژێکت سەرکەوتنە،
سەد ڕۆژت کۆڕی گریانە!
شیعری شەوی، ژینی زەوی!
هەزار بڵندت کرد نەوی؛
قەزات لە شیعری مەولەوی،
پاشی سەد ساڵ تیری عەنبەر؛
هێشتاکە دڵۆ ناسرەوی.
پەڕەسێلکەی شیعری شەیدا،
شەم دیسان گڕی تێم بەردا،
دەخیلتانم وەك دێوانە،
کوشتەی ئۆفیك، باوە تایەر، حاجی، خانی،
کێتان بە دەردم نازانی؟
ئێوە نەبوون هاوارتان گەیاندە ئاسمان؟
دەی! ئەمجارەش هەموو وەرن،
گەش بنەوە هەڵنەوەرن؛
وەرن دەستبەردارم مەبن..
وەرن! وەرن؛ تۆزێ هاریکاریم بکەن،
ڕستەیێکم بۆ ڕێك بخەن،
بیهۆننەوە، برینەکەم بپێچنەوە!

١٩٨١/٥/١٣ - هەولێر.

## شـــەو

چەند شەوێکی لەمەوبەر بوو،
تەنیایی هەر وەکوو زۆردار،
لە سەر کورسی مێشکم دانیشت!
ئارەزووی بوو،
گەلێك ڕشت بوو فەرمان بکات،
تا بجوێ وەکوو بنیشت!
ناچار تیشوەکانی مێشکم،
وەکوو ڕۆستەم هاتنە مەیدان،
لێی هاتنە دەست؛
تەنیایی کەوتە بەر نێزان،
بۆم چەماوە، داهاتەوە هاتە دۆڕان،
ئەوجا پاشتر، پەیتا پەیتا توایەوە،
هەرکە دەیویست بژیێتەوە، دەبڕایەوە،
جا هزر و هۆش، بووژانەوە،
وێنەکەیان بۆم سڕیەوە،
پاشان لە شوێنی تەنیایی،
هەتاو تروسکەی دایەوە،
ئەم هۆنراوەیەی بۆم هێنا و نووسیشیەوە!

١٦/٦/ ١٩٨١ - هەولێر.

## بێرە

بێرە! بەرۆكت ڕووت كە؛ نە شەرمە؛
بمنێژە لە ناخ ئەم سینە گەرمە!
١٩٨١/٨/٥ - هەولێر.

## خەیاڵی شەو

ئەوا درەنگە ژینم خەم و خەیاڵە! لە دەستیان، گەلۆ، حاڵم بێ حاڵە!
شەو ڕاشكاوە و یاران خەوتوونە؛ دڵـەی بێ ئارام، لە هات و چـوونە
هەر خورپە دو جار ڕامدەتلەكێنێ، یادی شیرینیت لـــە بـۆ من دێنێ!
دەمێك دوو جاران تۆم دێیەوە بیر لە بەندی یادت، ئەسیرم، ئەسیر!
١٩٨١/٩/٢٣ - هەولێر.
سعاتی ٢ ی بەیانی بوو!

## كانـــــــــی

وەكوو كانی، لە ناو هیشكەتی ژیانم، هەركە دەربووی،
بیابانی ناو فیكرم بوو، گەشایەوە!
بەیانی بوو گزنگی دا، كە هاتەوە،
خۆشەویستیت، كانییێكی پاكی ڕوون بوو، لێوی تەڕ كرد؛
دڵی كزی بووژاندەوە!
وردە وردە دەردی زەمان، لە ئێسقانم دەردەكێشێ،
وا ئومێدی كامەرانی هەستاندەوە!
خەمی كۆنی ناو ژیانی، زۆر بە نەرمی، ڕەواندەوە!
١٩٨١/١٠/١ - هەولێر.

## جهــان

دەگەڕێم، گەلێك بە وردی،
لە سەر نووكی خامەم بجمێ،
باسی وردەكاری و جوانیــت،
هەمـوو چاكەكانـت باس كا
خـۆت شایانی پێزانینی؛
خۆت دڵێكی ناسك و گەورەی
دەمـت شەكری لــێ دەبارێ
لێوت ڕەحمـە، مەرحەمەتـــە
نەرم و نۆڵ و ناسكە پەنجەت
دڵ، بۆت وا بۆتـــە پەروانـــە
هەر تـــۆ دەبینم لـە جیهان،
تۆ خـۆت خۆشـــی ژیانمـــی،
لە شیعرێكی جوانی كوردی
قەڵاتێك بێ، هەرگیز نەڕمێ
لە بەیتێكیا بێـت، بتوانیت
جێ پەنجەكانت پێناس كا
خۆت لەناوبەری ئەسرینی
تۆ ڕەحمەتێكی؛ پڕ بەهرەی
ئامێزت خۆشی بەهـــارێ
ماچت گەورەیی و قیمەتـە
سەمایێكی خۆشە لەنجەت
لە دەورەی تـۆ لە ئاسمانە
دڵـم هـەر هی تۆیە، جهان
چێژ و هەسـت و گریانمی.

١٩٨٢/١/١٠ – هەولێر.

## گوڵ و گوڵدان

ئەگەر تۆ جارێك ببیتە گوڵ؛
من دەیان جار بۆت گوڵدانم،
گەر ڕۆژێك بۆم بوویە دڵ؛
بۆ تۆ سینەی عاشقانم،
کاشکا جاریك دەبییە شیعر؛
هەر ئەو جاری، بۆت (گۆران)م،
ببیتە مەل، بۆت دەبمە باڵ،
ببیە دیمەن؛
بۆ دیدارت من خۆم دەبمە دوو چاوی کاڵ،
گەر کەڕەتێك هات بوویە دەنگ؛
ئەو کەڕەت بۆ تۆ، زمانم.
ببیە نەناس،
چارەنووسی نەناسانم!
ببیە جەستە، بۆ تۆ ڕووحم؛ بۆ تۆ گیانم!
گەر ببیە خۆر؛ بۆت ئاسمانم،
وا پێت دەڵێم بە دڵ، بە هۆش، بە زوبانم،
هەر تۆی سۆزم، خزمم، هۆزم، تۆی ژیانم!

١٩٨٢/٢/٢٧ - میسل

سعات ٩:٥ بەیانی - وانەی تەرجەمەی تەحریري.

**نەشتبینم هەر دیاری**

بە ڕێکەوت، ڕۆژێك نەتبینم؛
ئەو ڕۆژی، تاریکە ژینم؛
ئاخر گیانە، لە ناو مێشکم، پەیکەرێکی، داتاشراوی،
لە سەر تێشووەکانی جەستەم، چاپ کراوی،
گەر بزر بیت،
دیار نەبیت،
هەر دەتبینم!
کێو و چیا، لە بەر چاوم بزر دەبن؛
کامەرانی و پێکەنینم لە بیر دەچن،
تۆ وەك کەس نیت،
خۆ شتێك نیت، لە بیر بچیت؛
نەشتبینم، هەر دیاری؛
تۆ ئەستێرەی هەستی منی،
جووڵەی هەموو جەستەی منی،
تۆ گۆرانی و بەستەی منی،
گرژی هەموو دەمارێکی،
کزەی جەرگی،
گڵپەی دڵی، بزەی لێوی، بینای چاوی،
تۆ ئەوپەڕ مەبەستی منی!

١٩٨٢/٤/١٤ - هەولێر

**سامناك**

نەخۆشی سامناك، ئەژدیهای خوێن خۆر
که چنگی گیر کرد له ناخ ئێسقانت
تریسکــەی هیوای بــڕی بــــه جارێــك،
له سەر کوڵمەت و نــاو دیدەکانت،
وا بووه فایبەر نــاو مۆخــی ئێســـــقان،
ژان و ئــــازاری بووینــــــه ژیانـت،
که تەوەزەلی، ناخ ئێسقانی گرت
خوێن بۆ تۆ بووه خواستی زمانت
خواردنەوه و خواردن گردفتیان نەبوو
ئاوی حەیات بوو؛ بۆ بوون و مانت،
خواستی ڕەوا بـــوو بـــۆ بەردەوامیت
پێویستییان پێت بــوو، منداڵەکانت،
هەزار ساڵی دیش مابای بەم جۆره بای
تیمــــارم دەکـــرد من زامەکانت!
ڕۆیشتی لـــەو ڕۆژ، پـــتر لـــــه ڕۆژان
پێویستیم پێت بـوو، بۆ بەرخەکانت
ڕۆیشتی! جێت هێشت؛ ماڵی وێرانــم
ئاوارەم بێی تــۆ، بێی قسەی جوانت
١٩٨٢/٤/٢٧ – هەولێر.

## کۆرپەکانم

کە ئارەزووی ژیان دەکەم،
خوێنمژانی دنیا هەموو،
کەڵبەکانیان لێم تیژ دەکەن!
کە ئارەزووی مردن دەکەم،
گاز لە ئێسقانم گیر دەکەن!
پەرییە ئێسك سووکەکانی دنیا،
بۆم دەگرییێن!
گۆرانی ژیانم بۆ دەڵێن!
کۆرپەکانم، ژیان واتا، جگەرسووتان؛
لە بیرتان بێ!
مردن واتا، سەر شۆڕکردن!
ئەو داڵەی پندی پێوە بێ،
هەرگیز دەبێ بە پێوە بێ؛
ئەو گەمبۆڵەی گوێچکەی نەبڕن؛
نابێت ڕانی پێ بسپێرن!

١٩٨٢/٨/٢٥ - هەولێر.

## زانکۆی سلێمانی

بۆ قوتابییە ڕاپەڕیوەکانی زانکۆی سلێمانی لە هەولێر.

دار بەڕووەکان،
لە قووڵایی ئەم خاکەدا، ڕەگەکانیان داکوتاوە،
بە بۆرە ناپیاوی ڕژیم، قەت قوت ناکرێن!
مست لە درێشە دەکشێتەوە؛ قەت نەترسێن!
شۆخەکانی قەڵای زانکۆی سلێمانی؛
لاوەکانی شاری هەڵمەت و قوربانی،
ئێوە بەرزن هەندەی لووتکەی ئەزمڕ بەرزن؛
ببنە چیا؛ شەنگەکانی شارەکانی کوردستانی،
ئێوەن هەموو، بەرانبەری بەعسی دوژمن،
خۆڕاگرن؛ پێ داگرن!
لە ناو جەرگەی شاری هەولێر،
یێک دەست، یێک دڵ،
ئێوەن مێژوو دەنووسنەوە؛ ئێوەن دلێر؛
گەنجەکانی قەڵادزێ و کۆیە و کەرکووک،
ژێردەستانی گەرمیانی،
هاوڕێیانی مل بە پەتی هەڵواسراوی ناو شارەکان،
ئێوەن خۆتان، ڕزگار دەکەن نیشتمانتان،
دەی هاوارە،
ئێستا کاتی تۆڵەی شەهیدی ناو شارە،
لەمەودوا ڕێگە بە بەعسییان نەدەن، بێن و بکوژن لاوانی کورد،
نێلن بمژن ماندووبوونی لاوانی کورد؛

چیتر نەپژێ، مێشکی زیندووی کچانی کورد؛
دەبا نەڕژێ خوێنی گەشی گەنجانی کورد!
پێیان بڵێن -
لە کوردستان دەست هەڵگرن،
دەی لەم ناوە هەڵیانبڕن؛
با چیتر کورد سەر نەبڕن!
پێیان بێژن -
مافتان نییە،
کە هیچ کوردێك زگ بدڕن!
بۆتان ناکرێ،
وەك قەڵەڕەش، بێن بقڕن!
دەی گەنجینە،
کات کاتی ئێوەی نەبەردە،
هەر ئێوەشن، ئازادی بۆ کورد دەکڕن!
دەست دامێنتان، یێکتر بگرن!
ئەم خەباتە با سڕ نەبێ، نەمرێتەوە!
تووڕەیی گەنج نەبڕێتەوە!
خوێنی (کەژاڵ)، قەت لە بیرتان نەچێتەوە!
زانکۆ بمرێ؛ گرینگ نییە؛ دەژیێتەوە!
زانست بمرێ، گرینگ نییە، لاوی کورد زانست دێنتەوە!
ئەمڕۆ لە بن دەستی بەعس، با هیچ نەبن!
بەیانی زوو، ئەم زانکۆیەی سلێمانی دەژیێتەوە!
پڕی زانست دەبێتەوە.

١٩٨٢/٥/٣ - هەولێر.

## هاواره برایان

له سەر گۆڕی شەهید عبدالقادر عبد الحمید خوێندمەوه!

دەنگم هەڵدەبڕم، ماڵی وێرانم — بانگم نایگاتێ، دووره کاروانم!
فریام باوه گیان، هاواره دایه — بمگەنێ برا و خزم و دۆستانم!
هاوار دەبەمه بەر شاری هەولێر؛ — بگەن بە فریاد، هاووڵاتیانم
تیری نەزانان، دای له کەلەکەم — برژاندی جەرگم، دڵم، ئیسقانم!
هاواره، له خۆم بێ دەسەڵاتێ! — هەر دەنگ هەڵبڕم فریا نامگاتێ
خوێن له برینم دەچۆڕێتەوه، — دەشزانن دەمرم کەس گوێم ناداتێ
دکتۆر له شاران، برینپێچ دوورن — پەنجەی ئەجەلیش، شل نابێ ساتێ
بڵێن بە کوردان، با له پاش مەرگم — له پزیشکانیان نەوێ ئاواتێ
هاوار، هاوڕێیان، دووا هاواره، — کەس دیار نییه، لەم نزیك شاره!
زۆر ئارەزوومه، هەمووان ببێنم، — ماڵ ئاواییه، خزمان، ئەمجاره!
دەڕۆم و لێتان دیدار حەسرەتم؛ — ئاواتی زۆرم بۆ خاکه، دیاره!
دەمەوێ دەستم هەر له ملتان بێ، — سەفەر درەنگه و ڕێگاش بێ یاره!
ئەی دەستی بەدکار، ڕەفتار درنده — ئەوەی تۆ کردت، نه کاری مەرده!
له خۆر هەڵاتی هەولێر وا ڕۆژت — لێمان ئاوا کرد، بچیت بەم دەرده،
ئێمه بە بێ چەك، ئێوه پڕ له چەك، — پارسەنگی ناڕێك، نه کاری کورده!
چۆن دەستت نەشکا، ماڵی وێرانت — دەك ببیته پەند، لەم عارد و بەرده.

١٩٨٢/٨/٢٥ - هەولێر.

## بۆ قوتابیان

### وەرزەکان

سەر تا سەری کوردستان، سارد و سەرمایە زستان
بەهـــار کاتی گوڵانـــــە، ڕۆژی بەزم و سەیرانـە
وەرزێکی گەرمــە هاوین، بۆیێ ئـارەق دەڕێژین
پایـز، گەڵا ڕێزانـــــە، پێویستی بــە بارانە!

### کتێب

کتێب بەهرەم پێ دەدا؛ زانست، هونەر مۆزیقا،
بە هۆی کتێب دەزانم، بە ڕاست چییە فەرمانم!

### ژماردن

یێك، فێربوونی ئاسانـــە! لەگەڵ دوو، وەك برانـە!
یێك و دوو دەبن بە سێ، ڕاست بە؛ لامەدە لە ڕێ!
سێ کۆ یێك دەکاتە چوار؛ وەرزی ساڵـن، بە ژمار.
پێنج سەرکۆی دوو و سێیە، وەك پەنجەی دەست و پێیە،
شەش، یێك لـە پێنج پترە، چەنـد بخوێنی چاکترە.
حەوت دەبێتە یێك و شەش، بــژی قوتابی دڵگـەش.
ئەوەی بنووسی تا هەشت ژیانی دەبتە بەهەشت.
ئینجا فێر بە؛ نـــۆ و دە، پەردەی تاریکـــی لادە

١٩٨٢/١٠/١ – هەولێر.

## ژیان

بەس نەیشێوێنن؛ ژیانمان خۆشە
هەناو دەکوڵێ؛ دڵ پڕ لە جۆشە
بـا هەر لــە دنیا، کانی هەڵقوڵێ
زەمان بێ ڕەحمە ئەسرین مەڕێژە
کاروان هەر دەڕوا ناگەڕێتــەوە
زۆر گوێی پێمەدە زەمان خرۆشە؛
ئێستا و داهاتووی خۆم و وڵاتم
لە ئاوێنــەی ڕوح، ڕووناکی پۆشە.

١٩٨٢/٨/٢٥ - هەولێر.

## تابلۆ دڕندەکان

له ژماره ٢ی گۆڤاری (نۆژەن)ی مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٩٢ بڵاو کراوەتەوە.

**ئەم تابلۆیانە،**

هەرگیز، لە هیچ گەلەرییەك ڕێگەیان نەدراوە هەڵبواسرێن و نیشان بدرێن. ئەمانە وەك هیچ وێنەیێکی دیکە نین؛ چونکە هونەرمەندان نەیان کێشاون! بەڵام هێشتاکە لە هەموو تابلۆیەکی دیکە سەرنج ڕاکێشترن؛ چونکە ڕاسترن.

**تابلۆیەکان**

ڕەنگەکانیان - تۆزی بەر پێی پێشمەرگەیە.

فرچەکانیان - قامکە قژی دەسکەنە کراوی ئەو کیژۆڵە نامرادانەن، ئەوا لە بەندە تاریکەکانی ڕژێمی سەددامی، لە بری باب و برا پێشمەرگەکانیان، بە دیل گیراون!

خامەك[1] - تابلۆکان لە سەر ئاسۆی گەشی ئایندەیێکی ڕووناك نیگار کێشراون.

دەستە ڕەنگینەکان - پەنجە قوتکراوە، ناسکەکانی کچۆڵە کوردە چاوگەشەکان، تابلۆیەکانیان کێشاون!

**پۆرترێت**

ئەو گوڵەی ڕەگی لە لێواری جۆبارێکدا بکوتێ، بێگومان گەڵاکانی ناسك و خونچەکانی گەشاوە دەبن!

**حەیران**

حەیران لە دووری! هۆ، هۆ باوە، هەر تۆی جێی شانازیم، ئابڕووی نەچووم، سەری بەرزی ڕووە و دوژمن نەوی نەبووم، هەر تۆی، باوە،

---

[1] - خامەك – قوماش!، پارچە!، کووتاڵ.

تۆی باوه گیان، دڵۆپه ئاوونگێکی، له ناو پێڵووم قه‌تیسماوی، بۆم نالوێ داڕسێته سه‌ری کوڵمه‌م.
تۆ زاخێکی له ناخ قوڕگم جه‌نه‌ت[1] گرتووه؛ لێم ناگه‌ڕێی نه‌ختێك بگریم!
باوه، باوه،
تۆ شیاوی ده‌سته‌کانت بۆ ماچ بکه‌م، ناوت بینم، هه‌ر ده‌م یادت بکه‌مه‌وه. به‌و یاده خۆش و ناخۆش و ترش و شیرین و تارانه‌وه، به هیوای ڕۆژی ئازادبوونی کورد و ڕزگاربوونی کوردستانه‌وه، جه‌مه‌دانییه‌کت بۆ بهۆنمه‌وه، باوه! کڵاشێکت بۆ بچنم، کیسه‌یه‌کی کری[2] تازه‌ت، بۆ توتن و دارجغاره و په‌ڕی بافره‌ت، بۆ بدرووم!
باوه؛ باوه!
ڕاسته تۆ باوکێکی لێهاتووی؛ که‌م که‌س هه‌نه، وه‌ك تۆ بکه‌ن، وه‌ك تۆ بن! تۆ به خوێنی پاك و گه‌شی دڵی گه‌وره‌ت، بۆ ژێرده‌ستی ڕۆڵه‌کانت، کفن ده‌درووی! به‌ڵێ، باوه!

**تابلۆ ١**

ئێوه هێشتا سفت و سوێی جه‌سته ماندووه‌کانتان دانه‌مرکابوونه‌وه.
تێر خه‌وی خۆشی به‌ر تریفه‌ی مانگه‌شه‌وی ئازادی نه‌ببوون.
له زیخ و چه‌وی به نوێژی ئه‌وان هه‌ردان ڕانه‌هاتبوون.
به‌ڵێ، ته‌نیا چه‌ند ڕۆژێك بوو، سێبه‌ری چه‌تری سامی ئێوه، له سه‌ر سه‌رمان ته‌نکه‌ی کردبوو؛ که لانه‌که‌ت، وه‌ك به‌رخێکی له ڕان جێماو، ڕه‌وه گورگێکی زۆر برسی، له هه‌ر لاوه، حه‌یران، باوه!
گه‌مارۆیدا!

---

[1] - جه‌نه: ڕق!، تووڕه‌بوون!، منداڵ جه‌نه ده‌گری.
[2] - کر: مه‌ره‌زی چنراو.

له دەرگاڕا، دوو دوو وێکڕا،
بێ شەرمانە، هاتنە ژوورێ!
له پەنجەرەکانڕا، لوولەی کلاشینکۆڤەکان ڕەوانەی ژوورەوە کرد!
له هەر لاوە، غەڵبەغەڵبیان پەیداکرد؛ له کۆڵانڕا، (لەك قیف، لەك قیف) دەنگی داوە!
دەنگیان گەیشتە بارەگای خودای گەورە، بە قوربانی خوابم، باوە!
ئەم خودایە بە هاوارمانەوە نەهات!
وەکوو گڕکان،
دابارینە سەر ماڵەکەت!

**تابلۆ ٢**

هەی ئافەرین لەو چاوانەی لە چاوی باز تیژتر، گەشتر، لە مۆڵەق مان و نەترووکان!
سەد ئافەرین لەو دڵانەی لە دڵی شێر چەسپاوتر و توندتر و خۆڕاگرتر بوون، یەك دۆخ مانەوە؛ نە لەرزان!

**تابلۆ ٣**

کارەبایان لە ماڵەوە لێ بڕیبووین،
شاڵاویان هێنابووە سەرمان،
هێشتا چوزەی هیوای ئێوە، باوە،
لە ناو ترس و تۆقاندنیاندا،
شکۆفەیدا.
لێیان ببووینە تۆپێك قین،
بە گڕکانێکی ژێرزەمین.
دەبێ نەمرم؟
باوە، ئەو ڕۆژە ببینم،

سەرهەڵدەینەوە و ئازادبین؟

**تابلۆ ٤**

باوە... هاااااواااااار.....

بە کەزی[1]یان منیان بە دووای خۆیاندا ڕاکێشا.

هاوار باوە!

جنێوی پیس، وەك ڕەوشتی بەدی خۆیان، بە دایکم دا.

هاوار باوە! پەنجەیان لە دوڕ چاوی کوڕە چکۆڵەکەت ڕاکرد،

کابرایەکیان، وەکوو هرسێکی دڕندە؛

هەر وەختبوو دیدەکانی شێرکۆ دەرکا.

کە ئەو لە خوا نەترسانە، شیرینیان دیت،

سپی و پەمبە و خورت و تورتە،

هاوار باوە! کراسیان لە جەستەی لادا!!!!

**تابلۆ ٥**

ئەفسەرێکیان بەو پۆستاڵە پیسە قوڕاوییەی خۆی؛

هەتا گرتی، شاپێکی لە قەدەمخێر دا و بەری داوە!

باوە، باوە، قەدەمخێرمان!

ئەو ناسکۆڵە، ئەو بەرخۆڵە،

ئەو دوو ساڵییە نەرم و نۆڵ و خڕ و خۆڵە؛

ئۆخەی، باڵاگەردانی بم، ڕاست هەستاوە!

**تابلۆ ٦**

لە بەر باران،

ڕووە و سەهۆڵبەندی زستان؛

هەر بە جلکی تەنکی خەوتن، ڕایان گرتین!

---

[1] - کەزی : پەلکە، پرچ.

یەکە یەکە بانگیان کردین؛
ڕق ببوە دۆزەخە گڕێك، لەو کڕێوە ناهەموارە،
پلە، پلە، گەرمی جەستەی هەوراز بردین!

**تابلۆ ٧**

تاك، تاك، لە هەموانیان پرسی -
ناوە چوارینەکەت چییە؟
ناوی دایکت؟ ناوی باوکت؟ مامەکانت؟ خاڵۆکانت؟
ناوی خوشك و برا و مێردی خوشك و براژن و برای وانیش؟!
لێیان پرسین ناوی دوو کەس لە برادەرانی هەر یەکێکمان، چییە؟
کار و پیشە و شوێنی گوزەرانی ئەوان، کوێیە؟
گاوەك پێمان پێدەکەنین. دەمێك سەریان لێ بادەداین.
یان لێمان گڕ دەبوونەوە.
تروسکەی خراپەکاری لە ناو چاویان چەخماخەیدا!

**تابلۆ ٨**

هەوار و مەنزلگەی تۆیان، لە دایکم پرسی، باوە گیان.
ئەویش هێشتا لێوەکانی نەترازابوون،
کە بە سێ هرسی زەبەللاح،
دایانە بەر زللـــە و شاپان!
ڕاستە خۆی کەوتە خوارەوە؛
بەڵام، باوە، باوەڕت بێت،
دایکم سەری، هەردەم بە تۆ بەرزی،
شۆڕ نەکرد و بە ڕاشکاوی، پێی گوتن -
- لە ڕێگایە، درەنگ و زوو دەگاتە جێ.
پرسیان:- کەی؟؟

تیی چاوێکی دایکانەی پڕ سۆزی دایە ئێمە و تێی گەیاندین کەی باوکمان دێتەوە ماڵ؛ کە بێیتەوە،
خۆر دەگەڵ خۆتدا دەهێنی و شەوی ڕەشیان ڕادەماڵی! هەر دێیەوە!

**تابلۆ ٩**

نەیانپاراستین!
دەستی خۆیشیان لە ئێمەمانان نەپاراست!
پاشان ، باوە، خواگیرانە، لێکیان کردین!
کاتی هاوێر کردنمان بوو؛ شێرکۆ و دلێریان ڕاپێچدا.
لەبەر جەرگ سووتانی خۆی، دایکم تەمایبوو بگریێ!
دلێر سەیری کرد و گوتی - دایە! ئەگەر زستان زەوی دانەڕزێنێ،
لە بەهاردا تاقە گوڵێکیش ناپشکوێ.
تا لە ئاسۆش کەڵێ دیار بێت؛
هەزار، هەزار هرسی برسی ئەژنۆی هیوام نالەرزێنێ!

**تابلۆ ١٠ یەك ڕەنگە**

سڵاو لەو بەندە تاریکەی ئیمڕۆ دلێری برامان، لەوێدا،
یادی چواردەمساڵوەگەڕی هاتنە دونیای دەکاتەوە.
لێرەش چاومان لە دیارییەکە، با ئەمجارە بۆ هەموان بێ.
با دیاری ئەمجارەتان، گۆلمێك گڵ بێ.
لەو مەڵبەندەی لە سێبەری ئازادیدا،
جۆلانەی ئاسوودەییتان، بێخەم، تێیدا هەڵواسیوە!
لەوێ بۆمانی هەڵێنجە، بیپارزنە، ئینجا بۆمان بینێرە!

**تابلۆ ١١ باڵندەیەکی سپی**

باوە... شۆڕە سواری ڕێگای دووری هات و نەهات، ئەگەر نووچەی ئێمەت بۆ هات؛ گوتیان - ڕۆڵەکانت بەندن، دیلن،

بە دەستی دوژمن زەلیلن.
ئێمە تەنیا جەستە دیلین. تەرم بەندین.
مەچەك لە كۆت داڕزاوین.
باوە، نانی پڕ لە كەڕەكیفە و نیسكە شلەی پڕ خوێمان دەرخوارد دەدەن، ناهێلن خزم و دۆستان و برادەرانمان ببینین،
هەر ڕۆژ یەك جار پێشاو دەكەین،
سێ سێ، چوار چوار، لە سەر یەك پەتووی تەنك دەخەوین!
تا بەیانی بۆمان ناكرێ هیچ كەلەكە گۆڕی بكەین.
سەرمامانە، برسیمانە، لە دنیای خۆش داپچڕاوین.
لە هەر كولانكەیەكەوە تروسكەیەكی ڕووناكی بێتە ژوورێ،
دەلاقەكەمان لێ دەگرن!
ئەگەر بێت و لە دەستیان بێ، بای خواش لێمان یاساغ دەكەن!
بەڵام، باوە، بە ساقەت بم، لە بۆ ئێمە، نەكەی، نەكەی، ورەی بەرزت قەت بەرنەدەی!
چونكە ئێمە هەست و نەست و بیر و باوەڕمان لاتانە!
ئەو باڵندە سپیە جوانانەی، وان لە سەر سەرتاندا دەگەڕێن؛
باوە، ئەوان فیكری ئێمەن. لە گەڵتانن.
هەر چالاكییەك ئێوە دەیكەین، مێداڵێكی سەرفیرازی بۆمان دینن،
بە ملی یەكەیەكەی زیندانیانی هەڵدەواسن.

**تابلۆ ١٢ خۆفرۆشان**

ڕۆژێك هێندە بەدلە سەوزی قەڵەو قەڵەو، هاتنە ناومان،
لێیان خواستین تا - {ڕێگای ڕاستیتان نیشاندەین!}
بەڵكو (الرئیس القائد) بە خێرا خۆی، دەتانبووری!
گەرنا، ئێمە ئەتك دەكەن!!

یەکسەر شۆخێك لێیان هاتە وەڵام گوتی -
ئێمە هەموو باش دەزانین، ڕێگەی ڕاست ڕێی ئازادیە.
ئێمە، ئێوەش باش دەناسین؛ پەلبڕ ئێوەن.
کاولکاری ئەم وەڵاتەن. ئێوە ڕێنمای دوژمنن.
هەی ڕیسوا بن؛ هاتوون ئێمە ڕیسوا بکەن؟!
هاتنی ئێوە بۆ ئەم زیندانە تاریکە، ناو-زڕانە.
بۆ ئێوە ئابڕوو نەمانە! هێمای دووبست پانی، پشت ملتانە!
دەمی (چارەنووسیان) بەستا و ئێتر هەرگیز ببڕای ببڕ، بۆ زیندانیش، نەهاتەوە!

**تابلۆ ١٣ جەنگێکی دی**

پۆلیسێکی بۆری مووسیس،
برۆ پانی، کەپوو فشی، سمێڵ هەر وەکوو کلکە گا،
کتومت دەتگوت ئەڕژەنگە،
لە کەلەنی دەرگاکەڕا سەری لێمان هێنا ژووری،
جا قیژاندی - کێ زلێخە؟
دایکم گوتی - ئەوە منم.
پۆلیسەکە دایە قاقای پێکەنینێ!
بەزەییم بە دایکمدا هات! سەد خەیاڵم هاتە سەری!
دەیبەن! وەك کچە قارەمانەکە نایهێننەوە؟! یا...
کابرای پۆلیس لێی مڕاندین:- دوێشەو، مێردەکەتیان بە دیلی گرت. لە شەڕ گیرا.
هەموو گێتی، بە یەك چرکە، داتەپیە سەر سەری هەموان!!

**تابلۆ ١٤ نەشیری حوشتر، نە دیداری ...**

چوار چێوەی کونی دەرگاکە،

ئیمڕۆش چەهرە زۆر پیسەکەی پۆلیسەکەی لێ دەرنەکەوت!
ئەی خودایە! دیداری ئا ئەم کابرایە، هەر وەك دۆزەخ وایە!
لەئەشکەنجە و کۆیلایەتی سەخت ترە؛ خۆی بەڵایە، ئاااااخ، خودایە!

**تابلۆ ١٥**

پۆلیسەکە پاش چەند ڕۆژێك خۆ ون کردن، ئەمڕۆ هاتەوە (سەردانمان).
کونە چکۆڵەکەی دەری وەکراوە، پۆلیسکە لێی مڕاندین:-
چەند ڕۆژێکە، لەبەر خاتری ئێوە، خۆم لێتان لا تەریك دەگرم.
زۆر زگم پێتان دەسووتێ، وەختە بگریم.

- ......!
- بۆ هیچ ناڵێن؟ بۆ وەڵامم نادەنەوە؟ دە بڵێن بۆ!؟

من گوتم:- ئم.
وتی:- سێ چوار ڕۆژ پاش بە دیل گرتنی، باوکتیان ناردە ژوورەکە.

- ......؟

**تابلۆ ١٦ (الغرفە)**

سەری خۆمم بردە بن گوێی پوور (خەزاڵ)ێ.
باوە، باڵاگەردانت بم!
پوورە خەزاڵ دایکی سێ لاوی شەهید و بزرێك و دووانی وەکوو ئێوەیە.
لۆکە وەکوو قژی خەزاڵێ سپیە!
دەشێ بڵێم:- لوقمان لەو فێر حیکمەت دەبێ.
گوتم:- پلە! غورفە چییە؟
هەناسەیەکی هەڵکێشا.
دەتگوت دەیوێ هەموو هەناسەکانی ژینی ئایندەی بکاتە یەك!

وە پێش ڕەوتی زەمان کەوێ، ئینجا پاشان، خۆی ئازادکا.
سەری خستمە سەر سینەی خۆی.
بە پەنجە پرچی داهێنام.
گوتی - کچم، مزگێنیت لێ! (غورفە) جێی کەڵەمێردانە!
هەر سێ کوڕم، لەوێ، چاویان کۆڵین، لە ئوتو دران،
تپلەکانیان بڕینەوە، نینۆکی پێیان هەڵکێشان.
باوەشی پوورە خەزاڵێ چەند گەرم بوو!
دڵی چەند بە گوڕ لێی دەدا!
نەغمەی دەنگی هێدی هێدی گڕی دەگرت!
گوتی:-
کیژم، لەوێ کوڕە چکۆڵەکەم پلەی شەهیدی لێ سەندن.
لەوێ، ئەو لە خوا یاخییانە،
حەبی میزهێنەریان دایێ؛ ئینجا نێرکیان بەستاوە تا شەهید
بوو.
هۆهۆ باوە،
بەندێ بەعسا، بەندەکا گەلە گرانە.
باوە، پلکە خەزاڵ، گوتی:-
ڕۆڵە، من باوکت دەناسم، ئەو مێرخاسە.
شەهیدبوونیش پاداشتی بەرزی یەزدانە.
تەنیا دەیدا بەو سەروەرەی کە شەیدای چاوی ئاسمانە!

**تابلۆ ١٧**

- کیژێ! باوکت لە پەیژەکان دەخرێتە خوار؛ فڕێ دەدرێ!

**تابلۆ ١٨**

- چوار پەراسووی لێ شکاوە.

**تابلۆ ١٩**

- له سەر شووشەی شیر و پێپسی و بیره و وێسکی ڕوودەنیشترێ.

**تابلۆ ٢٠**

- ئیمڕۆ چواره؛

له سەر کورسیەکی بزمارکوته، له ناو بەفراو بەستراوەتەوه؛

هێشتا نامرێ!

**تابلۆ ٢١**

- سەری باوکتیان تاشیوه.

له بەرزایی نۆ میترانڕا، دڵۆپ دڵۆپ، ئاو دەکەوێته سەر سەری.

پەککو! باوکت چەند کەللـــه ڕەق، ماڵوێرانه!

دەڵێی زمانی له زار نییه!

تەنیا هەر شەش ناوی داوه.

توخوا باوه! خوێن له ناو دەمارم مەیی! وا نەکراوه!

**تابلۆ ٢٢**

ئیمڕۆ، باوکت ئەشکەنجەی له سەر هەڵگیرا.

گوتم:- ئۆخەی!

پۆلیس گوتی:- ئاخر چونکه ئەمری ئیعدامی بۆ درا.

**تابلۆ ٢٣**

دایکم، دایکم!! یەکەم کەڕەت سەیری کردین.

لەرزی لێهات! هەژا و بەملا و ئەولادا چوو!

پاشی دەمێك یەك دۆخ وەبوو.

دەستی خسته سەر شانی من.

شیرین و قەدەمخێریشی له ئامێزگرت.

ئاگام لێی بوو؛ له ناخیرا، وا دەکوڵا، وا دەکوڵا!

ژنانه! دانی بە خۆی گرت.
ڕووی تێکردین و پێی گوتین -
بەرخی نێر بۆ سەر بڕینە.
ئەوا ئەو چوو؛ ئینجا ئێستا،
نۆرەی ئێوەیە، کوڕینە.
هۆ هۆ باوە...
دایکم نەیووت - (هۆ کچینە!)

**تابلۆ ٢٤**

زستانمان ئەوا بە سەر برد. لە دژی ئەوان، نەمردین.
جا هاوینە؛ وا بە بن ئارەقە کەوتووین.
بۆمان ناخۆش؛ هەموو لەڕ بووین.
شەنگمان لە بەردا بڕاوە.
بە ڕواڵەت، لە دەوری دەفری نانخواردن، گردە دەکەین.
دەنا، خۆمان فریو دەدەین.
هەندە دەخۆین، هەتا نەمرین!

**تابلۆ ٢٥**

ئەرێ باوە،
لەبەر چی کات لێرە هێندە تەوەزەلە؟
بۆ ڕۆژ لێرە هێندە درێژە و شەویش هەرگیز نابڕێتەوە؟ وەك ئەزەلە!

**تابلۆ ٢٦**

سێ هەزار و هەشت سەد و چوار سەعاتی دوور و درێژە،
لێرە دیلین!
نە مافی مرۆڤی جیهان،
نە مافناسان، نە ئیسلامان!

کەسمان لە سەر نەهاتۆتە قسە! باوە، کەسیان!

**تابلۆ ٢٧**

ئەڕژەنگە ماڵ میراتەکە،
زوو بوو، هەواڵی بۆ هێناین -

- ئیمڕۆ سبەی ئازاد دەبن.

گوتمان - بۆچی؟ چۆنە؟!

- سڵاو لە گیانی باوکتان.

تێگەیشتین؛ گشت حەپەساین!!
بەڵام هیچ کەسمان نەگریاین.

**تابلۆ ٢٨**

دڵم تەنگە! دڵم تەنگە!
زۆر حەز دەکەم تێر بگرییێم؛
ڕۆژی ڕووناکمان شەوەزەنگە!

**تابلۆ ٢٩**

لە سەر نووکی پەنجەی پێیان ڕادەوەستاین،
لە کەلێنی شیشە پۆڵا ئەستوورەکانی پەنجەرە زۆر بەرزەکان،
سەیری ئەوانەمان دەکرد،
کە دەهاتن بۆ سەردانی زیندانیە ئاساییەکان؛
جاری وابوو بە بیانووی ئەوانەوە پێویستیمان بۆ دەهاتن!
ئەمجارەیان هاوسێیەکی ڕاستەقینە؛ هاتە لامان.
کەمێك خۆراك،
دەستێك جل و بەرگی خاوێن،
خواردنیشی بۆ هێنابووین.
خواردنەکە، باوە باوە، مزگێنیشی دەگەڵدا بوو!!

نامەیەکی تێدا تەقەت، هەڵگیرا بوو.
بە پەلە لێکم هەڵوەشاند، دەستنووسی شێرکۆم ناسیەوە!
لە نامەکەیدا نووسیبووی -
ئەم کوڵیلکەی وا دەگەڵ ئەم نامە دەینێرم،
دیارییە؛ باوکە بۆتانی ناردووە.
بەری سێ ڕۆژ لە بناری (سەکران)ێڕا،
پێشکەش بە ئێوەی کردووە!

**تابلۆ ٣٠ دەنگی گەل**

لە دوورەوەی بەندیخانە،
هاوار، هەرا، نرکەیە و پێکدیدا دانە!
دەنگی سرووشی گەلە دێ، ئەو دەنگە دەنگی یەزدانە
دەرباز دەبێ، لە کەلێنی شیشەکانی ئەو پەنجەرەی لە ئاسمانە -
هێزی بیانی، بڕووخێ. دوژمن لە کوردستان، دەرچێ.
زیندانیان، با ئازاد بن. داگیرکاری وەڵات، ڕووچن.
دەنگی گەلە! دەنگی خەڵکی سەرهەڵداوە!
دەنگی هەڵدەبڕێ کوردی مەرد،
وا گەیشتە بن عەرشی خوا؛
خودا سەنەد!
بە ئێوە ئەستوورە پشتیان،
باوە، باوە،
مزگێنیت بێ، هەی باوە گیان!

٢٦/٢/ ١٩٨٢ - هەولێر.

## وەختە بگریم

دەڵێم بگریم!
بەڵام گەلۆ، پێم خەسارە ئەگەر ئەسرین داباڕێنم!
ئاخر گریان، ڕێگە لە دڵ کوتان، دەگرێت!
لەگەڵ هەندێش، وەختە بەختم پەردە بدڕێت!
بەڵێ هەڤاڵ، لە سەر ڕێگاییێکی سەختم،
لەم دەڤەرە، بەختەوەری ڕێی پێنادرێت!
ئەگەر دەڕۆم،
کات دەبێتە سەهۆڵبەند و دەبەسترێت،
گەر ڕاوەستم،
ڕێگا لە ژێر پێم ڕادەکا، باش دەخشێت!
لە دەست ئەم زەمانە وشکە،
مەگەر یەقەم دادڕێنم!
بەندە، بە خۆم، لەگەڵ هەموو ناسازێکدا، من دەسازم!
دڵم گوڵدانی هەمووانە،
لێوم حەیرانی ژیانە،
هەستم بۆ هەمووان، ئاسمانە،
هەقمە لە سەرتان بنازم!
ناوتان بێنم،
شیعر بۆ هەمووان بنووسم،
ئاخر من، خۆم،
لە بۆ هەمووان، وەك ئاوازم.

١٩٨٣/٣/٢٢ - هەولێر

## شیعرێك بۆ تۆ

له زانكۆی موسل دەمانخوێند؛ قوتابی ڕێزان خان (ناوی باوكیم  له یاد نەماوە) زانی من شیعر و میعر دەنووسم (وەك خۆی ووتی)؛ داوای كرد هۆزانێكی بۆ داڕێژم! جا ئەمەی خوارەوەم بۆ خاتری ئەو قەشەنگە نووسییەوە، كاشكا ڕۆژێك دەیخوێنێتەوە.

جارێك ووتت – (توخوا شعر و میعرێك بۆم بنووسە!)
ئەو كات هێشتا نەمناسیبووی،
بەڵام، جوانێ داخوازییەكەت لەلام ماوە؛
وەك ئاگر بوو، دەیسووتاندم،
وەك پەنگر بوو، هەر لە مێشكم دەترووسكاوە!
چەندین جار بوو، بە ناوی تۆ،
دەستم لە بۆ خامە دەبرد،
حوبری ناوی وا دەیبەستا، نەدەتوواوە!
یێك دوو ووشەشم دەنووسی،
(دەبووە میعر) و دەپساوە!
پاشان نووسین، كاڵ دەبووەوە؛
هەرگیز بۆم نەدەخوێندراوە!
خۆ دەزانم،
تۆ قەشەنگی،
ئێسك سووكی، ڕەنگاوڕەنگی،
وەك ئامێرێكی ڕابواردن،
هاوڕێت نییە لە بێدەنگی!
جا نازانم چی بنووسم؟
چۆن بنووسم؟ كەی بنووسم؟
لە كام دەڤەری ئەم شارە، بۆت بنووسم؟

له سەر پێیان ڕابوەستم،
یان دانیشم، جا بنووسم؟
له کۆتایی،
له پاش چەندین بگرە و بەردە،
وا دەرکەوتم له پشت پەردە،
بۆت دەنووسم هەر بەم دەردە،
ببوورە، گەر قسەم ڕەق بێت؛
ئەگەر له سنووردا ڕەت بێت؛
ئەگەر له بەر دەستم دەرچێت؛
بۆت دەنووسم - تۆ جوانی؛ باوەڕێك نی،
تۆ هەر گەڵای، بەژن باریك، درەختێك نی،
تۆ سێبەری، بەڵام کچێ، ڕەشماڵێك نی.
که یێکەم جار، من تۆم بینی،
له ناخ دڵم، مۆمێکم بۆ داگیرساندی!
ڕەتت دەبرد، که دیوارم بۆ چەسپاندی،
قینی ڕەشت له دڵدا بوو،
تا گەردەنم دانەواندی!
ئیتر ئەو ئاواتەم نەما بۆت بنووسم؛
چونکه ئەوەی له نێوان بوو،
هەر یاری بوو، هەر سەیران بوو،
بەڵام هەرگیز، دڵی خۆمم پێنەسپاردی!

١٩٨٣/٣/٢٢ - هەولێر

## گوتیان

هەزاران شیعر ڕێکخران، پڕ بوون لە وشەی ڕازاوە؛
هەزارەها سروودی جوان،
ئاوازیان لە بۆ سازدرا، مۆزیکایان، وەکوو ئاوە.
کام ووشە ناسکترینە،کام بەرماڵ خاوێنترینە، بە ناوی تۆ هان لەم ناوە!
۱۹۸۳/٤/۳ - هەولێر.

## وێنە و وێنە

بە دەستی خۆم،
لە هزری خۆم،
بۆ حەسانەوەی چاوی خۆم،
نێگارێکی پانۆرامای هەموو عیراقم کێشاوە،
چاك و خراپم ناسیوون، نەخشەڕێگام بۆی داناوە؛
بەڵام کە بە باشەکان هەڵنادەم،
لەبەر ئەوە، تا نەناسرێن؛ متمانە بە کەس نەماوە!
وڵات پەروەر، شای شەرەفمەند،
پاسەوانی جوامێر و پیاو و ڕەند،
نابێ ناپیاو بیانناسن؛
دەنا بە ڕاست، لەم سەردەمە، هەر هەموویان هەڵدەپاچن!
ناوی ملشۆڕەکان نادەم،
چونکە بە ڕاستی ناوێرم! ئاخر، ئەو هەموو سەرشۆڕە،
بە سووکی لە ناوم دەبەن! ئیتر قەت نامهێڵن لێرە!
۱۹۸۳/٤/۱۲ - هەولێر

## تەمـــا

ئێوارە بوو،
گۆی خۆر گلا؛ ئاوا دەبوو!
ملوانکەی زێڕینی هەولێر، دەپساوە؛ بزر دەبوو!
لە داخان، شار،
بوو بە دایناسووری زامدار،
ملی بۆ تاقی ئاسمان برد،
دەیهەویست قامکە هەتاوێك،
لە ملی خۆر، بێنێتە خوار!
مێرووولەکان کۆڵان، کۆڵان،
گەڕەك، گەڕەك، مزگەوت مزگەوت و ماڵ بە ماڵ
هەر دەگەڕان،
پەرت و بڵاو، وەك نەوت چووبێتە شاریان!
خۆر ئاوابوو،
تیشکێك ڕووناکی نەمابوو؛
مێردەزمە، کەوتنە سەما؛
ئایا ڕۆژێکی نوێ هەڵدێ،
یا نەمێنێ ئەوەی دەژی بەبێ تەما!

١٩٨٣/٤/٢٥ - هەولێر.

## گۆریە فرۆش

حکومەتی عیراق، لە بن دەستی سەدام حوسێن، هیچ ڕەحمێکی بە کورد نەکرد؛ لە هەموو تاوانەکانی گەورەتر، ئەنفال و کیمیا بارانەکانی کوردستان بوون، پاش ئەو ڕووداوە سەختانە، لە ڕۆژی ١٩٨٣/١٢/٢٠، سعاتی دەی بەیانی بوو، لە کۆڵانە پڕ کەند و کۆسپەکەی پێش مزگەوتی خانەقا، لە هەولێر، لە ناو دەلاڵخانەکەیدا؛ چەند منداڵێك هەڵتووتابوون، هەر یەکێکیان چەند گۆرەوییێکی لە پێش خۆیەوەی دانابوو، دەیانفرۆشتن؛ منیش پرسیارم لە کچێکیان کرد؛ دەمویست بزانم بۆ بەم بەیانییە ساردە لەوێ دانیشتووە، گۆرەوی دەفرۆشێت. ئەم قسانەمان دەگەڵ یێکتریدا کرد و قسەکانیش بۆم بوونە ئەم شیعرە؛ کە جگە لە خودی هۆنراوەکە، ڕوخساری مێژووی ڕەشی بەعسییەکان نیشانی خوێنەر دەدات.

سبەینە بوو؛
هەر چەندە زستانی هەولێر،
لە بەیانی، دەیقەسراندی،
بەڵام هێشتا،
کۆڵانەکەی لە پێش مزگەوتی خانەقا،
جمەی دەهات! دەیشێواندی!
ئەو کۆڵانە، مشتا و مشتی عەبدی خوا بوو،
کڕین، فرۆشتن، سەودا بوو،
دنیاش بێ ڕەحم سەرما بوو!
کیژۆڵەیێکی ناسکۆڵە،
لە هەشت ساڵ گەورەتر نابوو!
لە بەرانبەر چەند گۆریەیێکی چندراودا،
بۆ فرۆشتن، خەمناك، ژاکاو، هەڵتووتابوو!
لێی چوومە پێش، پرسیارم کرد -

- کچۆڵەکەم!
ئەم گۆرەوییە،
نرخی چییە!؟
ئەو کیژۆڵە خنجیلانە،
بۆ ئەوەی ڕێزم لێبگرێت؛ هەستا پێوە؛
منارەی بەرزی خانەقا،
کە دیتی کچە هەستاوە؛
ڕووە و باڵا وردیلەکەی، کڕنۆشی برد؛
پیرە قەڵاتی هەولێرێش، داچەماوە!
سەرما نەما،
بەفری سەر شەقام ڕەوییەوە!
شارەکەمان کشومات بوو،
لەم سەردەمەی حوکمی بەعس،
زەمان وەستا،
خودای بەرخۆدان گەڕاوە!
بە دوو چاوی زۆر بەریئی پڕ لە شەرم،
بە دەنگیکی کزی نەرم،
کورتە وەڵامێکی پرسینەکەی منی داوە -
- هەشت دینارە!
سەیری کردم؛
چاوەکانی بۆ هەڵبڕیم،
پێی خۆش بوو لێم دڵنیا بێت کە دەیکڕم.
هەر چەند بینیم،
لە چاوانی ڕووبارێکی لێڵی خەمناک،

لێزمەی دەکرد!
وەلێ هێشتا،
لە ناو هەردوو گلێنەکەی،
خۆری ئومێد هێرەی دەکرد!
پرسیم - کچم! چ قەوماوە؟
بۆ چی ئاوا بەم سەرمایە،
دانیشتووی گۆریە دەفرۆشی؟!
گوتی - هۆ خال! ما نزانی؟؟!
گوتم - کیژم، چ بزانم؟
فەرمووی - هۆ خال! ناچارییە!
باب و برا و مام و خاڵ و کەسم نییە!
گوتم - کیژێ، بێژە، چ لێ هاتن؟
فەرمووی - هۆ خاڵ، حکومەتێ خڕا برن!
نەزڤڕینەڤە! مخابن!
ئەزیش نەچار دێمە ڤێرە؛
دا ڤان گۆریا خۆ بفرۆشم،
هەر ڕۆ دایکم دێچێ دکەت،
داکوو مە بکەتن تێرە.
گوتم - کیژم! بێژە، تۆ کێی؟
هەر دوو ئەبرۆی وێکهاتنەوە،
ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوای بۆم شی کردنەوە؛
ئاخێکی گەرمی هەڵکێشا؛
بوڕکانێك خەمی دەرێنا!
پاشان، گوتی:-

- هۆ خال! ئەز کچەکا بارزانیمە،
جێهێشتییا ئەنفالیمە.
دنیا...دنیا؛
هەر لە زەمانی پێش مێژوو، هەتا ئێستا،
چرکە، چرکە
بە سەر کەللـــەی سەری کاسم، تەپا، ڕووخا!!
دڵم گریا!
عەقڵم گریا!
کوردستان لەگەڵم گریا!
دوژمنی زۆڵ،
بەعسی فاشست، چەند ملهوڕە!
چەند نەزان و بێ ئەزموونە،
چەند دڵ ڕەق و هێڕ و هوڕە!
بەر چاو ڕەشە،
لە عەقڵ و ویژدان، بێبەشە!
وا تێدەگات بە کوشتنی بێ تاوانان؛
وێران دەکات لانەی شێران؟
هیشك دەکات دیجلە و فرات؟
یان چۆل دەکات خاکی بارزان؟
بە بردن و فەوتاندنی گەنج و پیرانی بارزانی،
لە ناو ناچن شاخەکانی؟!
قوڕت بە سەر، مێژوو نەناس،
خاکی بارزان ئەو مێرگەیە،
داهێنەری پێشمەرگەیە،

وەك دار بەڕوو؛
لقێکی لێ ببڕێتەوە،
دووانی لە جێی دێنەوە.
بارزان چەقی کوردستانە،
ئێوە دەچن، بەڵام بارزان نابڕێتەوە.
***
گۆریەم کڕی، چوومەوە ماڵ،
لە ناو کیسە، دەرمهێنا،
ئارەزووم بوو لە پێی بکەم،
کەچی بێ ئەوەی ئاگام بێ،
لە سەر سەری خۆمم دانا.

١٩٨٣/١٢/١٩ - هەولێر.
بەر دەرگای مزگەوتی خانەقا - ناو بازاڕی هەولێر.

**چاوەکانت**

چاوەکانت دوو کانینە،
عیشقی جوان هەڵدەقوڵێنن
گەرماتی بە جەستەم دەدەن، دەمسووتێنن!
چاوەکانت دوو ئەستێرەن، تا بەیانی دەتریوێنن،
ئومێدێکی پڕ باوەشم بۆ دەهێنن
چاوەکانت
گوڵی عیشقم بۆ دەڕوێنن!
چاوەکانت،
سۆزن، شادین، ئاواز و ژین،
خۆشەویستین
هەست و هەڵبەست و پڕ نازن،
تروسکەنە، هەر خوناون،
بەفرن، بارانن، دەبارن!
بۆیێ سەرچاوەی ژیانن!
چاوەکانت.

١٩٨٣/٥/٩ - هەولێر.

## ١٩٨٤

### یێکەم دیدار

کە یێکەم جار چاوم پێتکەوت؛
وا هەستم کرد، خودا خەڵاتێکی کردم،
دڵم داکەوت،
ئومێدم خواست،
باوەشم بۆ تۆ واڵاکەم،
ئەم شارەمان پڕ ئاڵاکەم؛
پاشتر کە بۆم گرژییەوە،
زانیم گرەوم بردەوە!
زەردەخەنەت بووە خەیاڵ،
تا ئێستاش ڕەش نەبووەتەوە!
هەرگیز لە بیر نەچووەتەوە!
هەرکە دەستت لە بۆ هێنام،
تا بە دڵی خۆت ڕایهەژێنی،
ئەوەبوو، دڵمت ڕاهەژاند!
پەنجەکانت، نە پەنجە بوون!
درێژ، باریك؛
نەمامی سپی و بەهرە بوون!
ئەم هۆنراوەیان بۆ نووسیم،
دڵیان بردم؛ بەندیان کردم؛
سەربردەی ژیانیان گۆڕیم؛
ئاخر کەژێ، بەو جوانییەت، مەستت کردم!

١٨/٣/ ١٩٨٤ – هەولێر.

**خەونێك**

لە سەرەتا هەر میوان بووی؛
بە لێواری دەریای دڵدا ڕەتبووی!
شنەبایێکی زۆر فێنك، لەو ناوە هات؛
هەتا ئێستاش هەر بە دەشتی دڵدا دەڕوات.
سامالّت کرد ئاسمانەکان؛
دنیا هەموو بووە گەڵا و گوڵە بۆندارەکان؛
زەردەخەنەت،
ترووسکەی خۆری بەرپا کرد،
بەیانیدا، دەنگیان هات باڵندەکان.
دەستت هات و پەنجەی گرتم؛
چاوت هات و دڵی بردم!
زەویت هەموو ئاشت کردەوە؛
مرۆڤ و باڵندە و ئاژەڵ،
گەش بوونەوە.
لەو دەمیەوە،
هەستت وەك گوڵ گەشاندمەوە!
بوویتە هاوڕێم،
خۆتی بوویتە جوانترین دیاری ناو جێم،
لە بۆم بوویە زەردەخەنە، بوویە ئاوێنەی ناو ماڵم،
هەموو ئومێدی ژیانم، بوویتییە باڵم.
هەر وا دەژی، هەر وا دەبی، تاکوو مابم.

٢٤/٣/ ١٩٨٤ – هەولێر.

## سەیرە

سەیرە! ئەمێستا سەیرانە!
هەرکە ئەتۆم دێتەوە یاد،
لەم زەمانە،
هەر چەند ناوی مەزن هەیە،
لە یاد دەکەم!
چەند کارەساتی زل هەیە،
دەشرێنەوە،
تەنیا هەر تۆ بە یاد دەکەم!
شادی و خۆشی، گشت ناخۆشی،
تێکەڵ دەبن.
سەر و بنی زەمان هەموو،
پەلپەل دەبن!
باوەڕت بێت،
لەو دەمانی، تەنانەت خۆم لە بیر دەکەم!
تەنیا شتێك لە ئێسقانی بیروەریم، شك پێدەبەم؛
وەك پەیکەرێکی ڕۆمانی،
ڕاوەستاوە، باش چەسپاوە،
خۆت دەیزانی، باوەڕ دەکەم،
هەرگیز لە بیر ناشرێیەوە،
مەحاڵە تۆ بسڕێیەوە!
کە ناوت دێ، ژیان نوێ دەبێتەوە!

١٩٨٤/٣/٢٦ - هەولێر

**هەر خۆت**

دیسان هەر خۆت! زۆر لە گیا نەرمتری،
لە بەرخ و کار، ناسکتری،
لەو بارانانەی بەهارێ،
لە ئاسمانێ دێنە خوارێ،
خۆت، خۆشتری،
لە شیعری ناسکی نالی، بە جۆشتری!
تۆ خۆت هەستی، بۆ من سۆزی،
هەموو لە هەمووت جوانە، گەلەك قۆزی!
کانی ڕوونی، لە بیابانی ژیانی،
تۆ ئیلهامی شیعری جوانی،
لە شەواندا، بە خەیاڵت، تۆم میوانی!
باڵندەییێکی پەڕ باریك،
لە ناو دڵم هێلانەت کرد، ڕانەوەستای بە ئاسانی!
بووی بە پەری، بوویە ووشە،
منیش تەواو شێتی ڕستەم،
ئەو ڕستەیەش تۆی تێدا بێت،
دەیهۆنمەوە؛ دەبتە بەستەم!

٢٦/٣/ ١٩٨٤ - هەولێر.

## گەر دەمزانی

کاروان وا زوو جێمان دێلێ، بـە تەنیا، خۆم دەکەومـە ڕێ،
هانام دەبـردە بـەر فەلەك، بەر ئەستێرە و مانگ و مەلەك،
من خـۆم ببات و تۆ بهێلی تا گڵکۆکـەم بـە جـێ نێلی!
١٩٨٤/٤/٢٣ - هەولێر.

## گیپە

مەلا فەندی و باداوە پاتریك دەگەڵ عەنکاوە
هەمـووم هێنا تکایێ گیپە بێنـە ئـەم ناوە!
١٩٨٤/٤/٢٨ - عەنکاوە - هەولێر.
مامۆستا نەوزاد مەنسور گۆرگیس بۆ گیپە خواردن بانگهێشتی کردبووین.

## یادێکی تر

یادت، مەلێکی، پەڕ شینە،
تازە خەریکە باڵ دەگرێ،
لە ناو هێلانەی ناو مێشکم،
نە دەردەچێ، نە دەفڕێ!
ناوە ناوەش پەڕ و باڵی،
باوەشێن لە سینەم دەکا،
نەکا لە بەر گەرمی یادت، ئاگر بگرێ!
بیرەوەریت یادی گوڵێکی پەمبەیە،
هەردەم بە بەرۆکم وەیە،
کە شنەی دووریت هەڵدەکا،
زەنگی دەنگی تۆی لێدەدرێ!
یادت، کوورەی گڕکانێکە،
چی دەکەم سارد نابێتەوە،
بلێسەی شیعر دەردەدا،
یاغر یاغر دەژیێتەوە،
پیت پیت وشەی باڵا بەرزم پێدەچڕێ!
هەندێ جاریش ئەم یادەی تۆ،
لێم دەبێتە دۆزەخی خەم،
دەتوێنتەوە پۆڵای ورەم،
بۆم گیر نابێ، تا پاساری ئاواتێك دێ،
لە بۆم دەفڕێ!

١٩٨٤/٥/١٩ - هەولێر.

## دەردی من

دەردی من، ئازاری من، لە دووری تۆ،
سووتانی من، بێزاری من؛ کۆتا نایێ!
ئەگەر ون بی لەبەر چاوم، نابینابم!
گەر ساتێك دەرچیت لە بیرم؛
قەت لە مێشکم قایل نابم!

١٩٨٤/٥/١٩ - هەولێر.

## گەردەلوول

لە ناو گەردەلوولی خەمم، سەردەردێنی،
وەك کازیوەی پێش بەیانی، خەمرەوێنی؛
لە نــاو بەرداخی بادەمــدا، دەمدوێنی،
چونکە شەیدای دیدارتــم، دەمهەژێنی
٢٣/١٠/١٩٨٤ - هەولێر.

## عاشق

ئەگەر ڕۆحم ببتە عەزیا و تیت بئالێ،
چاوم ببێتە بۆڕکانێك؛ بتەقتەوە و شارێك لە دەستی بنالێ،
گەرووم ببێتە نەهەنگێك؛ گەر گۆی زەمین هەموو قووت دا،
ڕنەم ببتە ڕنەی هرس و سینگی هەزار ماسی بدڕێ،
ئەم دەستانەم، سەدان سێدارە هەڵواسن،
گەلێك، هەمووی، هەر بە زیندوێتی هەڵپاچێ،
ئەگەر ڕۆژێ ببمە جەللاد، گەر وڵاتێك بکەم بەرباد،
زێـــــــــڕم! مەحاڵە ژەنگ ناگرم!
کوردم لە سەر یێك ڕێ دەژیم، لە پێناوی یێك ڕێ دەمرم؛
خۆشەویستی تۆی ئەوپەڕ بێ، سەربەخۆیی تۆی لە سەر بێ،
کوردم ئەمن، شیر حەڵاڵم؛ خوێنم ژەهری تێکەڵ نابێ،
خاکم، تا ئەو ڕۆژەی ئازاد دەبێ، مەحاڵە! بێ سەنگەر نابێ،
عاشقێکی دڵ ناسکم،
دڵم بە بێ دڵبەر نابێ،
کوردستانە دڵبەرەکەم،
ئەویش قەت بێ خەبەر نابێ.

١٩٨٤/٦/٢٥ - هەولێر

**هەر لە بیرمە**

بۆ ئەو کچە قەشەنگەی گوندی تل الخیم، مرازی بوو شوو بە مامۆستایێك بکات، بەڵام کە لە پاش ١٦ ساڵان بینیمەوە؛ باران و سەرما بوو؛ ئەویش سۆلێکی لە پێدا بوو، لە دوای پیاوێکدا دەڕۆیشت، لیتەی قوری شەقام تا ئاستی سەری پرووشا بوو، بۆم پێکەنی و پرسی
- دەمناسیەوە؟

لە بیرتە، کاتی بەیانی
کە خۆر تازە قژی زەردی بە سەر گوندی، دا دەپژاند!
ئەتۆش دەستت لە ملی ناسکی (جەڕە) دەکرد، بۆ دەراوێت ڕادەڕفاند!
منی تینووی کانی لێوت،
بریام بە بریای ئەو دەبرد، کە لە باوەشت دەخشاند!
کە ئاوت پێی دەخواردەوە،
کۆتری لێوی ئاواتی تۆم، لە هێلانەی دیداری خۆم، هەڵنەدەفڕاند!
بە گزنگی زەردەخەنەی سەر لێوانت، زوو دەمنواند!
لەگەڵ ڕەوەی کیژۆڵەکان، هەر کە بۆ گوند دەهاتنەوە؛
نیگای چاوی بە بێ کل و کلچووك ڕەشت، تێدەگرتم، نەتدەجوولاند!
هەرچی ژەنگی دەروون هەبا، هەمووت دەسواند!
دەی؛ لە بیرتە! لە نیوەڕۆ، لە قوتابخانە دەهاتمە دەر،
تۆش دەهاتی، پەری بێریان، بۆ سەر بێرێ، خۆت دەخزاند!
گەڵا و دار و کولیلك و گیا، زەوی و ئاسمان، بۆران و با!
بە لایلایەی عیشقی ئێمە، دەکەوتنە جۆش؛ دەبووە سەما!
مەڕەکانیش دوور لە سەر بێر، دەهاتنە شیر!
بە هەوێنی سۆزی ئێمە، گەدا هەموو دەبوونە میر!

شێت و گێل و هێڕ و نەزان،
گشت دەبوونە خاوەن قسە و ڕا و تەدبیر!
کانی وشك دەزانەوە،
بەست شەپۆلی دەدانەوە!
گیا و گوڵی ساڵانی زوو، دەژیانەوە!
خۆشەویستی ئێمە
لە بن تیغی ترس و ڕقی خزم و کەس و جیران،
چۆلەکەی دڵیان هەڵدەستاند!
لە بیرتە کاتی ئێواران،
هەر بۆ پیاسە، تێدەپەڕیم بە لایماڵتان!
سوورە پەری،
ئەتۆش، ئەو دەم، بەو دوو چاوەت، خۆراکی گیانت بۆ دێنام،
منی پەروانەی دڵداریش،
بە گڕی عیشقت دەسووتام!
بۆن کرووزی گیانم لەو کات،
لە هەر دێڕێکی ئایندەم، خۆی دەنواند!
لە بیرتە بەر لە خۆرئاوا،
کەلاوەکەی مزگەوتی دێ، جێ ژوانمان بوو؟
لە میحرابی خۆشەویستی،
ئێمە هەردوو،سەڵای وەفامان دەکێشا!
پەڕەسێلکە و حاجی لەقلەق،
بە هارمۆنی سیمفۆنیای خوداوەندانە،
ئاسایشیان بۆ دەخواستین، خۆشییان لە زەوی دەچاند!
١٩٨٤/٧/١٥ - هەولێر.

## پرسیار

پرسیبووتان، دەبێ چۆن بم!
خانم وا من، ئەمێستاکە،
گەڕیدەی ناو کۆمەڵێکم،
خەمخۆری چینە خەڵکێکم؛
گشت کلۆڵ و پشت سووتاو، ورگ بەستراون!
لەو سەردەمی، خۆڵیان بە گوش دەکێشاوە،
تا ئەم قەڵاتەی هەولێرێ قیت کەنەوە
هەتا ئەمڕۆ، لە پرخەی خۆیان نەکەوتوون؛
هەڵنەستاون، بێ ئاگانە، هێشتا نووستوون!
بەڵام ئەگەر،
باش، زەینی خۆیان بدەیتێ،
دڵنیا دەبیت،
هەتا قژی خۆری ئاسمان،
بە سەر ڕوخساری کوردستان،
شانە بکرێ،
هەموو شەوێ،
کۆرپەیێکی چاو نەترووکاو
دەداتە بووکی ئەم ناوە،
هەر بەوەوە من ژیاوم،
ناچاریشم، دەبێ بژیم!
جا گریکـــە؛ دەبێ چۆن بم؟

١٩٨٤/٨/٤ – هەولێر.

## ژیان

ئەرێ فانی،
ئایا وەك زانا دەزانی،
مرۆڤ نوقمی ئەزەل نابێت!
ئاوات خوازێك، لە ناو ڕێگا،
هەرگیز تووشی ئەجەل نابێت!
گوتیان، گوتیان!
بەڵام نازانم باوەڕکەم!
چونکە گوتیان، گوڵت وەری!
جەستەت لە ڕووحی بێزار بوو،
بۆیێ گیانی تێیدا خزی!
دەڵێن منتان جێهێشتووە،
بە عاجزی، زۆر بە کزی!
ڕاستە گوڵێ، وات کردووە؟
ڕاستە منت جێهێشتووە؟
ئەی من بۆچی هەست پێناکەم،
خۆ گوڵەکەم،
خۆشەویستیت لە ناو دڵم دەرنەچووە!
هۆ خەڵکینە، برادەران!
من قایل نیم کەس سەرەخۆشیم لێ بکات،
چونکە گوڵم هێشتا گەشە؛
سیس نەبووە!
هۆ خزمینە،

ژیان ئەمە بایێك نییە؛
نا، هەورە بارانێك نییە؛
خۆ حاجیلە و پیفۆك نییە؛
گەلۆ ژیان، نە سوارییە،
نە نیشتمانێکی وشکی، بێدادییە!
ژیان خۆمم، ئەمن نەبم، ژیان نییە!
ژیان سۆزە، ناسوێتەوە!
ژیان بەردە؛ ناتوێتەوە!
ژیان هەستە، وەکوو کانی دەزێتەوە!
گۆشە ڕەشەکانی مێشك، ڕەوشەن دەکا،
هیچ تاریکی نایگرێتەوە!
ژیان گوڵە؛
ئەو گوڵەیە، لە ناو ئاگر بۆنی دەدا!
لە ناو بەفر دەگەشاوە،
زەردەخەنەی خەمی دنیای دەسڕیەوە!
گوڵم، گوڵە، ئەو گوڵەیە لە ناو عەقڵم ڕەگی هەیە!
لە ناو خوێنم شەپۆل دەدا، لە ناو دڵم جۆلانەیە!
لە ناو چاوم، ئاسۆیەکی بەر بڵاوە،
هێڵێکی ڕاست؛ نەچەماوە!
قورگێکی پاك؛ نەنووساوە!
قەڵەمێکە، هەگیز حوبری لێ نەبڕاوە!
زمانێکە، هەندە قسەی پێنەکراوە!
شەماڵێکە، تازە بۆ من هەڵیدەکرد، چۆن نەماوە؟
١٩٨٤/٩/٢٨ - هەولێر.

**گەلۆ! گەلۆ!**

لەم ڕۆژانە ، وەك ئاگردان، کەللـــەکانمان،
لە ناوياندا هەڵدەكرووزێت، مێشكەكانمان!
بە دووكەڵی مێشكم گەلۆ!
لە سەر لوولەی هێسكم گەلۆ! مێژووی بیرمان دەنووسمەوە.
***
پاشی پارە كاوێژ كردن،
پێشی برین سارێژ كردن، دەق لە كاتی نوێژ كردن،
نوقمی دەریای جاشاتی بووین! تا بن پیلی سەر شۆڕی چووین!
ئارەقەی ئابڕووچوونیشمان؛ ناسڕینەوە!
***
گەلۆ! گەلۆ!
كەس نازانێ ئیش لە كوێیە!
بە دەست دەكرێ، یان بە پێیە!
لە ناو وەردە یان لە ڕێیە!
لە بن ئاوە، لە سێبەری مزگەوتێیە!
لە سەر شاخە، یان هەر لە ناو ئەشكەوتێیە؟
قەت لە خەمتان نابڕێمەوە!
***
گەلۆ! هاوار! ڕەنگە هاوارەكەم زەق بێ!
ئەم شیعرەشم تۆزێك ڕەق بێ!
بێ ترس ڕێتان لێ بگرێ!
قسەیەكیشتان پێ نەكرێ!
لەگەڵ هەندێش؛ دڵسۆز وەك من نابیننەوە!

***

گەلۆ! هاوار!

هاوارم دەنگی هەژارە!

دەنگی کوردی بریندارە!

بەبێ ماف و بێ بڕیارە!

ئەگەر کورد هەیە وا نەبێ،

بابێ تاکوو دوو هۆرەی بۆ بهۆنمەوە!

١٩٨٤/١٠/١٦ – هەولێر.

**من و ڕەفیق دەلەف**

وا کۆ بوونەوە، وا تێك هەڵکشان، وا لێك داکشان،
هەر بۆ ووشەیێك هەموویان دامان!
پێکێکیان هێنا، فیکریان ساف کا، تاکوو بنووسن ڕاپۆرتەکانیان!
پیت و ووشەیان یێك یێك، هەڵدەبژارد،
هەندێکیان نارێك، چەندێکیان وەك یێك،
وەکوو خمخانە، ڕەش دادەگەڕان،
ڕاپۆرتەکانیان، چونکە درۆ بوون،
هەر چییان دەکرد؛ هەر نە دەنووسران!!
(مێگەلە مەڕێ پەراگەندە بێ، بمێنێ بێ شوان،
هەرگیز قەت لەوەڕ نادۆزێتەوە، لەوەڕ بۆی بێتە ناو هۆڵی مەڕان).
ووشەیان هێنان، ڕستەیان لە دوو، ووشەکان درۆ، ڕستەکان بەدخوو!
لە سەر ڕووی کاغەز تێك دەقژقژان!
لە سەر ڕستەیێك بۆ ناو ڕاپۆرتێك، دەبووە هەرایان،
بۆ دوو سێ درۆی تا بلێی ڕوو ڕەش، نامۆ بێ ویژدان،
نەهاتنە سەر ڕا، هیچیان نەسەلماند بۆ خاتری قورئان!
هاواریان هێنا، بە هەڵەداوان، بۆ مامۆستاکان!
لێیان دەخواستن داکوو بچێنن، لە خاکێکی ڕەق، بێ هەور و باران!
باران نەبارێ، قەت سەوز نابن، ئەو گیا و گۆڵەی خاکی نیشتمان!
یەکێکیان گوتی – (هۆ، مامۆستایان،
وا نووسیومانە، ڕاپۆرتێ جوان، جا دەمانەوێ ڕەئی جەنابتان!
بەس سەیری بکەن، بزانن چۆنە قسە و باسەکان.)
قسەی ڕاست ئەوە؛ درۆ بێ جلەوە!

بەڵام ئەو هەموو هرسە گێلانە،
ئەو بەعسییانە، تا بن مل، نەزان،
گوێیان لێنەبوو، لە شایی و گریان،
ئەوەی نەچووبا بۆ بەیرێ خۆیان،
یان نەهاتبایە قووڵایی گێرفان،
هیچ هی خوا نەبوو، هەر هی فەرهود بوو، دەبوو بە تاڵان.
لێرەش دەیانویست بە فێڵ لە خۆیان،
ڕاپۆرت بنووسن بە مامۆستایان.
مامۆستا کورد بوون، نەك عارەب زوبان،
بەڵام هیچ کامیان زاتی نەدەکرد، کە بڵێ پێیان -
بۆچی نائینووسن، ئێوە بە خۆتان!
هەموو جاهل بوون، هەموو قاتل بوون،
دز بوون، جەردە بوون، خوێڕی و بێ ئیمان!
(دەلەف عبداللـــه ئەلمعاضیدي)، بەرپرسی بەعس لە ناو مەعهەدی،
ڕۆژێك هاتە لام، بە ڕوخسار بەدی!
ووتی - مامۆستا، ڕاپۆرتم دەوێ؛ پێی تەرفیع دەبم لە ناو حزبەکەم؛
(الکورد ضمن أفکار القائد) بنووسە لە بۆم.
ناچاربووم هێنام ئەوەی نووسرابوو، ئەوەی لە زمانی سەدام بیسترابوو؛
بە پێی قسەکان، کورد دەبووە سوڵتان.
ڕۆیی پاش چەند ڕۆژ دەلەف گەڕاوە؛
ووتی - (یمعوّد، انت إشکاتب؟ إلا شويّ و کان یعدموني!)
وتم - سدگ؛ یمعود؟ ئەوەی نووسیبووم دەقی ئەدەبی حیزبی ئێوەیە؛
بەڵام وا دەرکەوت تەنیا قسەیە، بۆ دعایەیە!
٢٣/١٠/١٩٨٤ - هەولێر.

**علاء الدين سەجادي**

گەواڵە بوو! خەبەر گەیشت!
گشت ئەدیبانی کوردم دیت؛
کۆ بوونەوە؛ تێکڤژقژان،
لێك داکشان، لێك هەڵکشان!
بۆ ڕستەیێك، هەموو دامان!
ئینجا ویستیان پیتێك بێنن،
داتاشراوێك؛ نەبیستراوێك، لە ناو بازاڕ، دابەزێنن!
بەڵام چ بکەن! مەست بوون، حەیران! نەکرا بۆیان؛
ڕان بێ شوان، ناچتە لەوەڕ، چلەی زستان!
سەجادی بوو، سەرقافڵەی زمانی کوردی بوو؛
دەڵێن ڕۆیی! کۆچی کرد و نایێتەوە!
لە دوای ئەویش کەسمان نەما هەگبەی ووشەی کوردەواری بکاتەوە؛
بکاتەوە و بیلێتەوە!
کەسمان نەما، ڕستەی ناسك وەك زەڕنەقووتەی پاساری؛
دابڕێژێ و بیخوێنتەوە؛
لە کوێ بێنین؟
ئاخر گەلۆ، چی بنووسین، نابتە بەرهەمی سەجادی!
هەرچی بلێین، پڕ ناکاتەوە بۆم یادی!
مەگەر هاوار بۆ ڕشتەی مراواری ببەم!
یانە مێژووی ئەدەبی کوردی بگەرێم،
کاشکا شتێك یادداشتێکی سەجادی بێت بدۆزمەوە؛
سەربردەکان؛ ڕاڤەی شیعری شاعیرەکان،
ژیاننامەی پێشەنگەکان؛ نایێنەوە لە کوردستان!

سەجادی بوو، پاشای ڕستەی کوردەواری؛
فەصیحێکی بێ خۆگوشین؛
وەصف و شەرح و وێنا و گوڵچین،
هەر ئەو ڕۆیشت چۆلە مەیدانی هەڵچنین!
هەر ڕستەیێکی چەند شێوە، خۆی دایدەڕشت، ناسك و جوان!
لە ئەدەبناسی، بێهاوتا! نە بووە و هەرگیز ناشبێتەوە،
دانەوێڵەی پاك و پاراو، لە ناو لەپی دەمێنتەوە!
بابە تاهیر! شەوی ئەدەب زۆر تارایۆ؛
"بۆرە سووتە دلۆون گەرد هەم ئاییم
کە قەدری سووتە دڵ؛ دڵ شووتە زۆنۆ!"[1]
مەلای جزیری؛ گەوهەر شەوچرا؛ ئاگات لە کورد بێت؛ وا بۆتە هەرا!
"خوون ژ دڵ جۆ جۆ ڕەوان تێ، وەك عەقیقی ئەرغەوان تێ؛[2]
وەرە مەولەوی، خۆت و خامەکەت –
بلا شەق وەردەن، دەم مەکەردەوە ... زار زار مەناڵۆ وەدەم دەردەوە؛
ئەی خۆشخوانی بۆستانی جافان، ئەوا مەیدانە !
"بۆ ناڕێژی ئەشکی ئاڵ و ئاهی گەرمی ئاتەشین؟"[3]
مەلا نالی، کەسێك نییە، قەڵەم تەڕ بێ؛ وەکوو نالی غەزەڵ فەڕ بێ؛
"وەك ناڵە لە نەیدا، وەکوو ناڵە لە قەڵەمدا."[4]
حەریق، ئەی خۆت؟
بێرە مەیدانی فەساحەت ئەسپت لینگدە حەریق،
تا بزانی کێ بە شیعرت سوحبەت و بازی دەکا!

---

[1] - سجادی، علاء الدین؛ مێژووی ئەدەبی کوردی؛ انتشارات کوردستان؛ سنە؛ چاپی دووەم – ۱۳۹۵ – ل – ۱۸۱.
[2] - سەرچاوەی پێشوو – ل – ۱۹٦.
[3] سەرچاوەی پێشوو – ل – ۵۰۱.
[4] - سەرچاوەی پێشوو – ل – ۲٤۸.

بێکەس، خێرا! چاك هاودەردت ئاگادارکە؛
شۆڕە سواری قەڵەمی کورد، خەریکە لە لات ڕەت دەبێ!
دەی پیرەمێرد، بە وان ئەستێرە بەرزەکان، ڕاگەیێنە،
با ئەمشەو بدرەوشێنەوە؛ دوور لە سەجادی ناناسرێنەوە!
شیعری کوردی، ناسك و وردی، ببنە تاجە گوڵینەیێك
عەلائەدین لە باوشکەن، مەهێلن لە بیر چێتەوە!
*
هۆ! شاعیرانی هاوچەرخ! ڕێك بن، وەرن،
بنووسنەوە، تۆماریانکەن، شیعری ناسك، پڕ لە حوزن، پڕ لە خەون!
پەشێو، ئەی شاعیری نەفرەت، بۆی دەربڕە، شیعر و قیمەت،
لە هەر کوێ هەی؛ وەرە مەیدان،
لە شۆڕەوی و لە کوردستان، لە هەندەران،
چەند بت هەنە بیشکێنە؛ با نەمێنن، شیعری نوێ، بدرکێنە!
ڕێبازێك نوو بچەسپێنە؛
شیعری تازە بنووسەوە، زۆر گەرم بێ، دڵی شکاوم چاکەوە.
هاوار شێرکۆ، لە سلێمانی، زۆر مەردانی، دەنگ هەڵێنە،
ئینجا، هێمن، ڕووی خۆت لە ساقی وەرگێرە،
دەی خۆت سازدە؛ ڕۆژ هی بوێرە!
دەی دڵشاد و قەرەداخی، باش بنووسن، مەبن یاخی،
ئاخر ئەمڕۆ پادشاهی ئەدەبی کورد، ئۆغری کرد! بەڵام نەمرد!
علاء الدین هەرگیز نامری، گەر بۆم بلوێ،
وەکوو عومەر،شمشێر لە کالان دەردێنم،
کەسێك بڵێ سەجادی مرد؛ خامەی دەشکێنم دەستوبرد.
١٩٨٤/١٢/١٨ - هەولێر.

**١٩٨٥**

## دیلی ئازاد

پێشکەشە بە گوشاد خان؛ قوتابییە ناسکەکە.

زانیم هاتی؛
چونکە کوڵیکی چوار دەورم، گەش بوونەوە!
کە تۆ هاتی،
زێ ملی بۆ ئاسمانێ برد،
خەریك بوو شەپۆلەکانی،
لە ڕووبارێ بێنە دەرێ؛
بێرەدا بسووڕێنەوە!
لە پێشوازیت،
شایی بکەن، لە لێوارێ؛
گوڵ ئاو بدەن،
نەهێڵن هیچیان هەڵوەرێ!
زانیم هاتی،
چونکە سەفین کەسك داهات،
قەڵای هەولێر لە سەفەری دووری مێژوو،
هەستی ڕاگرت، بۆ خەبەرێ،
ئاسۆ هەوری ڕەواندەوە،
ئاسمان نزیك بوو وەرگەڕێ!
دوا بۆنی بەهارێك بووی، بۆنم کردی؛
وەخت بوو کات لە شیرازەی بێتەدەرێ!
هەستت بردم! هۆشت بردم!
وەکوو بادەی سەدەف ڕەنگی،

مەستت کردم!
بە نیگای چاوی خومارت،
بە جارێ بوومە خەمبارت،
سووتام بە ئاگری ڕوخسارت؛
بەم هاوینە شکۆفەی دا، پیرە دارێ،
زانیم هاتی؛
بەڵام نەمزانی پێم دەڵێی: ئەوا دەڕۆم!
دەڕۆی؟ دەڕۆی!
بە ڕاست دەڕۆی؟
کە تۆ بڕۆی منیش دەڕۆم،
ژەهری دڵداری بۆم شەهدە؛
دەبێ بیخۆم!
گوتت: گیانە!
هاتووم بۆ گەردەن ئازادی،
دەڕۆم ڕەنگە نەتبینمەوە!
خوێنم مەیی! کچە کۆیی!
هەزار جار گەردەنت ئازاد،
خاتوو گوشاد!
ئەی سەرچاوەی شیعری ناشاد.

١٩٨٥/٦/١ - هەولێر.

## گەڕیدە

ئەو کار ئاسکەی دەستەمۆ بووە    تیری لە ناخی دڵـــم ڕووچووە!
ناسك و شـلك، لێـوێکی تەنـك    نەرم و لە سەر خۆ، زاری کەم دووە!
باڵا بڵنــــدە، هەنگاو نەرمۆڵــە    نە خـــڕە، نە لـــەڕ، قەدی ئاهووە!
شیریـن دیمەنـە، شەکـر زوبانـــە    ئێستا لێم دوورە؛ هەر ئەوەم سووە!
دڵ بـە کێ بـدەم؛ ئارامی دەکا    ڕووی خۆم لە کێ کەم، مەرامی بدا؟
دۆڵ و کێو گەڕام، پێدەشت و چیا    نەبوو بۆنی بکەم؛ بێکەس مام، تەنیا!
وا لەم ناوەدا سەرم هەڵدەگرم    بــەرەو مەڵبەند و بەهەشتی بەغدا
لــە کـەرخ گەڕام، نەمدی جوانێك    لەوبەر ڕەسافە، کەس نەبـوو، پەیدا
کەڕڕادەم پێوا، بـــە هیـوای خۆشی    تا ئەعزەمییەش، خـۆی لێم داپۆشی
لـــە کازمییــە و أم الخنازیــــــر    هەرگیز پیاڵەی شادیــم نەنۆشی!
حەدیقــە و شەقام، نەما نەگەڕێم    نەهات لە بولبول، دەنگ و خرۆشی!
لەو ئەستێرانە، باش ورد بوومـــەوە    دوور بوون لە بەزم و ڕەزم فرۆشی!

١٩٨٥/٩/١٦ - بەغداد

**میر و دڕندە**

دەڵێن جارێك،

کۆنفۆشیۆسی دانای چینی، لەگەڵ هەندێك لە قوتابیانی،

لە بناری شاخێکی بەرز، لە دیمەنی ئەو سرووشتەیان دەڕوانی،

دانای چینی لە دوورەوە ژنێکی دیت،

گەلێك بە کوڵ لە سەر کڵگۆیێکی تازە، دەنووزاوە،

کۆنفۆشیۆسیش لێی چووە پێش؛ گوتی:- ژنێ!

دەڵێی کۆستی گەورەت کەوتوون،

چەند جار ئازیزانت مردوون!؟

ژنە گوتی:- بەڵێ! وایە،

بۆم غەدداره ئەم دنیایە!

خەزوور و مێرد و کوڕەکەم،

لێرە دڕندە بردنی؛

سێمینەشیان هەر تەواو بوو، کە خواردنی!

کۆنفۆشیۆسی هۆشمەند گوتی:-

ئەی بۆ ئێرە جێ ناهێڵی؟

ناچییە شوێنێك کە دڕندەی وای لێ نییە؟!

ئافرەت فرمێسکی سڕیەوە، پاشان گوتی –

لێرە ناڕۆم! چونکە لێرە فەرمانڕەوای زۆردار نییە!

جا داناکە بە گشت شاگردەکانی، گوت:-

لە بیر مەکەن!

ئەو ڕاستییە، کەوا لە خۆر ڕۆناکترە!

میری زۆردار لە دڕندە سامناك ترە!

١٩٨٥/٢/٣ – هەولێر.

**محمـــــد (د.)**

شەیـدای گەنجینەی مێژووی ئیسلام بووم
نەوەستام تاکوو ئەوان ڕۆژان چووم
هەوراز و نشـــێو، گەلێکـیان گـــەڕام،
سەراو و دەراو، مەبەسـت و مەرام!
لـەوان سەردەمـــان، فیکرم گیر نەبــوو،
تا گـــەڕامـــەوە سەردەمێکـــی زوو
ڕۆژانی ڕوونـــاك، بـــە هزرێکی پـــــاك
سەرەتـــای ئیسلام، پـڕ باوەڕ، چالاك
هەر بــە خەیاڵ بوو، چوومـــە ماڵەکەی
ویستم یەقین بـــم ڕاستی حاڵەکەی
ماڵـــی (محمّــد)، دروودی لـــە ســـەر
هەموو فیکر بوو، پاکتر لە گەوهـەر
قورئانی ڕەوشـــەن، لــە ســـەر زارییـەوە
ڕێ نیشانـــدەرە، باش بیخوێنییەوە
گەلی موسوڵـمان پەیـــڕەوی دەکـــەن
ڕاست و حەقیقەت، لە بیری مەکەن
چـــاك دڵنـــیا بـــن کـــە وا محمّـــد
خـــوا ناردوویەتی، ڕاست و مخلّـد
هەمووی یێکسان کـــرد ڕێ نیشانـدەرە
ئازادی کردووین، پێشەنـــگ، ڕابەرە
ئەو فێری کردیـــن، ڕاست و دروست بین
پاداشتی ڕەحمەت، لە خوا وەرگرین

١٩٨٥/٩/١٦ - بەغداد

## ١٩٨٦

### داوا

لێتـــان داوا دەكــەم، داوا پـیر و جوامێر، گەنج و ساوا،
دەستی هاوژینت بەرمەدە بۆ ناحەزت قەت سەر مەدە.
١٩٨٦/٣/٢٩ - هەولێر.

### شیعر

شیعری ناسك،
هەڵمی كوڵانی دڵی زەبوونە،
لە ئاسمانی مێشكی مرۆڤ،
خەست دەبێتەوە،
لە نووكی قەڵەمی خەمخۆر دادەبارێ،
دەشتایی سۆز، ڕەباس دەكات،
ئینجاكە دادەمركێتەوە!

١٩٨٦/٤/٤ - هەولێر.

### هەست،

هەموو هەست و سۆزت بردم؛
ئاخر بەڕووی!
لە سەر كێوی دڵم شین بووی.

١٩٨٦/٤/٤ - هەولێر.

## هەڵەبجە

هەڵەبجە بوو، شادی بۆ گشت دنیا دەبرد!
زەردەخەنەی منداڵانی ئەم شارە بوو،
هەورەمانی بە گوڵ دەکرد!
هەڵەبجە بوو، هەرگیز هۆرەی نەدەبڕاوە؛
ئەم شارە بوو،
دیمەنێکی ڕەنگاوڕەنگ بوو، نە دەپساوە!
*
بەیانی بوو،
کۆرپە ناسکۆڵەکەی باوکی،
بە گاگۆڵە، بۆ ئامێزی دایکی دەچوو،
دایکە ئامێزی کردەوە، بەڵام کۆرپە نەیگەیشتێ!
نە ئەو بە شیری دایکی کەوت، نە ئەو کۆرپەی لە ئامێز کرد؛
فڕۆکە تاوانکارەکان، ئاسمانیان گرت!
ژاریان باراند بە سەر منداڵانی ناو شار!
هاوار، هاوار!
فڕۆکەکان ڕقی ناخی تکریتییان بۆ کورد هێنا،
ڕقیان هێنا؛ ژاریان هێنا!
ژارە تفتە بۆن سێوەکەی دڕندەکانی ناخ مێژوو،
قاقای پێکەنینی نەهێشت!
گریەی منداڵانی نەهێشت!
قاڕەی ڕانە مەڕی نەهێشت!
زەڕەی نێرەکەری نەهێشت!

ئامێزەکان پڕ ژەهر بوون!
هێلانەکان پڕ ژەهر بوون!
شیری مەمکی مەڕ و دایکان پڕ ژەهر بوون!
هۆرەی نەهێشت؛
ئاخر قوڕگ پڕ ژەهر بوون!
جافایەتی هەژایەوە،
کوردایەتی بڕایەوە!
ئینسانییەت، پووچ و لاپووت،
بە چاوشۆڕی لە بەرانبەری هەڵەبجە پووکایەوە!
دنیا سامی لێ نیشتووە!
ئەوەی لەگەڵ کورد کراوە،
لە مێژوو پێشتر نەبووە! نەکراوە!
*
من لەو ڕۆژە، بە چاوی خۆم،
محمد رسول اللـــەم دیت، لە بۆ ئینسان، هاتە هاوار!
لەو ڕۆژەدا، بە چاوی خۆم،
زەڕدەشتم دیت، هاتە هاوار!
لەو ڕۆژەدا، بە چاوی خۆم،
بارزانیم دیت، هاتە هاوار!
لە ئاسمانی کوردستانێ، بە دوای خودای حەق دەگەڕان؛
منیان بینی، شینیان بۆم کردا!
بەڵام ئینسان، لەم زەمانە، هیچیان نەکردا!
زمان لاڵ بن؛ هەر دەستخۆشی سەدامیان کردا!
١٧/٤/ ١٩٨٦- هەولێر.

## کێوی هەندرێن

لە چەقی ڕێ،
لە دوورەوە، زانیم ئەتۆی، ئەو کیژەی دێ!
دڵنیا بووم؛ گوڵ دیار بوو؛ هەناسەکەم لێ سوار بوو،
چراییێکی گەشی، خۆشی، ڕاست داگیرسا، لە ناو میشکم شکۆفەی دا!
لەبەر ڕووناهی ئەوینت، تریفەی کرد هەموو دونیا!
لە خۆشیدا، منی شەیدا،
هەموو جەستەم جریواندی، تریوەی دا!
بە تەنیایی ڕاوەستابووم، لە سەر ڕێگا،
کە تۆ هاتی، باڵندە و گوڵ، دەوریان دا،
سییەکانم پتر لە خۆم، ناسەیان دا،
لە دیدەنیت، عەسرم شێوا،
نەمزانی لێوە دەلەرزێ، یانە دڵە؛ شایی دەکا!
هەموو هەستم بەهەشتێك بوو،
لە ناو زەمان، لێم بوو پەیدا!
هەزار کیژی ڕێواس ڕنی جوانتر لە بووك،
هەزار گیانداری ئێسك سووك،
لەو قەدپاڵی ئەو کێوانە، وەکوو کوڵووك،
بوونە دیمەن، دیمەنێك بوو، نەدەجوولا!
پاشان کە بە خێرت هێنام،
ئەو شاخە گەورەی هەندرێن، ڕێك داهێزرا!
هیچ تەمەنی خۆی ڕیز نەگرت، وەك خۆم ئاسا،
گڵپەی دڵی لە ناو چاوانی لێیدەدا!

١٩٨٦/٤/٢١ - هەولێر.

**جوانترین پەیکەری یاد!**

دایە! دایە!
ئەی پەیکەری خۆشەویستی، تۆی جوانترین یاد!
دەڵێی زەمان بۆت هاتووە؛
وا لە بۆسە دانیشتووە؟
دەڵێی زەفەرت پێ دەبا؟
دەشکێی؟ دەڕۆی؟ بە بێ فریاد؟!!

***

دایە، دایە!
خۆزیا هەموو شارستانی، لە سەر تا پێ، بڕووخایە.
زەمزەمەی زاری منداڵیم،
زەردەخەنەی خۆشەویستی و نەوجەوانیم،
سڕ هەڵگری جوامێریم،
دەڕۆی ئاوا بە جێم دێڵی؟
دەبڕێیەوە و دەسڕێیەوە؟
دەبێ وابێ؟ دنیا وایە؟
دنیا هەندە بێ وەفایە؟
دایە، دایە! سڵاو! لە هەواری خاڵیم!
سڵاو! لە خۆم لە بێ ماڵیم،
لە بێ یادداشتیم،
بێ حاڵیم.
قەڵای بوون و سەرکەوتنم،
سازی زارم، سۆزی بوونم،
شکۆی ناوم.

سینگی گەورەی خەم هەڵگرم،
شانەی ڕەحمی قژی گرژم،
دەڕۆی دایە؟ خۆزگە پێشی تۆ دەمرم!
**
زەمان، زەمان،
پەنجەی بێ ڕەحمیت هەڵوەرێن؛
هەڵتبژارد یێکە یێکەی ئەزیزانم،
براکانم،
باوکم، مامم، دەزگیرانم،
گوڵت بردم،
گوڵزارت سارد و سڕ کردم،
گوڵت بردم، بەهارت لێ وشك کردم،
گوڵت بردم، من کێم ماوە؟
دایە بڵێ، دە پێمبڵێ من کێم ماوە؟؟؟
ئەمڕۆ کێیە؛
من و مێژوو پار سەنگ بکا؟
یادداشتم بخوێنێتەوە؟
چیرۆکم بۆ بگێڕێتەوە؟
یێکەم هەنگاوم بۆ باس کا،
یێکەم قسەم بڵێتەوە؟
بێزار نەبێت،
بڵێتەوە و بڵێتەوە و بڵێتەوە؟؟؟!

١٩٨٦/١٢/١٣ - هەولێر.

سعاتی ١٠.١٥ ڕۆژی شەموو؛ ئەم هۆنراوەم نووسیەوە؛ ڕۆژی پاشتر دایکم ئێمەی بەجێهێشت!

١٩٨٧

## شیعری بیانی وە کوردی کراو[1]

### لویـــزا گلـــۆك

لە ساڵی ١٩٤٣ بووە، ئەمێستا لە ڤێرمۆنت، وڵاتە یەکگرتووەکاندا دەژیت؛ ئەم خانمە دوو کۆمەڵە شیعری خۆی بڵاو کردووەتەوە؛ ئەمەی خوارەوە کورتە شیعرێکییەتی:

وا تێنەگەی کە من سوپاسگوزاری ئەم چاکە بچکۆلانەت نیم،
کە تۆ لەگەڵ مندا دەیانکەیت.
من خۆم حەزم لەم چاکە بچووکانەیە.
لە ڕاستیدا، لە لای من، ئەم چاکە چکۆلانەی تۆ
لەو چاکە بنەڕەتییانە پەسندترن،
کە هەردەم، پەردەت لە سەردا هەڵدەماڵن؛
یان دەتکەنە ئاژەڵێکی زەبەلاح و لە سەر مافوورت دادەنێن!
تا هەموو لە هەمووی ژیانت بە چەشنێك کەمدەکەنەوە، کە
جگە لە خەوهەستانی بەیانییان
هیچت بۆ نامێنێتەوە؛
مەگەر هەر ڕۆژێکی پڕ ئافتاو کە کەڵبەکانی دەدرەوشێنەوە!
لاپەڕە – ٧٢٨.

[1] Hall, Donald. To Read Literature, Copy right ١٩٨١, by Holt, Rinehart and Winston, Printed in the USA, ١٩٨٢.

## وڵیەم ستانلی مێرن[1]

لە ساڵی ١٩٢٧ هاتووەتە دنیا. لە ئیسپانیا ژیاوە و مامۆستا بووە. لە هەردووك زمانی فەرەنسی و ئیسپانییەوە، کاری ئەدەبی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیسی. لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو، چەندین کورتە شیعری هێمازەدەی نووسیوە و لە دوو بەرگدا چاپی کراون؛ هەشت بەرگ شیعری چاپکراون.

شتێکە من نەمکردووە،
دوام دەکەوێت!
نەکردوومە و نە دووبارەشم کردووەتەوە،
بەڵام چەندین شوێن پێی هەیە،
وەك ئەو پێستەی دەهۆڵەکان، کە کون دەبن، ئیدی چیتر بە کار نایێن!
درەنگە ئێوارەیێك گوێم لێی دەبێ لێم نزیك دەبێتەوە
ناوە ناوە لە دەریاکە دەردەکەوێ،
بە سەر شانم هەڵدەگەڕێ،
منیش بایەخی پێنادەم؛
هەلێکی تر لە دەست دەدەم،
لە چنگم دەچێت!
هەر بەیانییێك
تا ئێوارە بەشێك لە هەناسەکانم بە یێك کەڕەت هەڵدەمژێت!
دەشزانی کە بە کامە ڕێگادا
تێدەپەڕم و یێکسەر لێی ئامادە نابێت
کەچی جارێکی تریش دەڵێم :
ئەمجارەیان بۆ بەیانی بە هەردووك دەست توند دەیگرم و

[1] Hall, Donald. To Read Literature, Copy right ١٩٨١, by Holt, Rinehart and Winston, Printed in the USA, ١٩٨٢.

هەنگاوەکانی دەخەمە سەر دڵمەوە و
چیرۆکەکەیشی دەخەمە سەر پەندەکانم و
بێ دەنگیشی دەکەمە سیمای خۆم.
لاپەڕە - ٦٩٧.

## گریگۆری ئۆر[1]

لە ساڵی ١٩٤٧ لە دایکی بووە؛ دوو کتێبە شیعری بڵاو کردوونەتەوە. یێکەمیان بە ناوی (سووتاندنی هێلانە بەتاڵەکان) و ئەوی تریشیان ناوی (یێکڕا ئێسقان کۆکردنەوە)یە؛ ئەم دوو بەرگە کتێبانەی پێش بوونە ٣٠ ساڵ، بڵاو کردوونەتەوە. لە ساڵانی ١٩٨٠کاندا، لە زانکۆی ڤێرجینیا مامۆستا بووە.

بلووز
بێ گومان ڕۆژێك لە دەست دەدەم،
وا لەم شیعرەدا بووراوەتەوە
کە چۆن ژنی ماسیگرەکە
مردنی مێردەکەی دەچنێت و
دەیکاتە بلووزێك.
لاپەڕە - ٧٢٨.

[1] Hall, Donald. To Read Literature, Copy right ١٩٨١, by Holt, Rinehart and Winston, Printed in the USA, ١٩٨٢.

## کورد

ئەو زمانانەی، وەك کوردی، دەیانزانم،
دەنگ و پیت و ووشە و ڕستە؛
نەحو و سەرفێکیان نەماوە نەیپشکنم؛
باسی منیان تێدا نەبوو!
مێژوونووسێك نەما، لە سەر زەوی، ئەگەر هانای لە بۆ نەبەم!
باسی منیان نەدەزانی،
هەبوو هەر لە بیری نەبوو، هیتر هەبوو دەیشاردەوە!
گرینگ ئەوە،
لای هەندێکیان کورد هەر نییە!
نییە و نەبووە!
مێژووی خامەی دەستی دوژمن،
ڕاستییەکەی لار کوردووە؛ فەوتاندووە!
پرسیاری ئەمڕۆ ئەوە -
دەبێ کێ بن ئەو کەڵە پیاوانەی،
لە ناو هەولێر، قەڵاتیان دروست کردووە!

١٩٨٧/١١/١١ - هەولێر.

## عیشقی پیری

که به پیری، گڕی عیشق له کەللـــەی دام
ئەو کاتێ بوو، لێم یەقین بوو ئه وا من هام!
تێگەیشتم، بۆ چی شاعیر که پیر دەبێ،
وا دەسووتێ!
داری وشك، بێ ماندوو بوون، ئاگر دەگرێ!
شیعری پیران وا به سۆزه،
دەور و بەری ڕادەهێنێ،
گڵپه دەکات و تاو دێنێ!
هەست و سۆزی ڕاستەقینەی دێڕێك شیعر،
دەست نابێرێ! دەسووتێنێ،
که شاعیر بوو به خۆڵەمێش،
ئینجا به نەرمی دەسووتێ؛
هەرگیز بڵێسه ناستێنێ!

١٩٨٧/٩/١ – هەولێر.

**چرۆی ئاوات**

کۆرۆشییەکان، عوسمانییەکان،
گا پەرست و بت پەرست و هەموو ئاگر پەرستەکان،
کۆتی مەچەکی خۆیانیان، وەکردەوە!
پاش دوو شەڕە جیهانییەکان،
هەموو دەسەڵاتی خۆیان هێنا،
زەردەشتیان پێ بەستەوە!
کوردە مەنوو، دەتێبگە و چاو بکەوە؛
دەهەستەوە!
بڕبڕەی پشتم داڕزی،
کەللـــەم تەزی!
گەر وا بڕوا، بژێیینەوە،
هیواکەمان قەت نابەزی!
دەرمانێك، با هەر گران بێت،
لە سەر برینم دابەزی!
نێلی بمرێ ئاواتەکەم،
ڕۆژێك هەر چرۆ دەردەکات،
دەبتە سەوزی!

١٩٨٧/١١/٨ - هەولێر.

## ١٩٨٨

### كانى

گەر بۆم دەكرا،
بە ناو تەمی هزر و خەونت گوزەر بکەم،
بەرەو قافی خۆزگەت بچم؛
لە ناو دەریای خەیاڵی تۆ،
باسکە بدەم!
گەر دەمتوانی،
جۆگە و ڕووباری خەمی تۆ،
بگرمەوە!
هیوا و ئومێدی گەشی تۆ،
بخوێنمەوە،
شان بە شانت،
شیعری تازەی چاوەکانت بهۆنمەوە،
لە میحرابی پەرستگەیێکی ئازادان،
وەکوو شیعر،
ئاوازێکت بۆ ڕێکخەم،
بیلێمەوە!
ئەو کات دەبوومە گلێنەت،
ڕێگەی دوورم نیشان دەدای،
نەشمدەهێشت،
لە پاش هەمووان بمێنییەوە.

١٩٨٨/١/١٥ – هەولێر.

**گردەسۆر**

من لە گوندی گردەسۆر بوویمە؛ماڵمان لە گوندی گردەسۆر ماوە تا تەمەنم بووە ٥ ساڵان ... باوکم لە هەزار و نۆ سەد و پەنجا و پێنج سەری لە مەککە و مەدینەی دا، یەکەم کەس بوو لە گوندەکەی ئێمە سواری فڕۆکە ببێت! زۆر جاران، دەیگێڕاوە کە لە چوونیان بۆ مەککە، لە ناو فڕۆکە، ترشوشیرینێکیان دابوویێ لە دوای پتر لە پازدە ساڵ، کە باسی دەکرد، دەیفەرموو:- ″هەندە بە تام بوو، تا ئێستەش تامەکەیم لە یاد ماوە!″

چون منداڵ بووم زاتی ئەوەم نەکرد بە ئاشکرا لێی بپرسم!

لێ گەورە بووم ئینجا پرسیم،

گوتم – "باوە بۆ سەفەری سعوودییەت کرد؟!"

فەرمووی: - "بۆ حەج!"

گوتم: - "ئاخۆ قەردار نەبووی؟"

فەرمووی: - "نەخێر."

پرسیم: - "بژێوی ئێمەت ڕەها کرد؟"

گوتی: - "ئەی چۆن!"

پرسیارم کرد: - "لە گردەسۆر، فەقیر نەبوو؟"

وەڵامەکەی ئەرێنی بوو... واتا هەبوو ...

پرسیم: ـ "دراوسێکەت ... برسی نەبوو؟

قەردار نەبوو؟ نەخۆش نەبوو؟ ....نەبوو.... نەبوو؟؟؟؟؟"

بێشك لە نیازم تێگەیشت، جا بێ دەنگ بوو!

***

هۆ گوندەکەم...

هۆ، هۆ گوندە وێرانەکەم

کوڕی ئەوانەی باوکم هات،
هەتا سەردانییان بکات،
هاتن لێرە تۆیان سووتاند!
هەموو خانووەکانیان ڕووخاند!
***
هۆ گردەسۆر
بە ناوی ئەوانەی کە باوکم چووە لایان،
هاتن؛ ئەنفالیان بۆ هێناین!
هۆ گردەسۆر!
ناتگۆڕمەوە بە بیابان
ناتگۆڕمەوە بە ئەسفەهان
ناتگۆڕمەوە بە فەلەستین
ژاپۆن و چین!
ناتگۆڕمەوە بە ئەوروپا
ناتگۆڕمەوە بە ئەمریکا
ناتگۆڕمەوە بە هەموو خاکی عارەبان!
***
هۆ گوندەکەم،
هۆ، هۆ گوندە خاپوورەکەم
هیچت نەبێ، کارەبا و ئاو،
قوتابخانە و ڕێگەی قیرتاو؛
تۆ هەر ، هەر تۆی بۆم دەرمانی
چارەسەری هەموو دەردێکی گرانی
دووریم لە بیر دەبەیتەوە

هەستم تازە دەکەیتەوە
ژینم پێدەبەخشیتەوە
خەم ڕەوێنی و لێت نزیك بم ترسم لـێ دەڕەویتەوە!
ماندیتیم دەحەسێتەوە!
ئەی گردەسۆر.
***
هۆ گوندەکەم!
مایەی شادی،
ئەی ئەو دەشتەی گڕی هەناسەی ناسۆرم،
فێنك - فێنك دەکەیتەوە
لێدانی دڵم ڕێك دەخەی،
چیرۆکی سەختی ژیانم،
لە سەر بەردی (کەندە هارە) هەڵدەکۆڵی
دەینووسی ڕەش نەبێتەوە.
هۆ گردەسۆر!
***
ئەی گوندە بێ نموودەکەم
لە یاد چووی هەموو زەمانێك،
تۆ هەمیشە نیشتمانی
کێشی شیعری پڕ گریانی
تریسکەی هزری بەیانی
تۆ پەرستار و دەرمانی
هۆ گوندەکەم،
هۆ گردەسۆر!

***

گردەسۆرە سۆزی دڵە!
هەستی پاکە، ڕووناهی چاوە، هەم کلە!
ژینگەی نە سەختە، نە شلە!
تۆزی خاکی، لە سەر چاوە، لە سەر سەرە، لە سەر ملە!
ئەوەندەی کچێك ناسکە،
هەندەی بووکێك ڕازاوەیە،
وڵاتێکە پڕی گوڵە!
ئەی گردەسۆر!

***

گردەسۆر ئاخ! ئاخ گردەسۆرم!
منیش کتومت وەك باوکم...
هەتا دەمرم...
نە تۆم لە بیر دەچێتەوە؛
نە ئەوەشم لە یاد دەچێ
تۆی ئەنفال کرد، تۆی خاپوور کرد
خاك و ئاوی بە تاڵان برد
قەوێنتی بۆ پاش خۆم دەکەم ...
ئاوەدانت بکەنەوە، ئەنفالچیان ببەزێنن،
مافەکانتان لە ناو چاویان دەربهێنن،
چیان لە بۆتان هێناوە بیبەنەوە،
ئینجا منیش لەوێ بشارنەوە ...
هۆ گردەسۆر!

١٩٨٨/٧/٩ - هەولێر

## ١٩٩٠

### چوار خشتەکییەکانی تاغور - بە دەستکارییەوە کورداندوومن

هەموو دنیا وا بوویتە گـــوڵ؛ دەڵێی دنیا گوڵاوڕێــــژە
تاریکی ئێستا نەمـــاوە، هەمـــوو برینــم ساڕێـــــژە!
خۆشەویستیم دابەش بکەن، بەشی هەموو دنیا دەکات
کەچـــی بە تەنیــا جێماوم، ئەو ماوەیە دوور و درێژە!

منیش وەك (حەریف-ی ساقی)، دڵم پڕ جۆش و خرۆشە!
لە عیشقی پاکی بێ هاوتــا، کانی ئەشکم، هەر لە جۆشە!
دەتوێمـەوە وەك زەردەخـۆر، لە ناخ دەریای ئەویندارى
دەبمــە ئـاوازی شمشاڵێك، نابڕێتـەوە؛ هێنــدە خۆشە!

کە دەنگی سازی پڕ سیحرت، لە هەر لا دەنگ دەداتەوە؛
هەناسـەی پڕ هیوای دەنگت، وەك ئاو، گەشـم دەکاتەوە
گشت قســـم دەبنـــە گۆرانی، هـەر بە لێو دەگوترێنەوە،
کەچـی، گــەورەم، لە کۆتایی، کۆتاییم خۆی دەخواتەوە!

هەمــوو ژیان ئارەزووم بــوو، هــزرم هــەر پاك، بمێنتەوە
بە پەنجەی پەخشی هەستی تۆ، ژێی هەڵبەست بلەرێتەوە
هەمـوو خراپــە دەرپەڕێنێ، تــۆش لــە باوەڕ بچەسپێنێ،
هەتــا مـــاوم هـــەر بمێنـــێ، کـــە مردیشـــم، بژییێتەوە!

وەرە کەمێــك دانیشـــە لام ؛ هەتــا دەستم بەتــاڵ دەبــێ
دوور لــە دیداری دیدی تۆ، مەستی هەستم مەحاڵ دەبێ،
بێی تــۆ ژینم، وەکـــوو هەورە، لە ئاسمانـدا، پرسیار دەبێ،
هەنگێك ڕێگەی گوڵ بزرکا، ڕووت و قووت و ڕەجاڵ دەبێ!

نەوەست! بــە ساقــەی پەنجەت بم! ئەم گوڵە زوو بقرتێنە!
نەکا باێیـك بــێ و پەلیــدا! لـــە نــاو خۆڵــدا مەیگەوزێنە!
دەترســم پێش لــەوەی بمـــــرم، ڕۆژی ئەمڕۆ لـە تـۆ ڕەتدا،
ئــەم خونچــە نێتە سەر یێخــەت؛ باوەش بێنە، مەیفەوتێنە!

شیعــرم بێ ئاوازیش خۆشـــە، مانگ جوانی بــە شــەو دەدا،
مــرواری ووشەکانمە، خەناوکــەی دڵ؛ وا بە ملی یار وە دەکا،
کە خۆم هزری هۆنراوێك بم ڕاست و سادە، وەك باڵای
دبنــە ئــاواز لە ســەر لێوان، تــام و بۆنــی بە قسەت دەکا!

نامــە دیلی زیــو و زێــڕ و نامــە بەنــدی گەمـــەی منداڵ؛
کــە تــۆز لە جەستەم نەنیشێ، نەچمە بەر سێبەری کەنداڵ،
چ خۆشییێك لـــە ژین هەیــە، گــەر لە ناو خۆڵ، هەڵنەپەڕم؟
چلۆن خزم و خۆیش دەمناسن، گەر لەگەڵیان، ڕاو نەکەم داڵ؟

نەکەی هەرگیز خۆ گێل نەکەی؛ سەنگت نەخەیە سەر شانت!
قــەت بــیر لــە مــردن مەکـــەوە، هەوڵـــدە بۆ نانی شوانت!
مــان و مــردن وەکــوو یێکن، مەشێوێ! ڕاستبە، لە سەر ڕێ!
سبــەی لـــە ئەمــڕۆ داتاشـــە، شەکر بخـــە ســەر زمانت!

خۆشەویستی لــەو جێگەیــە، پڕ هـــەژار و برسی و وونـــە!
ئەگـــەر لەمانـــە داتــرازای، زۆر وریابــە! جێی پێـــت، کون
دڵ هەمیشــە بـــێ هــاوارە، بـــێ ڕێیـــاز و بێ هـــــەوارە!
چونکـــە ناشێن لەگـــەڵ یێکــتر، بۆیـــێ ژیانیـــان مردنـــە!

هەستە؛ زووکە؛ چاو هەڵێنە! دەرگا لە سەرمان داخرا!
گۆشەی مزگەوت چی بۆ کردین؟ یان لێی خواردین، دەنا برا!
خودا لەو شوێنە چاودێرە، کە بەرد دەزێ، ئاسنی دەبێ!
دەبا ئێمەش بۆ یێك ژوان، بچینە وێ؛ بەردەستی خوا!

گەشتی من دوور و درێژە، لە سەر پشتی هەتاو دەڕۆم!
لە ناو هەسارە و ئەستێران، چڵکی ترسی دڵتان دەشۆم!
دووری گۆرانیم بۆ دەڵێ - لە ئەوپەڕ گۆڕی تۆی لێییە!
ئەگەر خۆم لە گۆڕ بترسم؛ نەوێرم؛ گیانی خۆم دەخۆم!

ئەو گۆرانییەی بە ئومێدم، لە پاشەڕۆژ بۆ تۆی بڵێم،
فیزیك نییە، ڕێسای زانست بۆم ڕێك بخات، بە کەیفی خۆم!
ئینجا دەستم بخەمە بن گوێم، وەك باڵندە بچریکێنم؛
بەڵام خۆت تەمابڕ نەکەی، هەر ڕۆژێك دێت، بۆتی دەڵێم!

ئای کە ئاواتم چەند زۆرن! وای لە چوار لام؛ چەند تاریکە!
لووتکەی هزرم چەندە بەرزە! ئاخ ڕێگەشم چەند باریکە!
بیر و ژین و ئومێد و ویست، هەر دیاریم لە بۆ دێنن!
ڕێگەی سەختم دەپاڵێون، هانم دەدەن، دە جاری کە!

دەشتی ژیان لێم ووشك کات؛ هیچ ئاواتێکم نێنە دی،
هێشتا لە شەو قەت نازانم، چاو هەڵێنم، هیچم نەدی!
بەڵام هێشتا هەر چاوەڕێم، کاشکا هەلێك دەگرێت ڕێگەم!
گزنگ دەدا، دەبێ نەنووم؛ کاشکا دنیام بە چاو دەدی!

جـا ئاهەنگی خـۆم ســاز دەدەم، گیانم تۆزێك ئارام دەكەم!
چـاوم كەمێــك دەتروووكێنم، گوێ لــە دەنگی دنیام دەكەم!
هــەزار هەڵبەست دەهۆنمەوە، هەزاران كێـل دەشۆمــەوە،
هەمیشــە دەیكەمـە بەهار، سەیران دەگەڵ یاران دەكەم.

هەر چاوەڕێی خۆشەویستم، تا خۆم باوێمە باوەشی،
هــەزار یاسـای پـیرۆز دەركـەم؛ سپی باوێنــە بـن ڕەشی،
چونكــە خۆشییــە ئاواتــم؛ بێ ئـاو، سەد چرۆ دەردەكەم
هــەزار كانی دەژیێنمــەوە، كونـی ئارەقــەی چاكەشی.

هــەورە و لە سـەر هـەور هـەورە، وا دنیا ڕەش داگــەڕاوە؛
لــە بـەر بارانی هـــەوری ڕەش، ئەویـنی مـن چرۆی داوە؛
گـەر ڕێت بە لای ئـەو كەوت، نەڕۆی؛ نەكا دنـیا ببتە لافاو،
ڕاوەســت لــە ڕووی ڕەشــەباكـە؛ بارانی ڕەشی هێنـــاوە.

ئەگــەر تۆ كپ و بێدەنگ بی؛ دڵـم بەرد بێت، دێتە خرۆش،
ئەگـەر تــۆ ئارام و مەنگ بی؛ زمـان وەك قاوە دێتە جۆش،
بێ شك، هەر بەیانێك دەدات، بێ شك، تاریكی هەر دەڕوات،
لەو دەم قسەیە، باڵ دەگرێ؛ خوانەندە بۆت دەخوێنن خۆش

بـیرم پــەرش بـوو نەمزانی، كــە تاریكی حەشـــاری دام،
كــە چـاوم كردەوە، داخــم! تیغی شمشێر لە زمانی دام
هیـزە، گەلـۆ، نەكەن وەك من! هەوارگۆڕی نەكەن، هیزە!
لە كام دەربەند سەرم هەڵدا، چ مەڵبەندێك بوو قاڕی دام!

هاوار لە خۆم کات هەر دەڕوا؛ دەبێ دەرچم لە پێستی خۆم
بەهــار دێت و هاویــن دەیخــوا، کانی نقـــوم دەبن لە جۆم!
لە گیزەگیزی با، دنیا. دەم بەش، چاو زەق، ملکەچ، بـێ دەنگ
گوێی لە دەنگی ئاسۆی دوورە، ئاسۆش چاوەشە و دزە و دۆم!

لە سیبەرێك، بە ڕووی باران، هەنگاو دەنێم، من بە بێدەنگ!
بەیــان چاوی لێم قوچـــاوە، هونەر وێنەی کێشام بێ ڕەنگ!
شەمــاڵ، خۆم ئاسا، کۆڵ نادات، بۆی دەشنێ، لە ناخ تاریکی!
نا وەك خــەون، نـە ئەندێشە، بۆم دەچریکێنێ؛ بۆتە زەنگ!

لــە گەشتێکی دڵــداری بــووم، لـــە شەوێکی تاریکـــی سارد
خــەو لە سەر کێوی کەللەمدا، مانی گــرت و هەڵێنەستاند
هــەر دەرگایێك، پەنجــەی ئاواتی پێگەیشـــت، کردییـــەوە؛
هەر تاریکییەك هاتە سەر ڕێم بە دەست گرتم هەڵمپەسارد

دیــارە کــە ڕۆژ دەبڕێتــەوە؛ شەویــش باڵنـــدە ناخوێنن!
دەشـــێ ڕاوچـــی مانــدوو ببێــت، تاژی نیچـیران نەبێنن!
دەکرێت زەوی گوڵپـــۆش نەبێت؛ دەشێـت کانی نەزێنەوە؛
دەتوانن خامـــەم ســـەر بـڕن، ناشـــێن شیعـرم ببەزێنن.

لـە شەوێکی پـڕ لــە ترس، بێڵــە بـا چـاوم بچتــە خەو
ســەر بخەمــە ســەر باوەشت؛ دنیا پـــڕە لـە زیخ و چەو
بــا لــە سەر تاتی بـە نوێژت، هــەر بــۆ مراز، پاڵدەمەوە،
کاشکا لــە خەومــا دەبێنـــم، بڕانـــەوەی ترسان و شەو!

هـەر چەنـد بـە پەنجـەی ناسکی، قـژی جوان شانە کـردم،
یاساوڵـە نووستووەکان، هیچیانی لـە خـەو نەکـردم
نیـوە شـەو بوو کە هاتە لام، ئەسکوردم شکا؛ هەڵنەستام!
دەبـوو چـاوی دەربینابـام، خـۆ بە بێ چاو نەدەمردم!

دەشێت هەولـێر بنەخشێنـم بـە ئاواتی گەلێك مەزن،
سلێمانـی پـڕ چراکـەم، هەر ڕووناکی؛ ئاگـر نەبن!
مـردن سـەد جار پەسندتـرە، بـۆ دڵێـك ئاواتی نەبێت
ئەگـەر ئاواتت نیشان کـرد، لـە بۆی بچۆ، تـا سەر مردن!

لـە شەوێکی تـار، پـڕ ترس، ترووسکەی ئەستێرەکی دوور
لە دورچاوم دەچێتە خـوار، ڕاناوەستێت، تا ئەوپەڕ ژوور
ڕێـڕێ دڵـم ڕووناك دەکات، تا دەبێتە شوعلـەی عەقڵ؛
جـا دەمکاتە خۆشەویستی، لێبـوردن و کڵافـەی نوور.

ئەگەر چی گەلەك ناخۆشە، لە خەوت کەم، تاکە هاورێم؛
بەڵام خـەو و ڕێگـە و ئاوات، ناگەنە یێك، دەبـێ بڕۆم
کفنی بەرم با هەر تۆز بێت، خۆشەویستە بە بڕوای خۆم
قەردی زۆر و پلەی بەرز و خۆشەویستان دێنە سـەر جێم

ئاخ لە زیندانی ئـەم نـاوە! چیایێکی دیـل گـرتووە
هـەر دووك چاوی گـرێ داوە، دە پەنچەی زنجیر کردووە
پـڕا و پـڕی زارمی خوێیـە، قوڕقوشمم لـە گـەروو کراوە
بڵێن، لەمـە پـتر، چی بکـەم! مێشکم بۆ تـۆ گیر نەبووە

زەمــان دەخشی، کەچی سازی بـە سۆزی گەورە تاری تۆ؛
وەکــوو تەرمــی پاشاییّکی، دادپــەروەری خــاوەن شکــۆ،
وا کشومات، لێی خەوتووە؛ هاوڕێکانی ئـەوا مانیان لێ گرتووە
دەبێ ئێمەش چاوەڕێ بین کاوێژ بکەین ڕاست یان یان درۆ

دەڵێن، ئێـوارە چارۆگــەی لــە ڕوخســاری ئاســمان ناکا
تارا ڕووی بــووك دادەپۆشێ؛ عەجــەب زاوا هەمــان ناکا
ئەوا ووشــەی شیعرم، گەلۆ، هــەزار و یێك ڕەنگ دەپۆشن،
کەچی بۆ خۆم ڕەش و ڕووتم؛ هیچ هەوێـن هێوێنمان ناکا.
١٩٩٠/٩/١٨ - هەولێر.

## ١٩٩١

### خاڵە پیرۆت

بە درێژایی شەوی ڕابرد، زرم و هۆڕی تۆپی دوژمن، نەبڕاوە!
خاڵە پیرۆت، بە خۆ و بە باری سەد ساڵەی، ئارام دانیشت،
بۆی حەساوە! ڕیشی تراشی، گڕەی تانك و زرمەی تۆپان نەپساوە!
ماندوو نەبوون، پەیتا پەیتا دەهاتنە پێش، ڕێگەیان لێ نەگیراوە!
خاڵە پیرۆت ڕانك و چۆخە نوێیەکەی، بۆن خۆش کردن،
یێکسەر پۆشی؛ چەند گوللـــە تۆپ بە ناو شار کەوت؛
زیرەی منداڵ گەییە ئاسمان، زووکەن، زووکەن، بە ڕێ کەون!
هاوار لە کۆلانان دەهات؛ دەنگی داوە!
دایك کۆرپەی گرتە باوەش، پشتەکۆڵەی خستە سەر شان؛
بە غار هانای برد بۆ جیران!

- لۆری، پتر لەمە ناگرێ! سوار بن زوو، بکەونە ڕێ.

زرم و هۆڕە، زرم و هۆڕە، چیرەی درێژی ئەعرابان نەپساوە!
خاڵە پیرۆت، پشتێنەکەی لە پشتێ کرد، وەکوو زاوا،
گرم و هۆڕی تۆپی دوژمن، گەیشتە شار! دەنگی داوە!
دار و دیوار، خانووی ڕووخان، هەمووی کردن بە کەلاوە!

- وێنەك، وێنەك! وولەك، وولەك! دەبیسترێ لە هەر لاوە!

عارەب هاتن؛ دەبڕن، دەکوژن، بە بێ پرسیار، بێ بیانوو، بە ئاژاوە!
خاڵە پیرۆت، جەمەدانییەکەی خۆی بەستا!
گڕەگڕی کۆپتەرەکان گوێ کاس دەکا، نەبڕاوە!
هاوارە ئاگر بارانە، کۆرپە لە داك جێدەمێنن!
لە بری ئەوەی خۆ حەشاردەن، سەریان لە عەسکەر دەردێنن!
سەر لەشکری بەعسییەکان، دەتۆقێنن!

گوللەیان لێ دەسترێژ دەکەن؛ ڕۆح لەم خونچانە دەستێنن!
نەپساوە، زرەی زنجیری تانکەکان،
لە ناو هەولێر جلیت دەدەن؛ دەنگیان داوە!
خاڵە پیرۆت، ئارام دانیشت!
کەوشەکانی بریقاندەوە، لە بەر ئاوێنە ڕاوەستا!
بە شێنەیی، دەستی بە سمێڵە سپییەکەی دادەهێنا!
بووم، بووووم، گرمممم!

- وای، ئەم مردوو لێ مردووانە،
خۆ پەند لە مێژوو وەرناگرن، لەم ژیانە!
خاڵە پیرۆت، هێور، هێور گۆچانی کنێری هەڵگرت،

- دەبێ منیش بکەومە ڕێ.
لە کاولەکەیان هاتە دەر!
لەبەر دەرگای ماڵەکەیان، سەربازێکی بۆری چڵکن، زۆر زەبەللاح،
گەلێ تووکن، فرە کوڵکن، بۆی سووڕاوە وەکوو مزراح،
دەسترێژێکی توندی لێکرد!

- ئاخ و سەد ئاخ! خۆ دووبارە وا پیسیان کرد!
خاڵە پیرۆت، پاش قسەکەی، کەوتە سەر چۆك،
چاوی بەرەو تاقی ئاسمانێ هەڵبڕی.
هەر ئەو ئێوارە بوو دیتم، خاڵە پیرۆت وەك کۆترێکی سپی جوان،
دەسووڕاوە لە سەرمان، ئینجا فڕی بەرز فڕی، چووە ئاسمان،
دەردی دڵی هەموو کوردی دەگەڵ خۆی برد،
گەیاندیە عەرشی یەزدان.

١٩٩١/٣/٣ – هەولێر.

یادی کۆچڕۆی هەولێر؛ سەربازانی سەدام شاریان داگیر کردەوە.

## باخچەی خۆشەویستان

ڕۆژێك ڕێگا، منی ڕادا، تا باخەکەی خۆشەویستان،
ئەوەی کە پێشتر نەمدیبوو، لەوێ دیتم،
پەرستگەیێك لە ناوەڕاست، درووست بووبوو،
پاشان هەندە هات و چوونی ئێندەرێم کرد،
لێیراهاتم؛ لە ناو گیا، یاریم دەکرد،
دەروازەکەی پەرستگەکەش، داخرابوو،
(قەت پێناگەی) لە سەر دەرگاکە، نووسرابوو!
بەڵام کە خۆم، گەڕامەوە، بۆ ناو باخی ئەوینداران،
چەند گوڵێکی پشکووتبوون،
ئامادە بوون، پێشکەش بکرێن لە بۆ یاران!
بەڵام هەموو، بە داوە بەن، بەسترابوون،
لە تلیانێك، ڕێز کرابوون،
دەسك - دەسك داندرابوون، گوڵ نەمابوون!
جێیەکانیان پڕ قەبر بوون،
تەڵقیندەران، بە پۆشاکی ڕەشی جوان، ئامادە بوون،
کوڵیکەکان تەڵقین بدەن،
تا داپۆشرێن، لە بەر چاوی هەر هەمووتان!

١٩٩١/٣/١٥ - هەولێر.

## له ڕۆژێکدا

زۆر له مێژه؛
لەو ڕۆژییەوە، هەموو ئێواران دەتبێنم؛
سەد فریشتەی سپی بێگەرد،
گەلێك بە سام،
دێن و هەموو ڕیز دەبەستن!
لە بەرانبەر ئەستێرەیێك،
کە تاریکی شەوەزەنگێك، ڕادەماڵێ،
فریشتەکان کڕنۆش دەبەن.

١٩٩١/١٢/١٥ - هەولێر.

## ١٩٩٢

### خانمی میتران

خانم! خۆتان باش دەزانن کە ئاوارە ماڵی نییە،
میوانداریت تێیدا بکا!
دەنا هەردەم ماڵمان بۆتان گوڵزارێکە!
خانم! خۆتان چاك دەزانن هەژار ناتوانێ تەنانەت،
پەیکەرێکیش بۆ ئەندێشەی خۆی ساز بکا،
دەنا لە سەر، سەردەرەی هەر ماڵێکی کورد، میترانێکمان دادەنا!
خۆت دەزانی کە کۆست کەوتە، بە دیداری ئازیزانیشی شاد نابێت،
دەنا هەتا مردن لە دیداری تۆ دادەما!
خانمی دایك! خۆ بە گاز خنکاوەکانمان،
لە دەسەڵاتیاندا نییە دڵی خۆیان بۆت هەڵڕێژن،
دەنا سەدان ملوانکەی دڵ، بە گەردەنت هەڵدەواسرا!
هۆ خانمە بێهاوتاکە؛ ئێمە کوردین؛ ڕەچەڵەکی چەندین چینین؛
یان بێ باوکین، یان بێ دایکین، یا هەر بێ باوك و بێ دایکین،
یان ئاوارە و دەربەدەرین، یان بە گازی دەمار مردین،
ئەگەر لەو چینانە نەبین، واتا ئێمە پاشماوەی دەستەی ئەنفالین،
بۆیێ، خانم، مەحاڵە، ئێمە بتوانین، کە پەیکەرێك بۆت بتاشین،
وەکوو ئیشت بەهادار بێت!
بەڵام خانم، دڵنیا بە، لەبری ئەودا،
هەموو کوردێك، لە دڵی خۆیدا،
جۆلانەیێکی بۆ ساز دای، ناوی گەورەت دەهەژێنێ،
تا وەکوو یێك کورد بمێنێ، مەحاڵە قەت نایوەستێنێ!

١٩٩٢/٢/٥ - هەولێر.

## ئەمساڵ و پێرار

ماڵەکانمان کش و ماتن! پڕ ئاسایش؛ زۆر ئارامن.
ئەم بارانەش کەوا ئەمساڵ، وا بە سەر ماڵاندا دەبارێ،
لە چەند ساڵە بە ئاوترە؛ گورجتر خۆ بە خاك دەماڵێ.
ماڵەکانمان ئەمساڵ یەکجار کش و ماتن!
منداڵەکان، هیچ کامێکیان ڕەنگ زەرد نییە؛
یان ڕەش داگەڕێ لە زەردی،
یان بۆر داگەڕێ لە ڕەشی،
یان مۆر داگەڕێ لە بۆری،
یان شین بنوێنێ لە مۆری!
هیچ ماڵێکمان ڕەنگی نییە؛ ترسی نییە دەرگای ڕووچێ،
هیچ ماڵێکمان تەمای نییە، شاڵاوی مردنی بۆ بێ،
ماڵەکانمان شەویان کورتە؛ بە سەر دەچێ،
منداڵانمان، لە بێ نەفتی و بێ ئاگری، ڕاهاتوونە!
لە ژێر پێخەفێکی دڕاو، شەوی زستان بە سەر دەبەن.
هەموو دەچنە بن پاڵی یێك، کاشکا باش گەرم ببنەوە!
لە بن زەبری برسێتیدا، نزیکە ببوورێنەوە،
بەڵام هێشتا؛ چونکە ترسی ئەژدیهایان لە بیر نییە،
عارەب لێرە خاوەن کیمیا و شمشێر نییە،
خەونی زۆر بە پێز دەبینن.
لە ماڵ هەموو ئاسوودەنە،
دڵ پڕ هیوا و لە گەمەنە،
ئەمساڵ وەکوو پێرار نییە؛
لەم هەموو بەفر و بارانەش،

هیچ کەسمان لێو بە بار نییە!
هیچمان بۆری دەستی زەرد نین،
هیچمان زەردی دەستی سۆر نین،
هیچمان سۆری دەستی ڕەش نین،
هیچ ترسێکمان لێ بار نییە!
کەس نییە بێ، خانووەکانمان بڕووخێنێ،
بێشکەی منداڵ بسووتێنێ،
کەس ناتوانێ شاڵاو بێنێ،
ناترسین شەو نەکەینەوە،
یاخۆ گرەو نەبەینەوە؛
بۆیە منداڵ، لە بن پێخەف،
وەك زەڕنەقووتەی پاساری،
لە برسان و لە بەر سەرما،
یێك دەچێتە باوەشی یێك،
هەموو دڵیان دەخرێتەوە،
کەچی هێشتا؛ کەسیان وەکوو، کەسانێکی پێرار نییە!
دەگەڵ گزنگی سپێدە، هەرکە لە خەوێ هەڵدەستن،
هەموو خەونی خۆشی خۆیان،
لە بۆ هەمووان، دەگێڕنەوە؛
هیچ دەمێکیان خەسار نییە!

١٩٩٢/٢/٩ - هەولێر.

**له به‌هاران**

لاوه‌كانی عیراق هه‌موو، له به‌هاران
فه‌رمان ده‌درێن ڕاست - چه‌پ، ڕاست - چه‌پ، به‌ره‌و مردن ده‌برێن!
یێك ڕیزی ڕاست، به فه‌رمانی تاوانبارێك، یان ملهوڕێك،
وه‌كوو شه‌خته، هه‌ڵده‌وه‌ڕێن!
ئه‌و لاوانه، چیتر به ڕێی ئاواته‌كانیاندا ناڕۆن،
به ئاره‌زوو و زه‌وقی خۆیان به ڕێگایه‌كاندا ناڕۆن!
ڕێگه پێی له سه‌ریان ده‌نێت!
ئه‌و لاوانه، گوللـــه له دوژمن ناگرن؛
ئه‌وان خۆیان ده‌سووتێنن. به‌نده‌ن، به‌ندن!
ئه‌گه‌ر ڕۆژێك بایێك هه‌ڵكا،
به سه‌ر یێك عیراقێك، هه‌ڵكا
تروسكه‌ی وای له‌گه‌ڵ هه‌ڵكا،
ئاسمان كه‌رت كه‌رت ده‌كات لێیان!
له به‌هاران، كه گوڵ ده‌بته ئارایشتی شاران،
لاوه‌كانی ئه‌م وڵاته،
ڕاست چه‌پ، ڕاست چه‌پ، فه‌رمان ده‌درێن
هه‌موو وێكڕا، به‌ره‌و دۆڵی مردن ده‌برێن!
هه‌ڵده‌وه‌ڕێن، هه‌ڵده‌وه‌ڕێن!
چیتر ئاگر ناكه‌نه‌وه؛
ئاگر ئه‌وان ده‌كاته‌وه، جا ده‌سووتێن!

١٩٩٢/٣/٢٣ – هه‌ولێر.

## هەولێر

کانـی فیکرێکی ڕوونی؛ خۆشتریـن خاکی؛ ژینی؛
ئاوازی هەمیشەیی، خۆشی بۆ هەمووان دینی؛
لە فەرهەنگی هەناسە، وشەی مردن دەردێنی؛
ئاخـر ژیـان سۆزتـە، باوەش لـە گوڵ وەردێنی!
هەولـێر گوڵی؛ شایانی، خورپەی دڵی هەموانی!
مایـەی خۆشی ژیانـی؛ بینایـی دوو چـاوانی؛
قزگـەی خۆشی و سەیرانـی؛ جێی شانازی و ژیانی
مەلبەندی عەقڵ و هزری، هیوا و ئومێد و مانی
هەولـێر کانی هەڵبەستـم، ڕێچکـەی ئاخر مەبەستم
بە شیعر بۆت هەڵبەستم؛ بە ڕووح بە تۆ پەیوەستم،
تۆی پەنجەم، لەپم، دەستم، عیشقی پاکی پڕ هەستم،
بـە دووریـم لێت، زۆر پەستم، بە دیدەنی تۆ مەستم
هەنجیر و گوێز و مێوت، هەنـار و شەکـرە سێوت،
بە فیدای خاك و نێوت، هـەر گەش بن چاو و لێوت،
خۆشن هەوراز و نشێوت، ئەشکەوت و گرد و کێوت
بـە بەرینی ڕووپێوت، هەر گەش بن مێژوو و نێوت
١٩٩٢/٢/١٣ - هەولێر.

## شەو ئارامە

پەڵە هەورێك، وەك چارۆگەی سەر ڕووی یارم،
وا پێشی لە مانگ گرتووە، دنیا هەموو پێی سەرسامە!
ئەم شەو سەیرە! کوردستانیشمان، ئارامە!
قەڵای هەولێر، دایکی هەموو شارستانی،
نەهەنگێکە، پاش گەشتێکی هەزاران ساڵ، لە ماسیگر ترسی نییە؛
لە لێواری ئۆقیانووسێك ڕاکشاوە، پڕ داستانە!
شاخی سەفین، شەیدای ئەمەکداری قەڵات، حەپەساوە!
ئاخر ئەوە یێکەم جارە لەم سەدەیە شەو تاریکە، بەس ئارامە!
شنەی شەماڵی ئەم شەوە، ماڵی نەڕمێ، چۆنە منی وا دۆزییەوە؟
عاشقێکی بێهاوتایە، ئا بەم کاتە خەواڵووە، وا هاتووە؛ دەملێستەوە!
ئیگزێنەفۆن دەگەڵ دارا، هەردوو ئیمشەو، دازڕاوە لە چاویان خەو؛
هاتوونە مەجلیسی ئێمە، سەرما نەبێ، دیدەنی یاران بە تامە؛
ئاخر ئەم شەو بەشێکی خاکی کوردستان، دوورە لە دەستی دوژمنان،
بۆیێ دانیشتن مەرامە!
لە واشنتن، مۆسکۆ و لەندەن، پاریس، بەرلین، پێکینگ، دبلەن،
باش لە دەردی من تێدەگەن،
هاتوون دڵم دەدەنەوە، وا توند باوەشم لێ دەدەن.
داخ لە بەغدا!
ئەم کۆنە پایتەختەی خۆمان، بۆ وا بۆتە دوژمن لێمان؟
چی مەبەستە؟ نازانێ ئەم شەوە خۆشەو، دانیشتنیشمان پڕ هەستە!
دۆستانیشم گەلێك زۆرن، پشتیوانن،
ئایندەشمان پڕ هەیبەتە، زۆر بە تامە.

١٩٩٢/٢/١٥ – هەولێر.

**ئەمجارە**

کە من بۆ مردن نەوەستام، مردنیان هێنا سەر ڕێگام،
کە لێم لادا، خزاندیانە نێو جێگام!
بۆ خۆم کێشەی دیکەم زۆرن؛ سەرم دێشێ، چاوم کزە، دوو گوێم
تەپە، پێنج ددانم دەرهێنراون، بیست و حەوتیشیان کلۆرە،
بێجگە لەمە نەخۆشی دیکەشم زۆرە.
سەرەڕاشیان؛ مردن لێی دزیوم بزە!
هێشتا دەیوێ چاوەکانم پڕ کا لە گڵ، بقرتێنێ لە بڕکا، گوڵ ،
تەماشاکەن! لووتیان پڕی کیمیا کردم،
نە کەس بە هاوارمەوە هات، نە من مردم.
بەڵام ناچار، دەبێ ڕێچکەی هیوا بگرم،
بچمە سەر شاخ، لەوێ لە سەر بەرزترین لووتکە، هەڵدەم بەیداخ.
سەر کێوە، کێو، بۆی سەرکەوە، بەرزە دەماخ!
چوومە پێش دەری ئەشکەوتێ، کاشکا ساتێ بحەسێمەوە،
لە سەر تا پێم بە ڕابردوومدا بێمەوە،
زەینم دایێ، تێیگەیشتم چەندین سەدە،
وەك یێك سعات، ڕەتبوون؛ هیچیان هی من نەبوون،
لەم کازیوەی کۆتایی سەدەی بیستەمە،
ئەگەر گەلۆ، گشت یێك نەبین،
سوود لە ڕاپەڕین وەرنەگرین؛
مەحاڵە هەڵێکی دیمان بۆ بێتەوە!
ڕێی دی نییە! دەبێ ئەمجارە سەرکەوین.
١٩٩٢/٢/١٥ - هەولێر.

**بەیانی**

بەیانی دێ؛ لە دوای دەڕوا بەیانی دی؛
ڕۆژان دەخشن، لە شوێن ڕۆژان، ڕۆژانی دی،
لالە دێت و ڕەوشەن دەکات شەوانی من،
کورتە مۆمێك دەتوێتەوە، تا جێی بگرن، مۆمانی دی!
تاریکییەك دەڕەوتەوە، ڕووناکییێك دەژیێتەوە
ڕووە و دوا چاخن، هوڕن دوێنێکانم،
هەر سێبەرە ڕەشدەبتەوە، تەمام وەکوو جارانی دی!
بە ناز دەخوا لە سەر شانۆ ساتێك زەمان،
ئەویش دەڕوا و ڕادەبووریٚ؛
سەت دەر سەت وەك ئەوانی دی!
چیرۆکەی گێل پڕی دەنگ و خارۆرەیە،
هێمای هیچە، بە هیچ دەڕوا ژیانی دی!

١٩٩٢/٢/١٥ - هەولێر.

لە هزری شەکسپیرییەوەیە.

**دەڵێن..دەڵێم**

دەڵێن وەرە ... ئاڵای ئێمە بەرز کەوە،
سپی دەڵێ - ها ئاڵای من،
سوور بانگ دەکا - بەیداخی من،
زەرد پێم یێژێ - عەلەمی من،
ڕەشە دەڵێ،
مۆرە دەڵێ،
سەوزە دەڵێ،
پەمبە دەڵێ؛
دەڵێن ... دەڵێن؛
هەموو دەڵێن؛
منیش دەڵێم -
دەستتان بێنن،
هەموو وێکڕا، تەنیا یێك ئاڵا بڵند بکەن؛
ئاڵای ئازادی و یێك بووغان،
کە هەموومان
تەنیا یێك ئاڵایێکمان بوو، ئەوکات وەرن،
داری پەرچەمی پیرۆزتان لە ناخ دڵم داچەقێنن!

١٩٩٢/٢/١٥ - هەولێر.

**نەورۆزە، یان ئازادییە!**

ئازادییە! یا نەورۆزە؟
نەورۆزە یان ئازادییە؟
یا نەورۆزە و ئازادییە!؟
نازانم! لێم تێکەڵ بووە!
لە خۆشیانا، هەر خۆشییە!
دەزانم کە پێکەنینە،
هەم شاییە، هەم شادییە،
دەست لە دەستە، دەم لە کوڵمە،
زەردەخەنەی ناخی دڵمە!
هەر پیرۆزە، هەر پیرۆزە،
هەم ئازادی و هەم نەورۆزە!
یێکەم جارە، لە وەتی هەم، لە تەمەنم،
نەورۆزە دێ و پێدەکەنم!
ئای لەم کاتە چەند بە سۆزە!
ئازادییە یان نەورۆزە،
یان نەورۆزە وا بە سۆزە!
ئاسمان ڕوونە، ئاسۆ بێگەردە، بێ تۆزە!
ئازادییە و هەم نەورۆزە.
خوایە، خوایە لە گەلی کورد،
گەلەك سوپاسگوزاری تۆن،
درشت ورد، ئەمجارە بیکەی پیرۆزە.

١٩٩٢/٣/٢١ - هەولێر.

**لە بەهاران**

کە گوڵ دەبنە ئارایشتی شاران
فەرمان دێت و لاوەکانی ئەم وڵاتە؛
ڕاست چەپ، ڕاست چەپ،
ڕاپێچ دەدرێن، بەرەو مردن، بە هەزاران!
بە تاوانی پێك ملهوڕێك،
هەڵدەوەرێن وەکوو گەڵای زەردی داران.
لە بەهاران،
کە گیا دەبتە جغزی یاران،
لاوەکانی ئەم نیشتمانە زۆر شێتە،
وێکڕا هەموو،
وەك ڕانە مەڕێکی برسی،
گشت ڕادەدرێن،
بێ ئیرادە!
ڕێ، پێی دەنێتە سەر سەریان،
لە بەهاران،
لاوەکانی عیراق چیتر، هەوجاڕ نادەن لە کێڵگەکان،
چونکە زەوی دەستی زاڵە
بە سەر دەستیان،
ئەو لاوانە، هەگیز ئاگر ناکەنەوە،
ئاگر ئەوان دەسووتێنێ بە هەزاران!

١٩٩٢/٣/٢٣ - هەولێر.

**بەرزی و نزمی**

لە سبەینان، لە نیوەڕوان، لە ئێواران، پەنجە لووسە درێژەکانی، بە ئارامی داوێتە بن چەنەگەی و لێی دەخەوێ! ماندووە، خەوتووە، یا هەر گاڵتەجاڕی دەکات و وا دەنوێنێ کە نووستووە! لە تەنیشتی لای چەپی من و لای ڕاستی تۆ، ڕنە لە زەوی گیردەکات؛ من کێك و چایە دەخۆمەوە و نان و ماستیش دەخۆم، ئەویش پارچە سەهۆڵێك دەتوێنێتەوە و دەیکاتەوە ئاو! فەرجانجارێکی زۆردار کەی وەك مرۆڤێکی دادپەروەرە؟ بەڵام هێشتا هەر دەگریێم؛ بە ڕۆژوومە، گریام بۆخۆم و لەخواش پاڕامەوە، نزاکردنم بۆ خەڵك بوو؛ هەر چەندە مووی سەرم کەم و زۆرێك ڕووتاوەتەوە؛ بەڵام مێشکم لە ڕووداوەکانی ئەم سەردەمەدا، شتر بووە.

سەرم لە سەر لەنگەرێنێکی ژەنگاوی فڕێ دراوە! نە من پێغەمبەرم، نە قوتکردنی سەرم کێشەیێکی گەورە پێك دێنێ؛ چونکە سەردەمی ئەوە نەماوە مرۆڤ ببێتە پێغەمبەر و کەسیش نییە شکۆفەیێك لە هەورازی سەرم بکات. پاشی دەمێك ترس دامدەگرێ!

ئایا سەرجەم ئەمەی دێتە ڕێی مرۆڤ پاش بادە فڕ کردن و قاوە خواردنەوە و پیاڵە شکاندن، بە هۆی چایە خواردنەوەیە؟

فەخفوورییەکان وێنەی شەیتانیان لێ کێشراوە، چەند قسەیێکی من و تۆشیان لێ نووسراوە، خۆ نووسین زەهیر نییە بەڵام جێی مەترسییە!

ئایا ئەو بابەتە و ئەم هەموو کێشمەکێش و مشتومڕە ئەوەندەیان دەهێنا کە من و تۆ بە یێکەوە نووسینەکانمان بۆی بخنکێنین؟ زەردەخەنە لە ناو هێلێکی نەنووسراودا ڕەسم بکەین و کەینوبەینی خۆت و خۆم بخەینە قاپی خواوەندەوە. دەڵێن پێکەنین موڵکی مردووانە و سیمی بێتەل دەقرتێنێ!

دنیا دەخەمە ناو تۆپێکی کونەوە و لە تۆقی گردێکی پرسیارەوە گلۆری خوارێی دەکەمەوە و وەڵامی هەموو پرسیارەکانیش لە لاپەڕەیێکی ڕەش بە مورەکەبێکی ڕەشتر دەنووسمەوە.

ئێمە لە دوای ئەنفال لە نێو گۆڕێکی بە کۆمەڵ هاتین و ململانێ دەگەڵ مردن دەکەین. پێشتان دەڵێم: کچ پێش شوو کردنی سەرین ڕێك دەخا، بەڵام کە مێردی کرد دۆشەکەکەی بنە خۆی و پیاوەکەی گوڵڕێز دەکات. گوڵڕێزی نیشانەی ئەوە نییە، ئایا ئەمە ئەوەندە دێنێ، ئەمە دێنێ دەسرۆك لە سەری مردووێك بئاڵێنێ؟

خۆر ئاوا بوو. حەوشەکان، خیابانەکان، نەخۆشخانە ڕشاوەکان، ئاوارە خاوەن وڵاتەکان، پیاڵە بەتاڵەکان، بنکراسە تەنك تەنکەکان، کە لە جێی نووستنی کوێرەیێك لەنجە دەکەن، چینە؟ ناشێ پیا و هەموو دەردی دڵی خۆی بۆ خەسووی بگێڕێتەوە؛ چونکە لە خەڵکی جیاوازە، شاد نابێ بە خەڵك بەخشین، زۆر ڕەوایە، زۆر وریایە؛ بەڵام ئەم گێلاتییە دوای خستووە.

قۆشمەچییێك، جاری وا دەبێ سەردوولکە بۆ زیندووان دەڵێ! من پیر دەبم، ڕۆژێك دێ کڵاشەکەم دەخەمە سەر پێڵاوەکەم و دەرپێیەکەم لە جیاتی پژدێنەکەم لە پشتم دەئاڵێنم، خەتی پرچم دەخەمە پشتی سەرم و خۆخێکیش بە ساغی قووت دەدەم، پانتۆڵێکی فانیلەی سپی لە پێ دەکەم، لە قەراخی ڕووبارێکی وشك بوودا مەلە دەکەم. جا کە پەرییەکان دەمبینن؛ هەموو وێکڕا سەما دەکەن. ستránان نابێژن، سواری شەپۆلی با دەبن، بۆ ناو دەریا دەچن، قژی سپی شەپۆلەکان شانە دەکەن، منیش لە ناو قولغی تەمی سپێدەیێکی زوو، ئاواتەکان حەشار دەدەم. منیش، بۆ خۆم، نقووم دەبم.

١٩٩٢/٧/٢٨ - هەولێر.

**پێشوازی!**

دەبێ ڕاست بێ؟ دیسان، دڵم خوێنی جەرگم دەخواتەوە!
دەبێ ڕاست بێ؟
دیسان لە مێرگی کوردستان، زامم - برین دەشواتەوە؛
شەهید تەرمی شەهید بەرەو گۆڕستانێ دەبات؟
دەبێ ڕاست بێ لە کوردستان، ڕوو بە ڕووی مەرگە ڕێگا و بان؟
ڕاستە، هات بێ؛ هاتی خوێنە؟ سبەم هەتیوە، بێ شوێنە؟
بەڵام ... خۆرم ز..ە..ن..گ..ی ..... ژ..ی..ن..ە!
کە هەڵبێ، هەڵدێ ئایینە،
خۆ من بیرم ڕوونە، ئاڵە!
بێژینگ دێنن، ڕۆژ حەشار دەن!
بۆ کوشتن دێن، کورد لە ناو بەن!
قاسملو کوژرا لە ناو چوو؟ نا وانییە،
قاسملو هیچ نەمردیە.
شەرەفکەندیش چووە سەفەر،
مێژوو دەردێنێ لە خەتەر،
پێش ئەو هەموو، سەرکردانە،
قازی ئیمامی شەهیدان،
گەوهەری تاجی ئازادی، جەمانەی سەر سەری هەمووان!
یێکە یێکە مروارینە،
ئەستێرەنە، لە ئاسمانێ داباریـنە،
بۆ خەناوکەی گەردەنی ئازادی کوردان،
چووینە پێشوازی لێکردن، لە سەربەخۆیی کوردستان.
١٩٩٢/٩/١٩ - هەولێر.

**ژوان و شیعر**

لــە چاوەڕێی ژوانـی قەدپاڵ
بـــۆ کچێکی چـاو گـــەش و کاڵ
بـە کوڵمێکـی زۆر گەشی ئـاڵ
وشە، وشە، شیعرم باراند!
لـــە ســـەر کانی بنار و خـاك
لــە ئێوارەی بێگـــەردی پــــاك
سۆز و عیشق پێکیان گرت چاك
ئاوازێکمان پێکرا ڕەخساند
بـەرد و ئـاو و پـاوان و شـــاخ
بەفر و سەرما و لەرزین و ئاخ
تــرس و خۆشی پەڕینـــە ناخ
چاوەڕوانیمان پێی سووتاند
هاتی! عیشقــم تامکـــە، بزانە
ڕاستە، ڕەنـــدە، ڕوونە، جوانە
خونــاوی گیــای بەهارانـــــە
بە سەر قژی تۆم داباراند.
١٩٩٢/٩/٢٢ - هەولێر.

**شیعر و چاوت**

شەرمە! شەهدی شیعری شێتێك، لە شەكر شیرینتر نەبێت،
درێغا! دێڕێ بۆ دیدەت كە ڕێك دەخرێ، لە فرمێسك چڕتر نەبێت،
بۆیێ من هۆزان دەنووسم، كاشكا جارێ وشەیێكی، ڕستەیێكی،
لە ئاسۆ بەرینتر دەبێت، بە دەریای دوو چاوت دەچێت.

١٩٩٢/١٠/١ - هەولێر

**کفن کڕ**

شەڕ کە دەهات،
دە کەس لە پێش،
بیست کەس لە پاش،
سی لە ترسان،
ڕێگە و بانیان بۆ چۆڵ دەکرد!
چل کەس،
بە هێز؛
خەڵکیان لە پێشی ڕێز دەکرد!
دە کەسی دی،
دەرگایان بۆی دەکردەوە،
خاوەیان بۆ دەبردەوە،
بن کەوشییان، ناو لینگیان،
دەلێسیەوە،
بۆنی ئارەقەیان دەکرد،
دەستە، دەستەش،
کۆیلە، کڕنۆشیان بۆی دەبرد!
وا بوو شەڕ چوو،
ڕۆیشت؛
ئاو و ئاو چوو،
بەڵام کە چوو،
کفن کڕیشی بۆ نەبوو!

١٩٩٢/١٢/١٥ - هەولێر.

## ١٩٩٣

### بۆ کورد

ڕۆژ بوو،
خوای شەڕ دێوێکی دووکەڵی ڕەش بوو؛
زۆر بە تاو هات،
پرچی سپی دایکی گوندی، دەستکەنە کرد!
برۆی چڕ و زیتی باوکی هەموو شاری، هەڵکڕووزاند!
لێوی خوشکی سەر تا بەری قەڵاتەکەی،
ڕاست وەکوو مووس، بە خەنە کرد،
گۆنای سووری کۆرپەی هیوای هەموومانی، تەواو، سووتاند،
گوارەی گوێی یێکە یێکەی کچەکانی، هەموو، قرتاند!
ئاخ و سەد ئاخ!
لە دەست گەندە بەندەی خوای شەڕ!
بە گڵپێکی گڕی قینی،
زەردەخەنەی منداڵێکی دە ساڵانەی کوژاندەوە!
دانیشتبوو پێتاوی خەڵکی ڕەنگ دەکرد،
خوێنی گەشی تێکەڵ بۆیاخی پێڵاو بوو،
جوولەی نەکرد!
کاسبکار بوو، کاشکا خێزانێك دەژیێنێ،
لە ناو کونی کۆنە کەوشی بۆیاغ نەکراو،
لە سەر پەڕی زەردی ڕۆژنامەیێکی نەفرۆشراو،
ئەمڕۆ خوای شەڕ، ڕق ڕشاوە،
دەست لە نێو دەست،
پێ لە شوێن پێ،

سەدام و دار و دەستەکەی،
وەك هیتلەری سەرقافڵەکەی،
هاتنە ئێرە، لەم هەولێرە،
خنخنۆکەی مرۆڤیان گرت،
بالیفۆکەی خوای زیندەوەر،
لە ناو پێستەی هینایە دەر،
ئاخ لە دەستی خواوەندی شەڕ!
لە داخ گەندە بەندەی نۆکەر!
شەیتانی دۆزەخی تاریك!
ئەهریمەنی عەقڵ باریك!
پەنجەی هەر گوللـــە دەتاشێ،
هەر لە لوولەی بۆمبی گەورە،
خوێن و ژەهر و سەری بێ جەستە دەناسێ،
بۆیێ مردووی، کوشتنی منداڵە کوردە،
ئەو منداڵەی لە سەر شۆستەی خیابانێك،
خوێنی لەگەڵ پارچەی بووکە شووشە و بۆن و خامە،
دەگەڵ وێنەی ژنی نیمچە ڕووت و مێدالییەکان، تێکەڵ بێك کرد.
بەڵێ، سەدام حوسێن، وایکرد!
دەڵێی هێشتا هەر تێناگات،
ئەم قەڵایە، شاپ لە سەدی وەك ئەو دەدا،
هەرگیز بۆ کەس کڕنۆش نابا،
شێوەی سەفین، ئەویش هەرگیز قەت چۆك نادا!

١٩٩٣/١/٢٣ – هەولێر

لە پاش تەقینەوەی ئوتومبێلە بە مین داڕێژراوەکە، لە هەولێر!

**هاتین - هاتن**

هاتین؛ کانییەکی ڕوونی بنارێك، چاو دەینەوە؛
هاتن؛ کۆنکریتیان لێنا!
هاتین؛ نەمامێك بڕوێنین، ئاو دەینەوە،
هاتن؛ ئاگریان تێی بەردا!
هاتین؛ ماڵێك درووست بکەین،
هاتن؛ بلْدۆزەریان لێیدا!
هاتین مۆمێك داگیرسێنین،
هاتن؛ تاریکییان هێنا!
سەیرە ئەوانە تێناگەن!
چەندێك تاریکیان هەیە،
لە مێشکیان،
لە ڕەفتاریان،
لە ڕەوشت و لە باوەڕیان،
هەمووی بێنن!
بۆیان ناکرێ چرای گەشی کوردایەتی دامرکێنن.

١٩٩٣/٢/٢٣ - هەولێر.

**وەك من!**

ئەرێ دەبێ، لەم ژیانە کەسێك هەبێ، وەك من ماندوو؟
وەك من عەودالْ؟ شەیدای کڵاوی با بردوو؟
ئەرێ دەبێ، کەسێك هەبێ،
شەکر لە قوڕگی ببتە ژار؟
دەبێ هەبێ، وەك من کەسێ؟
خەمی کوردی داپڵۆسێ؟
قەت نەسرەوێ، نە درەنگ، نە زوو ؟

١٩٩٣/٥/٨ - هەولێر.

**بچووك**

بچووك تەنیا چی لە دەست دێ؟
تا تەنیا بووم،
ڕاستە بە ورە و توانا بووم؛
بەڵام هیچم بۆ نەدەلوا!
دەبێ هەر خۆم چم پێ بکرێ؟
بەرانبەرم ڕۆحی پاکی ئیمام حوسێن
وا چۆتە بەر جەستەی کۆرۆش،
بە خوێنی کورد دەستی دەشوا!
ئای بێکەسی چۆن کار دەکا!
سوڵتان سلێمان قانوونی،
پەڕ پەڕ یاسا دەسڕێتەوە،
دادوەرەکان دەخنکێنێ،
هێشتاش دونیا، لە سەر تاپا،
کاری ئەویان لا ڕەوایە!
داد و بێداد هاواری من،
بە گوێی ئەوان دێت و دەڕوا!
بچووك، کەرت - کەرت،
لەم سەردەمە زۆر بێ شەرمە،
چی بۆ دەکرێ؟
خالد، قەعقاع، زیادی باوك نەناسراو،
لە سەر سینەم، سەرخەوی خۆیان دەشکێنن،
کافر بابێك، بە غەڵەتی،

ماناى قورئان تەفسیر دەكا!
ملهوڕێكی شێتی بیژوو،
ئەنفال لە سەدەی بیستەمدا،
بە فرمێسكی منداڵی كورد، ڕەباس دەكا،
زەهیر ئاسا، دەستی خۆی دیت، هەموان دەكوژێ،
هەندێ جار، بە درۆ دەگریێ،
جاری تریش، دەچتە مەزاری كەربەلا؛
لەوێ ئەسرین بە خۆڕایە!
چاوی پڕقژنی گریانە،
یان لە پاشتر كاروانی تیرە و گڕكانە؛
زاڵم، ڕوو ڕەش، زێنعابدین سەردەبڕێ؛
لە سەر كەللـــەی مرۆڤ دەڕوا!
ئیمڕۆش بچووك بە هەڤاڵە، نە تەنیایە!
ڕاستە دیمەنی شارانی، شلەژاوە؛
هات و هاوار و هەڵلایە!
شێخەڵلایە، بە هەموو شكۆمەندی خۆی،
لە ناو گۆڕی موبارەكی قیت بۆتەوە،
بە پێش هەزاران مرید و شێخ و دەروێشی خۆی كەوتووە،
ئێسكی كوردی هەژار دەخوا!
ئێستا بارێكی لاسارە،
پەڵە هەورێكی بەهارە،
دەبارێنێت، چڵكی دڵان دەشوا.
ئینجا دەڕوا.

١٩٩٣/٣/٢٥- هەولێر

**هێلانە**

کۆترێکیان لە هێلانەکەی وەدەر نا؛
کۆتر فڕی،
فڕی، فڕی، بەرز فڕی،
دەشتی قەلدا،
دۆڵی پەلدا،
زێ پەڕیەوە، چیا سەرکەوت،
چەندەها سنوور دەرباز بوو،
لە سێبەرێك،
ڕەشماڵێکی شڕی هەڵدا!
ڕۆژ زنجیرەی کرد و ڕۆیی، نەپساوە!
وەرزێك هات و یەکێك ڕۆیی؛
کەژ لە پاش کەژ، ساڵ لە دووای ساڵ، نەبڕاوە!
باران باری، بەفری تێکرد، سەهۆڵبەندان کڕێوەی دا،
کۆتر هەردوو باڵی تێکنا.
دەنووکی بردە بن پەڕی و پێلّووی نوقاند،
یاغر یاغر ڕەشماڵەکەی شەختە بەستای،
کۆترە ئاوارەی لانەواز،
ڕاوچی و تاژی و قورمە و داوی،
هاتنە خەون،
هەناسەیێکی هەڵکێشا، ساردتری کرد!
هێدی هێدی پەڕەکانی سپیواژ بوون،
پەنجەکانی بەستان، تەزین؛

کۆتری تۆقیو،
دەشتی دوور و مێرگی سوور و
لیس و بێچووی یاد کردنەوە!
بۆ دیداری هێلانەکەی،
داندانی بێچووە جوانەکەی؛
دم. دم. دم. دم. دڵی لێیدا.
هەر چەند هێلانە نەما بوو،
بێچووەکەش ئەنفال کرا بوو،
دانی لەگەڵ ژەهری کیمیا و
سایەناید و گازی خەردەل، تێکەڵاو بوو،
بەڵام هێشتا یاددشاتەکان
بە جۆرێك ئۆقرەیان لێ برد،
غەریبی بۆ ڕاوچی و تاژی،
فاق و قورمە و داو و تەپکە،
گڕی لە کۆترێ بەردا،
کۆتر هەستا،
هەستا، هەستا،
دایە شەققەی باڵ و فڕی،
فڕی، فڕی، بەرز فڕی!
هەر بەو ڕێیەدا هاتەوە
کە پێشترێك،
چوو بوو پێیدا.

١٩٩٣/٧/١٦ – هەولێر.

یادی ڕۆژی بوونی ئاڵای کوڕمە.

**ببی یانا، نەبی، ئەمە گرفتەکەیە؟**

To Be or not to Be, that is the Problem! Shakespeare.

ئەگەر ببی، یان هەر نەبی، لێرە کێشە پەیدا دەبی،
ئایا باشە ئەگەر مرۆڤ،
بۆ هەر تیر و توانجێکی کە بەختی لار بۆی دەنێرێ، مل کەچ بکا؟
یا خۆ ئایا ئەگەر زەریایێك لە گرفت پێشی لێ گرت، ئازایانە بیبەزێنێ؟
بۆ خۆی، بخەوێت؛ چیتر نا!
بەم نووستنەش دەکرێ بڵێی - دڵ ئێشەمان کۆتایی دێت!
ئەمە، ئەوە کە دەتهەوێ - خەو و خەوتن!
بەو مرازەی تێر، تێر بنوێت خەو ببینیت؛
ئەوە داوە و دەتخنکێنیت!
ئەرێ! ئایا لەم نووستنە دوور و درێژەی وەکوو مردن،
خەونێکی وا دەبیندرێت؛ لە پاش مردن ڕزگارت بێت؟
دەبێ لێرە هەڵوەستەیێکی بۆ بکرێت!
هزرێك هەیە کە بێ گومان لەم تەمەنە درێژەدا نیگەرانە؛
کێ دەیەوێ، شەقی زەمانەی بەرکەوێ؟ زوڵمی زۆرداری پێکەوێ؟
تیر و توانجی ملهوڕانی بۆ خۆی دەوێ؟
کێ دەیەوێ لە ژانی عیشق بسرەوێ؟
یاسای سەردەم دوا کەوێ؟ بەر شاڵاوی کاربەدەستی نەزان کەوێ؟
ئەو جووتانەی کە نەزان لە زانای دەدات، کێ دەیەوێ داپیلۆسێ؟
ئەو کاتەی بە خەنجەری ڕووت، پرۆسەی ژین کۆتایی دێ،
خۆی لە خۆیندا دەگەوزێنێ! هیچیشت بۆ ڕێك ناکەوێ.
۱۹۹۳/۷/۱۹ - هەولێر.

١٩٩٤

## سیاسەتمەدار

○ هیچ نازانم، من زۆرزان نیم،
ئەوەی فێر بووبمە ئەوەیە،
من شەڕ ناکەم، چونکە زیانی بۆ ئێمەیە!
زۆر بە ئازایی و بێ شەرم؛ جاڕی دەدەم، دژی شەڕم!
○ دادوەر با هەر لێم لالووت بن،
هەموو پەڕە بۆرەکانی ئەو کتێبە ئەستوورانە بە با بدەن،
با بەند بەندی ئەو قانوونە وەزعییانە، بۆ ئیدانەم، کارا بکەن!
لەم هەڵوێستەم دانابەزم!
جاڕی دەدەم؛ من دژی شەڕی کورد کوژم!
دژی هەموو جۆرێك شەڕم! باش تێبگەن!
○ با بزانین، ئا ئەم شەڕە، چۆن شەڕێکە؟ دژی کێیە؟
ڕێگەی جەنگاوەر بۆ کوێیە؟
ئەو ڕێگەی دەڕوا بۆ مەیدان، کامە ڕێیە؟
هەندەرانە؟ گۆڕستانە؟
مەرد بن، جاڕ دەن،
ئەگەر (کوردن) نیشانمان دەن؛ لە کام جێیە؟
○ شەڕە، شەڕە،
خۆ شەڕی ئازادی نییە!
تەنیا شەڕی کورد کوژییە!
شەڕە کوردە، نە کاری مەردایەتییە!
دەی با بیلێین لە سەر چییە؟
من تا ئێستاش هەر هەوڵ دەدەم،

تێدەکۆشم تا تێی بگەم!
چاوی ڕاستم، دیدی چەپم، با بکۆڵن،
پەنجەی چەپم، باسکی ڕاستم،
کەللـــەی سەرم، هەموو جەستەم، با بشکێنن،
بەس کوردستان مەفەوتێنن!
شەڕی ئێوە، نەفرەتێکە، لە کورد دەکرێ،
دڵی هەرگیز نەترساوم، وا دەلەرزێ!
لە گەورەیی کارەساتا، وا دەتۆقێ!
سوودتان چییە، زوو ڕایگرن؛ ئەم شەڕە وەستانی نییە!
○ شەڕە؛ بەم شەڕەش دەڵێم - نا! نا، نا، سەت نا!
من دایکی خۆم ناسووتێنم،
تەرمی باوکم لە گۆڕە زۆر پیرۆزەکەی، دەرناهێنم!
نا، نا! هەولێر نابرژێنم!
گەر بۆم بکرێ،
ئەوەی سلێمانی دەگرێ، وەکوو شەیتان، دەیسووتێنم!
توانام بێت، هێزم هەبێت، خوێنی ئەو شێت دەکوڵێنم
کوردستان تۆپباران دەکات، وەکوو بتێك، دەیڕووخێنم!
○ دادوەر، با هەر، چاوی لێمان سوورکاتەوە!
دەبێ بزانێت، لەبەر چییە شەڕم ناوێت؛
من لە پێشی ڕاپەڕیندا، زوو دەکوژرام،
گەلێك جاران ئەنفال دەکرام!
لە ناو پۆلی خوێندنمدا،
بەدڕەفتاری، فێری منداڵەکەم دەکرا!
کە دەهاتن، شەپۆل شەپۆل، منداڵی کورد بشێوێنن،

پەیتا - پەیتا ڕێی خوێندنیانم دەگۆڕی،
بە هێوری، کوردایەتیم دەرس دەدا!
ئەو کات دادوەر،
لە کام بەندەر، کیها هەندەر، لە ناو کام باڕ سەمای دەکرد؟
پێکی شەرابی فڕ دەکرد؟
لە باوەشی ئارتستێك بوو، مەمەی دەمژت!
دەبا دادوەر بڕواتەوە، تووڕداتەوە،
بەس قایل نیم ئیتر چاوی سوور کاتەوە!
○ سەیر ئەوە، دادوەر بۆ خۆی، تاوانکارە!
سەرۆکی باندی چەکدارە،
دژی خەڵکە، ستەمکارە!
بەربەستی ئیرادەی خوایە، جاڕیداوە،
حوکمی ئیعدامی ئەم شارە!
لە بۆ مێژوو - ئەگەر ڕۆژێك یاسادار بم،
مەرج بێت دادوەران هەڵواسم،
لە دەروازەی ئەم قەڵاتە بریندارە!
○ تراژیدیای من لەم شەڕە، نەبوونی زەڕڕەی باوەڕە!
ئەم شەڕە عەینەن سەگوەڕە!
من لەم شەڕە، بکوژ خۆمم، کوژراو هەر خۆم!
نەفرەت خۆمم، یەقین، نەفرەت لێکراو، هەر خۆم!
ئابڕوو و حەیابەریش، خۆمم،
سڵاو! قەت هیچ کەسم نەما، ئەویش هەر خۆم!
دەڵێم نەفرەت لە خۆم دەکەم!
کڕ بم، نەڵێم، دیسان نەفرەت لە خۆم دەکەم!

ڕاوێژ، چی بکەم!
○ دادوەر = ئەنفال!
دادوەر = ئیعدام!
دادوەر = وێرانی کوردستانەکەم!
دادوەر = کیمیا،
دادوەر = خەردەل!
دادوەر = گاسی دەمار کوژ!
دادوەر = لاوی کورد کوشتن!
دادوەر = ئێسقانی گۆڕی بە کۆمەڵ! کۆکەنەوە لە ناو شەرواڵ!
دادوەر = سەت جار سەرت تاشن؛
هەی بێ دەستونوێژ، هەی بێ بەرماڵ!
○ خۆزگە دایکم، وەك دایکی ئەو شەڕبازانە،
نەیدەزانی باوکم کێیە!
خۆزگە باوکم خوێندنی فێر نەدەکردم!
بۆ خوای مازن، کرنۆشی پێ نەدەبردم!
خۆ لەو دەمی دەبووم بە دز، یان بە ڕێگر،
ئەوجا، گەلۆ، بۆ داگیرکەر، دەبوومە پرد!
ئەگەر ئەوەم بۆ ڕێکنەبا، هەر نا، هەرنا،
خۆ دەبوومە زرپە سیاسەتمەدارێکی ناسراوی کورد!
بەڵام هێشتا، باوەڕتان بێت،
ئەو کاتیش کوردم نەدەکوژت،
خوێنی کوردێکم نەدەڕشت!

٣-١٩٩٤/١/٤ - هەولێر.

دوای شەڕە گەورە خوێناوییەکەی ناو هەولێر.

## سەفین

شەو ئارامە!
پەنجەی ڕەحمی شنەی شەماڵ،
نەرم - نەرم، دایکم ئاسا،
قژی سپیم شانە دەکا!
ئەستێرەیێک لە دوورەوە،
منداڵیم وە بیر دێنتەوە؛
دەردەکەوێ، بزر دەبێ؛
چاوشلکانێی منداڵیمە،
ئەوا لە بۆم دەیگێڕتەوە.
کێوی سەفینیش لە شوێن خۆی،
وەکوو باوکم، سێبەرم بۆ دەنێتەوە.

۱۹۹٤/٤/۱ - هەولێر

**سەفین گوتی**

هۆ سەر سپی!
هەرگیز وەك منت پێناکرێت!
وا خەریکم، هێمای پیرییەکەم لا دەبەم؛
گەنجییەکەم بۆ دێتەوە!
کەچی تاجە بەفرینەی سەر سەرت،
هەر لە شوێنی خۆی دەمێنێت،
قەت لا ناچێت،
تاکوو نەتبا،
مەحاڵە بڕەوێتەوە!

١٩٩٤/٤/١ - هەولێر

## شەڕی کورد کوژی

بیانووی چی!
بە زیندویێتی و بەر لە مردن،
شینێکە، بۆ خۆم دەیگێڕم!
پێش من، گەلۆ! کێ شینی بۆ خۆی کردووە؟
شین دەگێڕم!
لۆمەم مەکەن؛
چاوەڕوانی چەند ساڵەی من، هێشتا هەر نەبڕاوەتەوە؛
کەچی دڵم وا خەریکە، جمگەی مێشکم سەردەبڕێ!
جەرگم خوێنم دەخواتەوە!

*　*　*

گەزەنگ تازە،
دەزووی ڕەش و داوی سپی، لە یێك جودا دەکردنەوە،[1]
کەچی لە ناخی شەوەزەنگ،
لە ناو مێژووی نەبوونی من،
دیسان ڕێشمەی ئەسپەکانیان وا کردەوە!

*　*　*

بیانووی چی! چەرمەسەری بە خۆم دەکەم،
پێستەی تەڕی منداڵی خۆم، بە خۆم بۆ دەباخچی دەبەم!
بیانووی چی!
گەورەترین پاڵەوانی ئەفسانەی خەباتی تازەم، پێشمەرگەیە!

---

[1] ئاماژەیە بۆ ئایەتی پیرۆزی ژمارە ١٨٧ لە سورەتی البقرة کە دەفەرمێ {حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ..} .

پێشمەرگە وا دەکوژنەوە!
گشت، زوڵم دەکەن لەم ناوە!
تا ئەم کاتە، واتان لەم ناوە کردووە،
هەر ناوێکە، بێ ناوەرۆك ماوەتەوە!
بیانووی چی؟ لە ماڵی خۆم، وا کوڕی خۆم، دەرم دەکات!
هەڵمدەبڕێ، لە شاری خۆم، لە ژووری خۆم، دەرم دەکات!
لەو گەڕەکەی هەر لە ڕۆژانی منداڵیم، لەگەڵ کچە جیرانەکەم،
تەمامان بوو، خۆشەویستی پەروەردەکەین،
لە ناو هێلانەی دڵداری،
بێچووە باڵندەی پاساری، بە جووتە بحەوێنەوە،
زامی یێکتر بلێسنەوە!
کەچی ئەمڕۆ، لەم گەڕەکە و بێ بیانوو،
یارەکەیان کێوی کردم!
تا ئەم کاتەش، هەر پەراگەندە و ماندووە،
سەد ئاخ! نەحەساوەتەوە!
کەی ڕەوایە، سروەی بەیانم بکوژن!
کەی ڕەوایە، خوێنم بە ڕەقیب هەڵمژن؟
بیانووی چی؟!
شێتە ئەوەی لەم کوردستانە پڕ خەمە،
ئاسوودەیە و بە بێ خەمە!
شێتە ئەوەی، بەر لە مردنی خۆی ناگرێ!
دۆڕاوە کێ،
ئاو لە جۆگەی لە ناوچوونی خودی دایکی، تەواو نابڕێ!
دینە ئەوەی،

بەر لە خنکانی کۆرپەکەی،
لە کوشتنی دڵبەرەکەی،
زیندە بە چاڵی باوکەکەی،
بەر لە فەوتانی خۆی ناگرێ!
بیانووی چی؟
چتان هەیە تا بیانوو بە یێك بگرن؟
چتان هەیە تا گەنجی کوردی بۆ بکوژن؟
بیانووی چی! سەیری، هەولێر!
شەرمی سەتان ساڵ ژێردەستی، بە قەڵاکەت هەڵواسراوە!
وا دوو ساڵە، پڕ بە دڵم، چاوەڕێمە،
پەلە هەورێکی بەهاری، بێ و بباری!
گەواڵەیێکی بێ ئامان،
بێت؛ لارییەکانمان ڕاماڵی!
کاشکا کوردان پاك کاتەوە،
عەیب و عارمان بشواتەوە!
بیانووی چی؟! شاڵاوی خوێن؛ خوێنی کێیە؟
خوێنی خۆم و هی دایکم و هی باوکم و کوڕ و کچ و ژن و داپیرەی
ناوگۆڕ و خوێنی هاوسێ و برادەر و هەموو خێل و ناو هۆزمە!
بێ بیانوو، بۆچی دیسان دەمبەنەوە، بۆ ناو زیندانی بێگانە!
بۆ بەر باهۆزی کیمیایی! پێش شالاوی ئەنفالەکان!
بۆ ناو شانۆی بزر بوون و مێژووی ڕاستی خاکی وێران!
خۆتان بکوژن، من بکوژن، هەر یێك خوێنە! نێرگزێکی کوردستانە!
بیانووی چی ماڵی هەموومان وێرانە!

١٩٩٤/٥/٥ - هەولێر

**مافی دوژمن**

ئەمڕۆ دوژمن مافی هەیە بە ئاشکرا، باسی مردنی کورد بکا؛
چونکە کورد خۆی، ژیانی خۆی ڕەت کردەوە!
ئێمە خۆمان نامانەوێ دیسان داکمان، ژانی لێبێ و ئێمەی ببێ!
نامانەوێ ئێمەیێکی تازەی ببێ!
لە دەقی یاسای سرووشتی، بوونی ئێمە، هەڵەیێکی زۆر گەورەیە!
هەرگیز، بە کەس ڕاست نابتەوە!
بە گڕی داخێکی ناخ دڵ، پێتان دەڵێم –
ئێمە ئامێری ئەشکەنجەین، ئێمە ئامێری کوشتنین،
ئێمە، لەم سەدەی بیستەما، ئەهریمەنێکی مردنین!
لە فەرمانی سلێمانێك، سێ هەزار ساڵە یاخینە،
ئەگەر چوار دنیای دیش مابن، تا باکوور و باشوور مابن،
تا فارس و تورك و عارەب، هەر سێك، مابن،
گەر ڕۆژهەڵات، گەر ڕۆژئاواش، بۆ کوردی نابینا، مابن،
قوربانی ناکۆکییەکانمان، تەواو نابن!
ئێمە هەموو، لە سەردەمی سەهۆڵبەندی بەر لە مێژوو،
هەستاینەوە، هاتینەوە،
درۆیێکی دیرۆکینە، تا خوێن مابێ، دەیخۆینەوە.
گەلۆ! ئێمە تاعوونێکین بە هەر گەڕەکێکدا ڕەتبین ژیانی لێ دەبڕینەوە!
جێی پەنجەمان وەك شوێنی بۆمبی ئەتۆمە؛
بەر هەنگاومان دۆزەخێکە، هەموو وێکڕا ئاڤێستا دەسڕینەوە.
بۆیێ ماف بە دۆژمن دەدەم، تا جاڕی مردنمان بدا!
چونکە، قسەی وان ئەوا ڕاست دەرچوو:
ئێمە کوردین، کوردی خۆ خۆر، نە تۆ خۆتی، نە من بۆ خۆم خۆمم!

نە تۆ منی، نە من تۆمە؛ بەڵکو بێ شك، تۆ کێوەلی و منیش دۆمم!
زویر مەبە! ڕاستی تاڵە، ڕاستی، لە کن خۆپەرستان، ژاری مارە!
تۆ خۆت هەرگیز ناهێنیتە پلە و پایەی منی ئینسان؛
قایل نابی لە نێو نوێنی دڕاوی من تەنیا سعاتێك، بخەوی،
لە سەر سەرینی دۆمێکا، تاکە سعاتێك بسرەوی،
قایل نابی لەبری من؛ خەم هەڵگری، یێك جار بمری!
زۆری وەك من، گەلەك وەك تۆ، لە کاتێکی ناکۆکیدا، مافیان خورا!
زۆری وەك ئێمە هەردووکمان، بەرهەڵستی مردنیان کرد،
پێشگری ترس و قینیان کرد،
ئەوەی وەك من و تۆ نەبوو، ڕێگای بڕی، لە زۆنگاوی مردن دەرچوو.
ئای دەترسێم تۆ بۆم بگری و منیش بۆ تۆ! مەترسییە!
بۆ ئەوەی تۆ خۆت دەربازکەی، پێی خۆت بخەیتە سەر سەرم.
نیگەرانم! گەر تەنگاو بیت، لە حەولە ڕۆح وەهات لێبێ، کە نەمبێنی!
کاکی برا، بە ڕاستی زەندەقم ڕژا، ململانێ لە ناومان با!
چونکە مافمان دایتە دوژمن، تا ئاشکرای مردنمان کا.
دڵنیامە تۆ خۆت لە کن زۆر گەورەیە، منیش تۆم لا، زۆر مەزنە!
تۆ ئەو دەستەی هەویری منت شێلاوە،
ئەو گۆچانەی باری ساڵانی ژیانم بۆ هەڵدەگری،
تۆ ئەو دەستەی لە هەڵەبجە، ئاوی پاکت بۆ هێناوم.
تۆ ئەو کەسەی، گۆڕی بە کۆمەڵی ئەنفال، نەیتوانی ڕێگەت بگری،
ئەی ئەوەی ئێستاکە دەیکەن، توخوا بڵێن - لە سەر چییە؟
ئەگەر ئێوە لە ناو بچن، لە پاش خۆتان، چیتان لە پارە و کورسییە؟؟؟؟

١٩٩٤/٥/١٢ - هەولێر.

تازە شەڕی ناوخۆی هەرێمی کوردستان هەڵگیرسابوو.

## هاوار

سووتاندمیان،
ئاگریان لە جەستەم بەردا؛
چونکە ئاگر هی دوژمن بوو،
هیچ نەسووتام.
خنکاندمیان،
چونکە گوریس هی دوژمن بوو،
قەت نەخنکام.
گازمەرگ بارانیان کردم،
چونکە ژارەکەی دوژمن بوو،
زیندوو بوومەوە و نەمردم!
ئەی ئەمجارە؟
هاوار بۆ کام کورد کوژ بەرم؛
بێ بمکوژێ تا نەمرم؟
ئەمجارەیان،
دەستی بکوژ،
دەستی خۆمە!
لە ڕێی ڕۆحم شارەزایە؛
ڕەنگە بمرم!
سەیرە نەمرم!

١٩٩٤/٨/١١

لە دەفتەری شەڕی کوردکوژ!

**لەعنەت**

ڕۆژنامەی برایەتی لە ژمارە ٢٠٣٦ ڕۆژی ١٩٩٤/٩/٥ بڵاو بووەوە.

تەمەن بەرەو خەزان دەڕوا!
ڕێگەم بدەن، با ئەمجارە،
لەم سێبەرە، بە شێنەیی، بۆ ژوانێك شۆڕبمەوە،
بەرەو پایز ڕاپێچ دەدرێم،
مەمترسێنن! مەمتۆقێنن!
لەم قەد کەژە،
بە ئارامی، شیعرێکی خۆش دەهۆنمەوە!
لە چل پەیژە وەسەر کەوتم،
لەم هەوارە،
قورگم مەگرن، ڕێگەم مەبڕن،
دەنا، گەلۆ، ڕۆژێك دادێت، لە وڵاتێکی غەریبی،
بە ناچاری،
بێ پێناسە و بێ پاسپۆرت و بێ پەرلەمان و بێ ڕێبەر،
ئەگەر قەڵەمم دەست کەوێ،
مێژووی ئەو لەعنەتەی بە گوڕ، لە خۆمان کرد، دەنووسمەوە!

١٩٩٤/٨/١١ - هەولێر.

ئەمەش میوەیێکی دیکەی کورد کوژییە!

**دار بەڕوو**

ئەگەر بارزان بسووتێنن، گەر تاڵەبان خاپوور بکەن،
خۆڵەمێشی هەردوو دەڤەر، ئەگەر تێکەڵ پێکتر بکەن،
پێك دڵۆپ خوێنی شەهیدێك، بەو تێکەڵەیەدا بکەن،
دار بەڕوێکی لێ شین دەبێ؛ ورد بنەوە! مەزەندە کەن!

١٩٩٤/٨/١٢ - هەولێر.

شەڕی کوردکوژ هەر بەردەوامە.

**کەی وایە؟**

لەم کوردستانە کەس هەیە، وەکوو من بێ؟
سەر لێ شێواو و پەشۆکاو؛ دڵ کون کون بێ؟
لە جۆلانەی دەرکی بیرێکی بێ بن بێ؟
دڵێك هەیە وەك دڵی من، هەر خەون بێ؟!
دەی! سەیریکەن دڵم چۆنە، دڵم عەرشێکی بەرینە،
قزگەی کەیفە، هەنگڤینە، دڵم هەموو کوردستانە! ئای ڕەنگینە!
کوردستان بۆ خۆی کانییە، زۆر گەورەیە،
شەکرە، نوقڵە، شەهدە، شیرە، گەزۆی زۆر خاسە، پەنیرە،
هەردە، وەردە، پاسارییە، قوڕە، بەردە،
یارە، عەشقە، دایکە، باوە، شوورە و سەنگەر؛ بایە، ئاوە،
پێکەنینە، جێی یارییە،
کۆلکەزێڕینەی سەد ڕەنگە،
سۆرە، مۆرە، کەسکە، زەردە،
کشوماتە؛ پڕی دەنگە،
کوردستانەکەی من ژینە؛
مەرد بە، کوردە، خۆشەویستی لێ بڕوینە.
ئەم کوردستانە هەنگوینە.
مامە...کاکە!
بە کوێرایی چاوی دوژمن، وا بوونە گەورەی ئەم خاکە.
سەروەریتان بۆ چییە گەر
کەسێك نەبێ پێتان بڵێ: کارتان چاکە؟
بوون بە ڕێبەر، کەی وایە گەر،
کەسێك نەبێ بەرپێت بە برژانگ بماڵێ،

پێت بێژێ ڕەحمەت لەو داکە!
مامە، کاکە - کاکە، مامە!
بە پەرۆشم، بە تەمامە،
مامکاك ببێتە کاری کۆك، مامکاك ببێتە شەمامە!
مامە، کاکە...کاکە، مامە، کاکە، کاکە، مامە، مامە!
کەی ئەوەی دەکرێ تەمامە؟
ئەگەر مردین خوشکێك نەبێ؛ براڕۆمان لە بۆ بکا!
کچێك نەبێ باوکەڕۆمان لە بۆ بکا!
دایکێك نەبێ ڕۆڵەڕۆمان لە بۆ بکا!
کەنگێ ڕاستە، هاوسێ نەبێ، لە پرسەمان ئامادە بێ!
کەسێك نەبێ ڕۆندکمان لە بۆ بڕێژێ،
کەسێك نەبێ کفنمان لە بۆ بکڕێ،
گۆڕێکمان لە بۆ هەڵکەنێ؟
مەلا نەبێ تەلقینمان دا!
کەی ڕەوایە؟
ئەم وڵاتە بەرەڵڵایە!
سەد جار هاوار؛ ئەی خودایە!

١٩٩٤/٨/٢١

لە لاپەرە ڕەشەکانی شەڕی ناوخۆ

## داو

تازە کازیوەی بەیان بوو،
هەوری تاری خۆربارانیش خەریك بوو بڕەوێتەوە،
تازە باپیرە گەورەمان، تەما بوو زیندوو بێتەوە،
یێکەمجار بوو ڕاسای کچم،
باخچەی ماڵە بچووکەکەم، گغەگغی بۆ دەکردم.
یێکەمجار بوو پاوان دەکرا پیرە مێژوو،
بە نیاز بوو تۆزی ژێردەستی، لە جەستە شاردراوەکەی،
تەرمە کفن نەکراوەکەی،
داوەشێنێ!
یێکەم جاربوو، لە خاکی خڵتانی خوێندا،
لە کوردستانێکی ونی، بێ خاوەن، بێ سەر و شوێندا،
تەمای گزینگی خۆرمان بوو!
هەستاین لە خەو،
ئومێدمان کرد دەرچین لە شەو،
دراوسێکان هاتنە قسە!
قسەکانیان پەرەی سەند و بووە گەڤی گەورە لێمان!
بووە مادە، بووە ئاسن،
کەوتە دەستی بیری تەسك،
کەوتە ناو قاری بازاڕی،
لە باخەڵی گەورە و بچووك هێلانەی کرد،
چووە ناو پیاڵەی چایە،
هاتە نێو پێکی سەر مێزان،
بووە بنێشت، دەمانجوی؛ خۆشمان دەکرد؛

ئەویش شوێنی خۆی خۆش دەکرد.
تیژمان دەکرد،
ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گەرمتر و دەمدەم، بەهێزترمان دەکرد،
هەبوو کڕنۆشی بۆ دەبرد!
کڕنۆشبەر چوونە سەر کورسی، کورسییەکان ئەنتیکە بوون!
بەم دوو چاوانەم من دیتم - کورسییەکان سووڕیان دەخوارد!
بەرپرسەکان بە سووڕانی کورسییەکان؛
ئایا گێژ بوون، یان گێژ کران!
لە سەر چوکلێتی جەژنانە، بوو بە شەڕیان!
وەزیر خۆی و بریکاری،
بەرانبەر یێك، لە بەر چاوی هەموو میللـــەت،
خۆیان ڕووت و قووت کردەوە، سەد مخابن؛
وا کەوتنە گوریس پساندن!
ئاوارەکان، لە ماڵ وەدەر نراوەکان،
لە کەرکووك و لە شنگاڵ و لە خانەقین و مەندەلی،
بەرانبەر ئەو مەسئوولانە، پەیتا پەیتا لە برسانا
دەم نا دەمێك، پژدێنەکانیان توند دەکرد.
لە گوومرگ و لە سنوور و لە بازگە و بازاڕ و بانق و لێژنەکانی موشتەرەیات،
تا دەگاتە خاوەن شکۆ و وەزیرەکان،
لە بەرانبەر برسییەکان، گیرفانەکانیان پڕ دەکرد!
گیرفان پڕ گـ.. مل قەوییەکان، تێرخواردوەکان،
بووینەتە خاوەن شانۆییێك، تراژیدیا پێشکەش دەکەن،
شانۆگەری قسەی زل - زل نمایشە،

له بن پەردەش، خوێنی هەژار ورشە - ورشە!
زمان سێ چوار کیلۆمەتر درێژەکان،
گەوج و گێلی کوردستانیان تەیار داوە،
لە سەر بانان، ڕایانگرتوون؛
لە خوێندنگا و قوتابخانان، ڕایانگرتوون؛
لە سەر بانی نەخۆشخانان، ڕایانگرتوون؛
لە بن کلکی کەری گولە، ڕایانگرتوون؛
یاساوڵان هێندە گەوجن؛
هەر ناپرسن - هیچ ناپرسن -
ئەرێ بۆ کوڕە گەورەیێك،
کوڕی وەزیر،
یان نیرینەی سەرکردەیێك،
لە سەر ئەم هەموو بانانە،
نەوەستاوە؟
هێندە گێلن،
قەت ناپرسن -
ئەرێ بۆ کوڕە گەورەیێك،
نەوەی پارە و سەرکردەیێك،
هەتا ئێستا، نەکوژراوە؟
ئەمە داوە! هەر بۆ هەژار هەڵواسراوە!
هەژارەکەش مێشکی لە ناو،
کیسەی پارەی سەرکردەکەی هەڵگیراوە.

١٩٩٤/٨/٢٢ - هەولێر.
لە دەفتەری شەڕی کوردکوژان.

## هەر بنووسە

پێشکەشە بە پاڵەوانانی شەڕی ناوخۆی کوردستانی باشوور

من گلەیی لە کەس ناکەم،
هیچ هاوارێك بۆ کەس نابەم!
گەلۆ! گازاندە و فریادم، نادەن دادم!
لە بارزان گۆڕ هەڵدەکەنم،
لە تاڵەبان گۆڕ لێدەدەم!
تەرمی گەنجێکی ئەم لایە، بۆ وێ دەبەم!
تەرمی لاوێکی ئەو لایەش، دێنمە ئێرە!
گۆڕی ئەو بۆ تەرمی ئەم بێ، گۆڕی ئەم بۆ تەرمی ئەو!
پرسەیان با لە هەولێر بێ،
یان با بڕوا بۆ سلێمانی!
شین دەگەڕێ،
لە دەروازەی ڕاپەڕین بێ، لە سەر تاتی دەستنوێژانی!
فەرقی نییە،
نە تازییە، نە لە ناو گۆڕ، نە بادینی، نە سۆرانی!
بۆ کورد هەقە ماڵوێرانی!
شین دەگەڕێ؛
ڕیزی دووری دڵ سووتاوان، تا سنووری حەمرین دەچێ!
گەلۆ، لە خۆم شەرمەزارم! لەو کوشتارە زۆر بێزارم!
خەونم، بینی، هەزار خەونی بۆ هێنا بووم!
دێوی تەونی سەر ڕێگاکەی بۆ هێنا بووم!
زاوای ئەلوەندی هێنا بوو،
نازانم چی لە دەستدا بوو!

شەپۆلێك هات، زاوای بردم؛
بووکی خەونی لێ خنکاندم!
خزمان ، بڵێن!
کرنۆش بۆ کام سەرۆك بەرم!
باسی کامە سەرۆك بکەم؛ نەکەم شەرم؟
دەڵێم بە شێخی بەدلیسی،
با قەڵەم دانێ، نەنووسی؛
ئەوەی لەم ناوە ڕوودەدا،
دەچنە بن باڵی فلوسی!
چونکە خۆی مرد بۆ گەلی کورد؛
بۆیێ قازی ناوی نامرێ!
ئەوەی شێخ سەعیدێ کردی،
ئایا بەم سەرانە دەکرێ؟!

١٩٩٤/٩/٢ - هەولێر.

## دەبێ کورد بن؟

پێشکەشە بە پاڵەوانانی شەڕی ناوخۆی کوردستانی باشوور

ئاخ کوردستان؛ لە داخی تۆ!
دڵم بۆتە گورزی مردووی،
دەستی مردووی،
جەستەی مردووی،
فیکری مردوو!
ئاخ کوردستان!
دەدە، تا چل، گوڵێك دەمرد، نەمامێکم لە جێی دەچان،
شیعرێکی پەمبەیی ڕەنگم، شەهید دەبوو،
ڕۆمانێکی شایانی پاداشتی نۆبێڵ، دەهاتە لان.
دەدە، تا چل، باوکی کاکەم بە دڵ پەرست،
مامەم ڕێز گرت، کاکەم خۆش ویست.
کاکە و مامەم، بێ جیاوازی، پەیکەر تاشی.
وێنەی هەردووك، کاکە و مامەم بە خۆشەویستی و پڕ ئومێد،
دوور لە ئامۆژگاری سوکرات[1]، کردە قاشی ئەنگوستیلەم.
هزری خۆمم کردە هێلانەی پێشمەرگە،
دڵم کردە فەرهەنگی ناوی شەهیدان،
سۆزم کردە پیرێکی پاکی زەردەشتی،
چاوم بوونە شێخ مەحمود و لە سەر بەرماڵی بارزانی،
لە میحرابی کوردایەتی کڕنۆشم برد!
هەر دە پەنجەکەم داگیرساندن،
شەوی تاریکی هەولێرم، ڕوون کردەوە،

---

[1] سوکراتی فەیلەسوف دەڵێ – (وێنەی فریشتان لە سەر قاشی ئەنگوستیلەکەت دامەنێ!)

سی ساڵ وانەی کوردایەتیم،
لە هەموو کونجی کوردستان، بۆ منداڵی بێنازی کورد، شی کردەوە،
کتێبەکانم خوێندەوە، لیستی ناوی هەڤاڵانم دەکردەوە،
پۆلی خوێندنم لێ ببوە مەیدانێکی دوور لە کۆڵدان،
بیورێکم گرتبووە دەست،
ڕەگی دڕکی دووبەرەکیم لە ناخ مێشکی قوتابیان، هەڵدەتەکان!
سلێمانیم دەهێنا بۆماڵی باوکم،
دهۆکیشم دەهێنا بۆ ماڵی باوکم،
کەرکووکیشم دەهێنا بۆ ماڵی باوکم،
شەنگاڵیشم دەهێنا بۆ ماڵی باوکم،
خانەقینم دەهێنا بۆ ماڵی باوکم،
هەولێریش هەر لە وێندەر بوو؛
دایکم بە قژی سپیەوە، بەو گۆچانی بە دەستییەوە،
بە پشتی کووڕ، تەنی لاغر، بە چاوی کز، دەستی لەرزۆك، نەسلەمیەوە؛
دەهات بە ئارامی دەنیشت، لە یێك کاتدا؛
شیری پاکی، پڕ ئەزموونی، هەزار ساڵەی کوردایەتی، بە هەموان دا،
هەمووی پێکرا، لە باوەشی پڕ ڕەحمەتی خۆی دەگرتن،
بە دەنگی قووڵی دایکانەی پێی دەگوتن -
هەموو کوردن؛ هەموو یێکن؛ تاکن، یێکن، دوژمن سەتن!
کاکە، مامە! دەبێ دایکم بەو تەمەنە پڕ ئەزموونەی، هەڵەی کردبێ؟
درۆی دەگەڵ هەموان کرد بێ؟
یا دەگونجێ، لەم وڵاتە، کەس کورد نەبێ؟؟!!

١٩٩٤/١٢/٢٢ - هەولێر.
لە دەفتەری شەڕی کوردکوژان.

## مانگرتووان

مانگرتووان، ئێوە زۆر ئازا و سەروەرن،
سۆزی ئێمەن؛ قورگی ئێمەن؛ دەنگی ئێمەن؛
چرای ڕێگەی ئازادینە؛
هزری ئێمەن؛
بەهرەمەندن؛
زۆر ڕەشیدن؛ زەنگی ئێمەن!
مانتان گرتووە، ڕێبەرێ مەن؛
لەگەڵتانداین؛
لە دواتانداین؛
لە پێشتانداین.
ئێوە مێژوو دەنووسنەوە،
ئێمەش هەموو سوختەتانین!
هەنگاو داوێن،
ئێمە خاکی ژێر پێتانین!
ئەوەی ئێوە ڕسوای دەکەن،
ئێمە، هەموو، بەر نەفرەتی مێژووی دەدەین.
ئێوە ئەی پەرلەمانتارینە،
خوێنی تازەن؛ دڵی تازەن؛
ئومێدی نەوەکی تازەن؛
ئیمڕۆ ئیوە نمایندەی کوردەکانن؛
بەیداخی سەربەستی کوردن؛
هەر ئێوەشن، ڕابەرمانن.

١٩٩٤/١٢/٢٣ - هەولێر.

١٩٩٥

## تابلۆیەکانی براکوژی

لەم سەردەمە، زمانی سەرکردەکانمان
درێژترن لە ناو دەمیان!
سێبەری سەرکردەکانمان
بەڕێزترن زۆر لە خۆیان!
**
سەرکردەکان
درۆی سەر عارد ناکەن بۆمان؛
وەك پاسپۆرتی شاردراوەیان،
زمانی دووەمیان هەیە، کە پێی دەکەن درۆی ئاسمان!
**
سەرکردەکان
مەنجەڵێکیان ناوەتە دار؛
لە سەرڕا شەکری تێدەکەن؛
بەڵام خودا مەنجەڵ بگرێ؛
لە بنڕا ژەهری لێ دەردێ.
**
سەرکردەکان
هەموو شتن؛
لە ئاشتیپەروەر بترازێن،
هەر چی بە خەیاڵت دادێ، ئەوان هەون!
**
سەرکردەکان،

شووشەی هەموو ئوتۆمۆبیلەکانیان ڕەش کردووە؛
ئاخر دڵیان زۆر ناسکە،
ناتوانن زۆرینەی برسی گەلەکەیان،
ببینن بە چاوی خۆیان؛
لەو کاتەی دەرۆزە دەکەن.
**
سەرکردەکان،
گەلێ لە هۆی ڕابواردنیان ڕێکخستووە بۆ هەژاران!
سەیر و تەماشاکردنی تۆیۆتا هاردتۆپەکانیان؛
بەجێماون لە ڕەفیقە بەعسییەکان؛
کاتێك بە ناو شاردا دەڕۆن لێی دەخوڕن!
هەموو ئەو عارەبانانەی قەرەباڵغی کن شێخەللّاش،
جێ هێلراون، بۆ نەداران.
**
سەرکردەکان،
لە هەموو کات بە سامتر و پڕ هەیبەت و شتی ترن،
کە لە سەر کورسی دەوواری دائیرەکان، وەك مریشك، هەڵدەنیشن،
بەڵام پێش وەی قسە بکەن!
**
سەرکردەکان،
زۆر شیاون،
کە بە خانەوادەی شەهید دەڵێن -
ئێستا، بڕۆن؛
پاشان خۆمان، پەیوەندیتان پێوە دەکەین!

**

سەرکردەکان،
ڕووناك بیرن!
بە چەند زمان قسە دەکەن،
لە هەندەران، بە زمانێك،
لە گەڵ گەورەکانی خۆیان، بە زمانێك،
لە گەڵ ڕۆژنامەنووسەکان، بە زمانێك،
لەگەڵ ژنان، بە زمانێك!

**

سەرکردەکان،
ڕشتن لە سەر کار کردنیان؛
بۆیێ هەر دەم وەك مشارن؛
دێن دەبڕن، دەڕۆن دەبڕن!

**

سەرکردەکان،
زۆر لە خەمی ئەم گەلە دان؛
شاریان ئەمین کردووە بۆیان؛
ئاخر هەموو دزەکانیان،
ناردووەتە سەربانەکان!
بۆیێ شاری بێ خاوەنیش؛
دزی و کوشتنی لێ نییە!

**

سەرکردەکان،
بە گشت مانا سەرکردەنە!

تەنانەت تا لە خزمەتی بێگانەشدا،
کەم وێنەنە!
**
سەرکردەکان، کە هاتنەوە لە هەندەران،
دوو نەریتیان هێنا بۆمان –
یێك – هەژاری؛ دووەم – دزی!
کە دەچنەوە،
لەم وڵاتە یێك شت دەبەن دەگەڵ خۆیان –
داهاتی گشت گوومرگەکان!
**
سەرکردەکان،
ئا لەو شەڕە کوردکوژییە،
هەر ڕۆژ دەیان ماڵی کوردیان تاڵان دەکرد،
دەیان خێزان کۆستیان دەکەوت؛ دەبوونە پرد،
پاشان بێ خەم،
یاغر یاغر سەرکردەکان بە سەریاندا، تێدەپەڕین، ڕەویان دەکرد.
**
سەرکردەکان،
لەم دەڤەرە، دزیان کردۆتە پاڵەوان!
ڕێگر وا بوویتە قارەمان!
خوێن وا خەنە بەندانییەتی،
پێشمەرگەکەش، وا لە برسانا، شێوەنییەتی!
١٩٩٥/٦/٤ – هەولێر.
ئەمەش کۆرپەیێکی تری شەڕی کورد و کوردە

## دووری تۆ

له دووری تۆ، دڵ منداڵه و ئۆقره ناگرێ،
منیش به خۆم،
حاڵگرتووی ئەڵقەی زیکری تۆم؛
عاشقێکی خواوەندانەم؛
دەست و دوعا له میحرابی خۆشەویستیت، خۆم دێوانەم!
له گێژەنی چڕی ئەو دەریاچەی هزرم،
له زۆنگاوی شەڕی کوردکوژ،
تۆ هەر دەژی له ناو مێشکم،
سەرچۆپی گریانت دەگرم،
گەر نەتبینم، له بۆت دەمرم،
عاشقێکی میوانی ئەو دیوەخانەم،
ئەوینی تۆ دەسووتێنی و ڕەوشەن دەبێت،
ئەو ئەوینه نه کوێستانم بۆ چۆل دەکات،
نه گەرمێنم بۆ جێدێلێت،
هاوار، هاوار شۆخه گوڵم!
وەره فریام، با بەم شەڕە،
له بنەگەی ناو باوەشت، سەرخەوێکی خۆش بشکێنم،
بۆ دەمێك بێت، با کورتیش بێت،
بێنێك بدەم، ئۆقره بگرم،
کچێ، جوانێ، له ناو دۆزەخی شەڕی کورد،
مردووی ئەم خەونه خۆشانەم.

١٩٩٥/٩/١٣ – هەولێر.

**ڕێبەرێن مە!**

دەستتان خۆش بێت!
کورد کوژراوە، خۆی کوژرابوو، ئێوەش هاتوون دەیکوژنەوە!
دەستتان خۆش بێت!
پێشتر بە دەستی دوژمنان، چەرمەسەری پێکرابوو،
ئێوەش هاتوون، هێشتا کەوڵی دەکەنەوە!
دەستتان خۆش بێت!
دوژمن گەلەك ماندووی کرد و برسی کرد و چەوساندیەوە؛
ئێوەش هاتن، ماندوو و برسی دەکەنەوە!
دەستو خۆش بێت! وەکوو دوژمن سەیری دەکەن، دەیبڕنەوە!
گرینگ نییە، ئێمە چۆنین، یان چۆن دەبین؛
کام شەپۆڵ ڕامان دەماڵێ، لە کام بەندەر لەنگەر دەگرین!
گرینگ نییە؛ دەستتان خۆش بێت، بمانکوژن!
دەستتان خۆش، بماندۆشن، هەڵمانمژن!
وەك ڕانێکی بێ شوان و وێڵ،
کامە خەرەند زۆر هەڵدێرە، بەرەو ئەوێ ڕامان دەن و هەڵماندێرن،
بێ ترس بن، دەستتان خۆش بێت؛ ئێوە بوێرن! ئێمەیش شایانی دۆشینین! شایستەی خوێن و برینین؛
دایکانمان با کۆستیان کەوێ؛ ئەو دایکانە وا فێر ببوون!
منداڵەکان هەر هەتیو بن!
ئەوەی کوردە شایستەیە کە نەسرەوێ،
کورسی ئێوەش گەورەتر بێ، زگتان لە بەهرە، پڕتر بێ،
گیرفانتان با گەرمتر بێ، ئاخر ئێوەن ڕێبەرێن مە!

٢٠/٩/ ١٩٩٥ - هەولێر.

**خەڵووز**

پەشیمان نیم، لە دڵداریت،
پەشیمان نیم خۆشم ویستی،
من بە دەریای ئەوینی تۆ،
شۆرامەوە لە تاوانی خۆپەرستی!
دڵداری تۆ، شەپۆل دەدا،
ڕووناکی لە ناخ هەڵدەکا،
پەیتا پەیتا،
گەیاندمییە لووتکەی بڵندی سەربەستی!
خورپەی دڵ و چرکەچرکی سعاتەکەم،
لە گومانی چاوەڕوانیت،
لەگەڵ کزەبای گڕ گرتووی زەمانی بە پەلەی، نەوەست،
گێژەنێکی حەلقەی زیکری خواپەرستی،
لە ناوەندی مێشکم دابەست،
ئەی خانمە زۆر ناسکەکەم،
گەر تۆش وەك من
خولیای تنۆکی فرمێسکی عیشقێك دەبووی،
قەت نەتدەهێشت
لە چاوەڕوانیت بسووتێم!
ئەم سووتانەی من وەك ئەوە،
دڵی ساردی نامرادی بتوێتەوە،
کەچی هێشتا، هەر چاوەڕێم؛ بۆت دەسووتێم!
سووتانی من نابڕێتەوە!

١/١١/ ١٩٩٥ هەولێر.

## پەری

بەیانی بوو،
هەنگاو منیان لێدەخوڕی بۆ دەروازەی چارەنووسی ڕۆژێکی نوو.
دڵم پڕ ئومێدی تازە، فیکرێکی ساف؛
هێدی، هێدی، ئارام، بێلاف،
سەرم سارد بوو.
دڕۆیشتم. لە هیکەوە، دیوار شەق بوو!
لە دەرگاییێك، بووکێکی ڕێك،
شلك، شلك، لێو بە خەندە، کوڵم پەمبە، ڕوو بێ پەردە؛
گرژییەوە! چۆلەکەکان گۆرانیان گوت،
وردە بەردی سەر ڕێگاکەم هاتنە سەما،
چڵکاوی پیسی جۆگەکان، پاك بوونەوە، بوونە ڕووبار، شەپۆلیان دا!
جل و بەرگم یێکتریان گرت، بە جەستەمدا شۆڕ بوونەوە!
دڵ و هزرم ڕاست تێك ئاڵان، بوونە شەیدا!

- بەیانیت باش!
- وەی گیانت باش!
- ئەرێ کاکە! لێم ببوورە! سعات چەندە؟

زەمان لە کاکی بێچارە، کۆستی کەوت و سعات ئامێری بێکارە!
نەمزانی نە سعات وەستا، نە زوبانم چارەنووسی سەخت گرتی؛
هیچ قسەییێکم بۆ نەکرا!
پەری ناچار، چۆن بوو پەیدا، هەر بەو چەشنە چۆوە پەردە!
بەیانی بوو، من هەنگاوم لێ دەخوڕی، چارەنووسم لێڵ و وێڵ بوو،
نەڕۆیشتم نە ڕاوەستام، مێشکم بووە کانی شیعر و هەزار ئیلهام!
١٩٩٥/١١/٣ – خانەقا – هەولێر.

**دووری تۆ**

له دووری تۆ،
دڵم بۆته ساوایێك و ئۆقره ناگرێ!
من حاڵگرتووی ئەڵقەی زیکری عیشقێکی خوداوەندانەم،
دەسته و دوعا له میحرابی خۆشەویستیت، وەك دێوانەم!
سۆز له ناخی دەریای مێشکم،
سەرچۆپی گریانی گرتووه،
شەو خەونت پێوه دەبێنم،
بۆت شێت دەبم، گەر نەتبێنم،
من میوانی دیوەخانەی ئەڤینی تۆم؛
ڕێگەم بده قسه بکەم، بتدوێنم!
تا پێت بڵێم،
خۆشەویستیت،
له قەدپاڵی کێوی دڵم، هەڵیداوه،
نه کوێستانم بۆ چۆڵ دەکا،
نەگەرمێنم بۆ جێ دێڵێ،
له چەقی ڕێ ڕاوەستاوه!
هاوار، هاوار، شۆخه گوڵم
له دووری تۆ بێ هەوارم!
پێم کەرەم که، با له بنەگەی باوەشی تۆ،
هەر بۆ دەمێك، با کەمیش بێت،
سەرخەوێکی خۆش بشکێنم.

١٩٩٥/٩/١٣ – هەولێر.

١٩٩٦

## له ناو عشقدا ناتسووتێنم

دەزانی کە تۆم خۆشدەوێ؛
بێ ڕەحمانە، ناز دەفرۆشی!
تیرەبارانیشم دەکەی،
بۆ عەزابدانم لە جۆشی؛
دەمکوژی! ئەی لە پاشی من؟
کێی دی هەیە وەکوو بادەی زەمەن بردە، بتخواتەوە!
لە دوای من کێ پێتدا دەڵێ؟
کێ قایلە ژاری عشقی تۆ بنۆشی؟
من ئامادەم،
مەرگی ئەوینت فڕ بکەم، بە بێهۆشی!
خۆشەویستیت،
وەکوو عیشقان نابێ و نییە!
گەردانەی ووشە ناسکەکان،
لە لێواری دەریای عیشقت،
بۆ خۆیان دێن،
بێ ماندوو بوون،
دەبنە شیعر و هەڵدەبەسترێن!
ووشەکان دێن،
ڕستەکان دێن،
ماناکان خۆ دەنەخشێنن،
لە ناو دێڕی هۆنراوەدا،
لە شوێنی من،

هەڵدەواسرێن!
یان دەکوڵێن،
یان دەبرژێن!
یان ناگەنە نووری عیشقت،
هەر لە خەیاڵدا، دەسووتێن!
من جودامە!
من دێوانەی شەمی تۆمە!
ناڵی شێتی مەحبوبەتم؛
دەمی تۆمە!
لە ناو قەڤی ئەو سەدەڤی وشەی کوردی مراورێت بۆ دەپاڵێوم!
بە بەدەنم،
هەردوو چاوم،
پڕ بە دڵ و جووتە لێوم،
لێزمەی شیعر دەکەمە باڵ،
لە باڵاتی دەئاڵێنم.
خۆت نەسووتای لە ناو عشق،
یارێ، منیش ناتسووتێنم!

١٩٩٦/١/١ - هەولێر.

**پرسیار**

هاتووه دەڵێ : - وا بەهارە؛ هەستە بچین بۆ سەیران
سەیرانی چی؟ دڵم تەنگــە؛ دنیا پـــڕە لە گریان!
لـــە گەڕەکێ، تاریکییە؛ شـــین و ناڵـــە و هەرایـــە؛
وڵات نەمـــا! ئازادیمـــان لـــە دەستی دوژمندایە،
ئاگادار بـــە؛ لـــە بـــەر دەرگا، نەیارمـــان پاسەوانە!
لە بیر مەکە؛ کچ و کوڕ و گەنج و پیر لە زیندانە
١٩٩٦/٤/٢٧ - هەولێر

١٩٩٧

## هۆ براله

بۆ حاجی عبدالواحد پێشکەشە

له زیندانی تاری دوژمن،
کێ مۆمێکت بۆ هەڵدەکا؛
ڕووناکی دادەگیرسێنێ؟
قسەیێکت له بۆ دەکا؛ هانت دەدا؛
دەنگی باڵندەت بۆ دێنێ؟
تا پێت بڵێن بەرخودانە،
زنجیری دەستت دەپسێنێ!
له زیندانی ڕەشی دوژمن،
هەمووومان بۆت دەسەلمێنین،
تۆ هەر خەباتت کردووە؛
له میحرابی عیشقی وڵات،
سەجدەت بە ترسان بردووە!
ئێوە بۆ ئازادی پردن!
له زیندانی تەنگی دوژمن،
بەو پیرییەت، دڵنیابە،
خەبات له دووای شەست، خەباتە!
ئەشکەنجەی دەستی زۆردارت،
بۆ ڕیشی سپیت خەڵاتە!
تۆ سەلماندت ، کە خۆت گەورەی، ئەوان وردن!
له زیندانی تەنگی دوژمن!

١٩٩٧/١٠/٧ - عمان - الأردن

### بریا

بریا ئەم شەو دەگەڵتان بام،
خەمی ئێوەم سووك كردبا!
لەگەڵتان بام؛
بۆتان دەبوومە ڕەشماڵێك،
هەمووتانم لە ژێر باڵم،
دەسك دەكرد؛
یەكەیەكە تا بەیانی؛
بە سۆزی باوكێكی غەریب؛
لە باوەشی پڕ بەزەییم دەمهەژاندن.
بریا ئەم شەو
جیهانەكەم،
لە تەمەنی هیچمان نەبا!
بریا، ئەم شەو،
جیهانەكەم،
لە ژیاندا،
بریا نەبا!

٧-١٩٩٧/٨/٨ - عمان - الاردن

١٢:٣٠ دەقیقەی شەو - منداڵەكانم لە فڕگەی استانبولدا بێ خەبەر مابوونەوە!

١٩٩٨

**باشتر**

(کورد ناگاته باڵای ئێوه!)
گوتووتانه و دەیڵێنەوە؛
کامتان لە ئێمە باشترە؟
کێتان لە کوردێك ڕاسترە،
با بێت مێژووی هەڵدەینەوە؛
ئێمە لە ماڵی خۆمانین،
ئێوەش تاڵانی ماڵی کورد، دەبەنەوە،
ئێمە کێڵگەی خۆمان کێڵا،
دانەوێڵە و بەرهەممان چاند،
ئێوە هاتن بە زنجیری تانکەکانتان،
سووداندتان ڕەز و باخمان،
وێرانتان کرد، شار و دێمان!
لە جێی باخ و جێی بێستان و ڕەزی کوردان،
کێڵگەی مینتان ڕوواند، بۆمان!
ئامۆژگاری منداڵانی کوردمان دەکرد -
تا نەڕمێنن، قەت هێلانەی پەڕەسێلکان!
ئێوە هاتن سەدان بلْدۆزەرتان هێنا،
کاەلتان کرد خانووی پڕی لە هێلانە،
مزگەوتەکانتان هەڵوەشاند،
چەند حەسیر و تەشکە بەڕی نوێژ هەبوو،
هەموویانتان، بە تاڵان برد!
ئێمە هەرگیز بە کەوشەوە،

نەدەچووینە سەر ڕایەخی مزگەوتەکان،
ئێوە هاتن، لە ناو میحرابی خوتبەکان،
لە جێی سەجدەی موسوڵمانان،
ماڵتان بڕمێ،
قورئانی خواتان بە میز کرد!
ئێمە لە نێو خۆمان،
ڕێك بووین، کۆك بووین، یێك دەست،
ئێوە هاتن،
ئاژاوەتان، هێنا بۆمان! زۆر پڕ مەبەست!
خۆمان سازدا، پەرلەمانێکمان هەڵبژارد،
تا بە یێکجار، ببین بە یێك!
تا ئاوەدان بێ کوردستان!
ڕابردوو لە بیر بەینەوە.
بە داخەوە!
ئێوە هاتن، برینەکان دەکولێننەوە!
کە دێنەوە، هەڵەبجە وەبیر دێننەوە!
سەر لە نوێ، شارەکان ژار دەدەنەوە!
گۆڕی بە کۆمەڵی ئەنفال - دەکەنەوە!
کەچی ئێمە، لە ناو کیمیا ئاوێتەکان،
لە مەرگێکی گۆڕە بێ سەر و شوێنەکان،
گۆرانی ئاشتی بۆ مرۆڤ،
دەڵێینەوە و دەڵێینەوە و دەڵێینەوە!

١٩٩٨/٤/١١ - عمان - الأردن

**سوپاسگوزار**

ئەم هۆنراوە پێشکێشی مەلیکی ئوردون؛ شا حوسەینی کوڕی طلال بێت.

چۆن چاوێکە، لـە دوورەوە دەمناستەوە؟
چ دەستێکە، زامەکانم تیماردەکا؛ نایهێڵتەوە؟
بە چ زمانێـــك، خەمەکانـــم دەبڕێنتەوە؛
بـە کامـــە نـــاو، وا فرمێسکم دەسڕێتەوە؛
چ کەسێکـــە، کـــە دیـار بێت، بشرێتەوە؛
گرینگ ئـــەوە! کـە لـــە بیرم ناچێتەوە!
بـــە باوەڕ و بـــە ڕێبازی هەمـــوو دینێك،
نـــزا دەکات، تا ئـــازاد بـم، دەیڵێتـــەوە؛
گرینـــگ نییە! کـــــە لە یادم دەمێنتەوە!
گرینـگ ئـــەوە، بـــە ڕیزەوە دەمژێینتەوە،
لە سەر خاکی، بـە ڕوخساری شیرینی خۆی،
جەستەی مانـــدووم بە بێ عەیب دەهێڵتەوە،
ڕەحـم بەنـــدە؛ باوەشمان بـــۆ دەکاتەوە،
ماڵـــی ئـــاوا، زۆر زۆر دڵمـــــان دەداتـــەوە!
پاشی دەیان سەدەی بێ دین، بە بێ وڵات،
وەك کـــوڕی خـــۆی، ڕەشماڵـم بۆ دەکاتەوە!
مەرجـــە خزمان، تا مـــن مابم لەم ژیانە،
دڵســـۆز دەبم، بـــۆ شاهـــی ئەم نیشتمانە!

١٩٩٨/٦/٣٠ - عمان - الأردن

**سوپاس ئوردن**

ئەم هۆنراوە پێشکێشی گەلی ئوردنی بێت.

بە چۆن ڕەنگێك،
گەشە بەرانبەرم دەکات، گرینگ نییە!
بە کامە دەست،
زامەکانم تیمار دەکات، گرینگ نییە!
بە چ زمانێك،
دڵی تەنگم دەداتەوە، گرینگ نییە!
بە ڕێبازی کامـە ئایین،
نزای ئازادیم بۆ دەکات، گرینگ نییە!
بەڵکوو گەلۆ،
گرینگ ئەوە، وەکوو خۆی هەستم پێدەکات،
لە سەر خاکی وڵاتی خۆی،
جەستەی ئەستەم خواردووی ماندووم،
بە شادی، جێ دەکاتەوە!
قڕێژی جەستە و نینۆکم، دەشواتەوە!
ژانی دەیان سەدەی وڵاتی خۆم،
لە ناو فرگەی وڵاتەکەی، وا لە بیرم دەباتەوە!
تا من مابم،
هەتاوەکوو ئوردون مابێت،
سوپاسگوزاری ئەو گەلەم،
خوا پاداشتیان بداتەوە.

١٩٩٨/٦/٨ - عمان - الأردن

## دەرمان

له شەوەزەنگ، ڕەنگە بە دەنگ،
تەنیا بە دەنگ، لە چۆنییەتی مەلەی نەهەنگ،
شارەزایی باش پەیداکەی.
دەشێ لە خەو، باڵت هەبێ بفڕی وەك كەو،
لە گەڵ سەركردان دانیشی، لەگەل پاشایان سەوداكەی.
ڕەنگە بكرێ، لە سێبەرێك، سەرخەوێكی خۆش بشكێنی،
لە پەناییێك خۆت داڵدە دەی، لە ژوانێك شۆخێكی قۆز بگلۆفێنی،
ئەو تەمەنەی ڕۆیشتووە، هەر وەك ئەندێشە سەیری بكەی.
ڕەنگە بشێ تەمەن بچنی، خۆشی بڕنی،
هەنگاو، هەنگاو، بێ ویستی خۆت بچییە كنی،
بۆ باوەشی قژ درێژێك، باڵا زراڤێك، چاو بە كلێك،
پشت لە شار؛ ڕوو لە سەحراكەی.
هەزار تێكە و لێكە بكەی، یار پەیدا كەی،
بەڵام گەلۆ! داخی دڵم!
هەرگیز ناشێ، دەردی دووەی ببڕێتەوە،
مووی سپی بۆت ڕەشبێتەوە،
كانەدا گشت ببتە دەرمان.

١٩٩٨/١٠/١٣ - وینیپێگ - كەنەدا.

یێكەم ڕۆژی كاركردنم بوو لە ئۆفیسی

The International Centre of Manitoba, Winnipeg, Manitoba

CANADA

**نامەی جەژن**

ئەوا جەژنە؛ لە دووریتان دەسووتێم
دەبێ بژیم هەتا دیسان دەگەن پێم!
ئێوەن، خوشك و ئەزیزانی وڵاتم
باڵم هەبا، بۆ دیدارتان دەهاتم!
ڕوحم ئیمڕۆ پەروانەیە، لە سەر سەر
دەسووڕێتن، دەتانبینی بێ نەزەر!
دەنگی ئێوە، جەژنی من بوو، دەزانن!
سەفا بوو بۆم؛ جەفا بوو بۆم؛ حەیاتن.
١٩٩٩/١/١٨ - وینیپێگ، کانەدا

۲۰۰۰

**با بزر بن**

لەم سەردەمەی بێ چارەسەر گڵکۆی ڕووحی یادەکانتان بخەمڵێنن!
تا بزانن –
چەندین دڵۆپ تاریکیتان خستۆتە قوڕگی کێوەکان،
چەندین ئەسپی لەڕ و بڕسی بێ ئومێدی
لە مەیدانی شێتەواری، لە کووچەی شارەکانتاندا،
ڕێشمەیان لێ نەکرایەتەوە، لغاویان لێ نەکرایەتەوە؛
هەتا دەمرن، جوولەیان بەستراوەتەوە!
*   *   *
وردە تەزرەی ئاسمانێکی ژەنگاویتان باراندووە!
کڵۆ کلۆ وشەی قەشەنگی ڕاستیتان، خنکاندووە!
لە ئۆڵۆزەکەی ئەنکارا تا پسفۆری تەنگاوی جوداکەرەوە؛
ڕۆژهەڵات و ڕۆژاواتان تاساندووە!
پەڵە هەورێکی پاکژی ئینسانییەت
لەم دەڤەرەدا نەماوە، هەموویانتان ڕەواندووە!
قرێژی ژەنگی چەکەکان، هەڵبڵووشن؛
تفەنگەگەکانتان هەڵگرن؛ دایانپۆشن؛
تاکوو گەڵاکان گوڵ بگرن، تا گوڵەکان ببنە میوە، باش پێبگەین!
دەی درختە کرمییەکان،
هزری فیکری پاشەڵۆکی سیاسییە مردووەکان،
هوڕێنەیان، هەڵووشنەوە،
جڵەوەکان گرێ بدەن، دەرگاکانیان داخەنەوە! تا بزر بن، نەیێنەوە.
۲۰۰۰/۱۰/۱۳ – وینیپێگ – کەنەدا.

**جیهانێکی هاوشێوە**

دنیایێکی لە هاوشێوەی ئەمەی خۆمان،
ڕەنگە هەبێت؛ دوور لە دیدی زاناکانمان!
لەو جیهانە
هەموو شتێك لە گۆڕانە!
کۆنە نییە؛
لە داخ کۆن بوون دڵگیر نابن!
پیر بوون نییە،
لاوەکانیان قەت پیر نابن!
گیا زەردە؛
ڕۆژیش لەوێ ڕەنگی کەسکە!
دار ئاسنە،
ئاسن وەکوو گەڵای دارە؛ وەکوو پەلکە!
باران لە زەوی دەردەچێ؛
بەرەو ئاسمان هەڵدەکشێ:
ئافرەت لەوێدا سەرپەلن،
پیاو داماو، تەوەزەلن!
بەس بە پەنجە ئاماژەدە،
هەر سەر بە خۆ،
ئەو شتانەی دەور و بەرمان، هەڵدەوەرن!
نووکی پەنجە هێزی ئەتۆمی تێدایە،
پەنجەکانت هەڵشەقێنە،
شەقامەکان ڕووناك دەبن!
هەرچی جەستەی تاریك هەیە،

کڵافەی ڕووناکی دەخوات؛
ڕێگە بۆ ئێمە چۆڵ دەکات!
عیشق تامی ئێستای نابێ!
قەبر کێڵی ئێستای نابێ!
باوەڕت بێ،
ئەمەی لەو دونیایەدا واهەیە، لەوێ نابێ!
خۆشەویستی وەکوو شەختە دادەبارێ،
وەك چوکلێتێك بە سیلۆفێن دادەپۆشرێ؛
هەر دیارە، هەر سەرداره؛ بزر نابێ!
خۆشەویستی جیهانێکە؛
بێ پەنجەرە و بە بێ دەرگا،
دێتە ژوورێ؛
دەخزێتە ناو نوێنەکان؛
نێو باوەش و ناو دڵەکان!
خۆشەویستی
بووکە شووشەی منداڵانە،
هەمیشە سەیرە؛
هەر جوانە!
لە بەر دەرگا،
لە سەر ڕێگا،
لە ناو جێگا،
ڕاناوەستن، ئۆقرە ناگرن،
تا لە ناو مێشك دەچەقن!

٢٠٠١/٨/٢١ – وینیپێگ - کەنەدا

## ٢٠٠١

### حبيبتي

الى روح ليلى زانا الطالبة الجامعية التى أعدمتها زمَرَ صدام حسين.

أتعبتهم أوراقنا المبعثرة،
تُقلقهم أقلامنا المكتومة الأنفاسِ!
تتعبهم أشياؤنا الصغيرةُ!
حين تصل لهؤلاء الناسِ!
نرفع صوتا، يخنقونَه!
نرفع بصرا، يَعمونَه!
نرفع رأسا، يا للعار... يجزّونَه!
أما أنتِ يا مفتونة البلاد؛
أنتِ، أنت لا تصدئين!
كضوء الشمسِ لاتغيبين!
جعلتيني أرى الحياة جميلةً رائعةً،
أجمل مِن صدإ القضبان،
و أروع من أسنان السجّانِ؛
يا فارسة يتباهى بها بنو الإنسانِ!
يسير بكِ الريح ويعبر بك البحارُ و الجبالُ و الأنهارَ
يتشرف الأتراكُ و الهنودُ و الأفارقة و سكان اوروبا،
بالتعرف على سيرتك الذاتية
أنت يا سيدة السجنِ،
خرجت من دهاليز عصور ما قبل التاريخ
و عرضت بنود الوثائق الأممية،
تجرين بين جرف النهر و تقرئين حروف بيانات حقوق البشر؛

تعانقك دانيال ميتران،
و كل صبايا بلادي،
أنتِ الحب و العطر و الحقل و البحر
أنتِ أعلى قمة جبل في بلادي
أنتِ النور والفكر و إبنة كل العائلات؛
ففي كل بيت لكِ به مهدٌ؛
ليلى - أنت العروس تتحدّيْنَ الزمانَ،
لا تنزعي ثوبَ العرسِ قبل أن ترجعي
يا حوريةِ السماء؛ الى جنة كوردستانَ
فالدنيا تحتفل بك
تحتفل بزفة ليلى زانا.

٢٠٠١/٩/٢٠ - وينيپيێگ، کەنەدا

## دنیـــــا

ئەم دنیایە،
دەنگ و ڕەنگی پڕ بەڵایە!
زەنگ و ژەنگی لە هەر لایە!
کفن لێرە سپی نییە،
مردوو بەرگی لەبەردایە!
جا با هەندێکیان ئارمووش بن،
ئەوانی دی با هەر گوش بن!
ڕاهاتن و پێ قایل بوون،
بۆ خۆی خەڵاتی خودایە!

٢٠٠١/٩/٢٢ - وینیپێگ - کەنەدا.

٢٠٠٢

## کوردستان و ئێره

لێره شەوە، شەوی ئێره بازاری خوردەی بێ خەوە،
هەرزەکاران کڵۆی بەفر هەڵدەمژن،
بێ بەرپرسن، بێ ئامانجن، سووپەرمانن؛ کات دەکوژن!
سەر دەرناکەم، لە هاموشۆی نیوە شەوی ئەم شارانە؛
لە پەیوەندی بێ بنەوانی ئەم لاوانە.
فەرهەنگی شەوی ئێرانە، هیچ موعەممایێك حەل ناکا، بۆ بێگانە!
کەچی هێشتا، خەڵکی ئێره، پێچەوانەی کوردستانە،
سوود وەردەگرن، لە چرکۆکەی بزری زەمان،
پەردەی تاریکی لادەدەن، لە سەر نهێنیۆکەی ژیان!
عەقڵی ڕاست و هۆشی چاك و بیری پاکی کوردانەی من،
هێشتا لێره هەر نامۆیە؛ بۆ نارێکە؟ نازانم من!
لە پەیوەندی کوڕ و باوك و کچ و دایکی ئەم ناوەدا،
گۆشە نیگای ئاواتێکی شووشەییە، سەر هەڵدەدا،
لە شەوێکی چاولەئەنگوست، مرواری جریوە دەکا،
لەگەڵ خوڕەی تاڤگەی بێکەسی وڵاتم،
بەرەو ئاسمان هەڵدەکشێ و شەپۆل دەدا.
کوردستانە شەو و ڕۆژم، کوردستانە هەموو ڕۆژم.
خۆشەویستی ئەو وڵات و ئەم وەڵاتە، هەر چەند لە دڵم گیره،
هەر شەش لای من پێی ئەسیره؛ هەموو کاتێکی درەنگە!
بەڵام، داخم! من هیچ کاتێك شەوم نییە!
هەر کە لێره شەوی لێهات، دڵی گەورەی کوردستانم لە گەزەنگە.

٢٠٠٢/١/١ - وینیپێگ - کەنەدا

**شەو هەوێنی بەیانە**

لەم دنیایە، لە ژێر سەنگی ترس نامرم،
گەلۆ نییە، کەسێك وەك من.
لە گەرووی نەهەنگی زەمان،
شۆڕبوومەوە.
لە ئەلفوبێی سێ زمانان،
ورد بوومەوە.
کتێب نەما، بێتە دەستم،
نەیخوێنمەوە،
ڕستە نەما ناخ توێکڵەکەی هەڵنەمژم
وشە نەما قۆزاخەکەی نەورووشێنم
پیتێك نەما، وەك برێشکە،
ڕۆژ و شەو کاوێژی نەکەم!
بە شوێنی خۆمدا دەگەڕام،
کەسێك وەك من، وەکوو من ون،
لە ناو مێژوو، نەبوو پەیدا!!
***
هانام بردە بەر مێژوو نووس،
لە تاسوولقە جێماوەکان؛ پاشماوەی ئاشوور و سۆمەر،
لە بەهەشتی پڕ مەینەتی، شاری بابل، پاڕامەوە،
چونکە ڕەنووسی بزماریم نەدەزانی،
غەڵەت بۆیان دەخوێندمەوە.
لە کن دەفتەرداری کوروش،

دەست دامێنی کاوەیەك بووم،
سەد مخابن، چونکە کاوەش خۆی کورد نەبوو،
خۆی نامەردێك بوو، گورد نەبوو،
نۆبەرەی خرپنی کوشتم!
کورسی داوە پارسەکان!
هیوای گەورەم گلگامش[١] بوو؛
ئەویش نوقمی داخی گەورەی ئۆتۆنەپشتم[٢] بوو؛
هیچ ئاگاییێکی لێم نەما؛ بەس نەمردم!
ئۆدێپەس[٣]م کەوتە بەردەست؛
ئەسکەندەر[٤] و گزێنەفۆنم[٥] هێنا تکا،
کاشکا (گرێ کوێرەی)[٦] دڵم شی کەنەوە،
ئەوان خۆیان بە لابنارێك گرتەوە؛
منیش، وەك خۆم، با بردمی!
کەسێك نەبوو لە بن شاخێك پەنام بدا؛ بمگرتەوە!
****
بێ بناوان، لە هەندەران، لە بەندەران،
لە فڕگەکان، لە شارەکان،
لە چێشتخانە پیسەکانی پێتەختەکان،
لە ناو پاشماوەی شاژن و سەماکەر و هونەرمەندە ڕووخاوەکان،
دەرۆزەی پاسپۆرتێك دەکەم،

[١] گلگامش – مەلیکی بابل.
[٢] ئۆتۆنەپشتم – لە ئەفسانەی گلگامش، ئەو کەسەیە کە ئاوی حەیاتی خواردووەتەوە و نامرێت.
[٣] ئۆدیپەس – پاشایێکی گریك بوو تووشی گرێکوێرییێك هاتبوو.
[٤] ئەسکەندر – نیازم ئەسکەندەری ماکدۆنییە.
[٥] گزێنەفۆن – ئەو ئەفسەرە یۆنانییە بوو کە سوپای وڵاتەکەی گەڕاندەوە بۆ وڵاتی خۆیان.
[٦] ئەمە گرێکوێرەی ئۆدیپەسە.

تکا دەکەم بە خێری خۆ،
تەنیا وەك پەناهەندەییێك،
پێمببەخشن حەشارگەیەك،
هەزاران سوپاسیان دەکەم.
بێهوودەیە! هیچم پێم ڕەوا نابینن، قەت هیچم پێ نابوو پەیدا!
***
ئا لێرانە، لەم خاکە دوور کوردستانە،
لێلە نیگایەکی چاوی بکوژەکەی لەیلا[1] دیارە،
کۆیلە و زیندانی دەبینم، خولیای قەڵادارِشتنن؛
لە گڵکەندرا، خۆر بەرەو ئاسمانێ دینن؛
وا بناغە دەچەسپێنن،
لە ناخ قینی ڕەشی ئەودا.
گەلۆ، نییە کەسێك وەك من!
لە زاو و زێی ئەم زەمان و ئەم زەمینە، من پەیدامە!
گشت خەریکن، کوردستانەکەم خەریکە،
لە ناخ قەفی پەتی ملم دەبتە ئاڵا،
ئاخر ئەوەشیان مەرامە!
بۆیە، گەلۆ، هەتا تیتکی گەشی ئاسمان،
شانە بکرێ، بە سەر ڕوخساری کوردستان،
هەموو شەوێك، با تاریش بێت،
لە توانایە، کۆرپەیەکی کازیوەی ڕوون
ببەخشینە بووکی ئاواتی گەورەمان!

٢٠٠٢/٩/٢٢ - هاملتن - کەنەدا.

---

[1] لەیلا - خانمە شەهیدەکەی کوردە کە بەعسییەکان لە داریان دا.

**شەوی دووری**

ئەم شەو سۆزە،
ئەم شەو سۆزی غەریبیمە!
گڕی ئەم شەو لە دۆخێکی تایبەت دایە!
هەستی ئەم کاتەم ڕەسەنە؛
لە بارەگاهی خودایە.
خەمم خەمی خاوەن بڕنۆی بێ ئومێدە،
شینی دووری ئازیزانە؛
خواستی عیشقی جاویدانە،
ئەم شەو سۆزی غەریبیمە،
دیدی دەریای لێ بەڵایە.
***
ئەم شەو، دڵم ماندوو بووە!
مێژووی پەنجا پەیژەی سەختی، پێوە دیارە.
قەد و گەڵای زەرد گەڕاون،
قوڕگی نووساو، بێ هاوارە!
ئەم شەو، بەزمی دڵم ژانە؛
گەلۆ دەریا، چ پێویستی بە بارانە؟
لە بەهەشتدا دەرکراوە؛
لە غەریبی ئاوزینگ دەدا،
هەڵەبجەیە؛ لە سیانیددا[1] خنکاوە!
گەلۆ! دڵم ئەم شەو بۆتە باوە گوڕگوڕ،
تەعریب کاری تێ کردووە؛

[1] سیانید – غازێکی کوشندەیە، لە کوشتارەکەی هەڵەبجەدا بکوژەکانی سەدام حوسێن بەکاریان هێنا.

بەڵێ گەلۆ!
سەدای کوردی هەر لێ ماوە!
ئەم شەو دڵم دوا خرار هەڵدەرێژێ،
دوا شیعری باڵا بەرزی،
کوڵم ئاڵی، چاو قەنەوزی خۆی، دەبێژێ.
***
شیعر و دووری، ئەم شەو پەلاماریان داووم.
منی بێ سەنگەری تەنیا،
خەویان لە چاو زڕاندوومە،
ماڵیان نەڕمێ،
ئۆقرەیان لێ هەڵگرتوومە.
دڵۆپ، دڵۆپ خوێنی گەشم دەخۆنەوە.
چرکە چرکە لە تەمەنم دەشۆنەوە.
شیعر و سۆز و دڵ و خەو و هەستم ئەمشەو،
هەراسانی دەستی دوورین.
کوردستانمان بۆتە خەون؛
نەورۆزیشمان بۆتە ئەسرین.
***
دۆزەخی ئەم شەوی فیکرم،
هەرگیز وەکوو خۆی نەبووە!
مووشەکی غەریبی،
گەلۆ، لە ناخ ناخمدا ڕوو چووە!
ئەگەر زەمان بوارم دا،
گەر غەریبی دەستی لە بەرۆکم بەردا،

له پێش دەرگای (شێخی چۆلی)
لەبەر سێبەری قەڵاتێ،
له سەر (جادەکەی شەست مەتری)
له کووچەی (حەمامی مۆدە)،
له (تەعجیل) و له (سێتاقان) له (سەیداوە)،
تووڕێك دەدەم؛
خاکی ژێر پێی دەرۆزە کەرانی بەر دەرگای خانەقاکانمان،
یەکە یەکەیان ماچ دەکەم.
به چڵکاوی کۆڵانەکانی تەیراوە
گوناحی دووری خۆم دەشۆم،
چاو- له- ئەنگوستەی غەریبی،
به ئەستێرە گەشەکانی
ئاسمانی دایکی گشت شاران،
به هەولێر، دەڕەوێنمەوە.
هەر دێمەوە، هەر دێمەوە....
٢٠٠٢/١٢/٢٠ - هاملتن - کەنەدا

## ٢٠٠٣

**شەو ڕاشکا!**

شەو ڕاشکا، ئێستا، زەمین خەواڵووە، دنیا دەڵێی ماری سڕە!
شنەباییێکی زۆر فێنك با وەشێنە، ئەم ناوە، لە خۆشی پڕە!

تاریکە شەو، شنەی بێ خەو، ئاسکی برسی هەر وەکوو خۆم، بووینە بێشکەی دڵی شەیدام، وای لەم دڵە! دەریاچەی پاکی (ئۆنتێریۆش)، بە شێنەیی، دڵی گەورەی بۆم لێدەدا! وردە شەپۆلم بۆ دێنێ، دەکشێتەوە، لێم ڕادەکا! مرواری لە ئاسمان دەڕنێ، جا دێتەوە، دەیوێ بیکاتە ملوانکە، بە گەردەنم هەڵیواسێ!

شەو ڕەتیدا! وا سرووشتی ئەم دەڤەرە، وەك من ئاسا، لە بێکەسی، جوولە دەکات، ڕاناوەستی! کڕنۆش بۆ بەرپێی من دەبا، سەیر ئەوە، کە پێشتریش، نە منی دیوە نە دەمناسی! وەك خۆم ئاسا، هێند ساکارە، شەومان کردووەتە مۆڵگەییێك، ئاشنایە، وەك ئێوارەی هەولێر وایە، ئەگەر ئەم هەستە وا نەبێ، دەبێ بژین بە نەناسی!

منیش وا بەم شەوە تارە، یێکە، یێکە، مۆرووەکانی تەسبیحەکەم، ئاوا دەکەم! هەر دێ و دەچن، نابڕێنەوە! ئەگەر بێت و کۆتایی بێت، سەرەتای باسێکی دییە، نە بڵندە، نە نەوییە؛ نە تێی دەگەم، نە دەشزانم ئەمە چییە! بەکرەییێکی غەریبییە!

دەم لە پاش دەم، تەکانێك دەداتە قەڵەم! جا فڕ دەکات گۆزەڵەی خەم! قومێكِ خوێنم دەخواتەوە، دەمێك نا دەم! پاشان ناڕوا، تا بە ئاوی ئەم دەریاچەیەی (ئۆنتێریۆ)، نەسڕێتەوە، لچ و لێوی تا دەگەنە قەراخی دەم! لە قزگەی غلبوونەوەیە، تەپ و تۆز و تەم و مژ و بەفر و شەختە و سەهۆڵبەندان، هاوکات لەگەڵ مێشکی من و بیری خزمان؛ تێکەڵی یێکتری دەبن! نیگارکێشێك، سێپێکێکی لە ناخی ئەم ئاڵۆزییە،

چەقاندووە، پەڕەمووچەی لە ناو کۆڵانی ڕەنگەکان، هەڵدەکێشێت، ڕەنگی دیار هەڵدەبژێرێت، لە سەر پەڕەی کووتاڵێکی سپیواژی، هەڵیدێخێت! ئینجا یێك ڕەنگ، دەردەکەوێت! تەنیا یێك هێل دەبیندرێت! باریك - باریك، ڕادەکێشرێت! ئەوە لە وەتی من هەمە، ئەم هونەرمەندە بیچارە، خەریکی سمێڵەکەمە! ناوناوە سەر هەڵدەبڕێت، سەیرم دەکات، پێدەکەنێت! ئینجا هەر وەکوو پێشانی، دەچێتەوە سەر کارەکەی، ڕەنگ لە ڕەنگان هەڵدەسوێت! مەرەقییەتی، ڕەنگێکی ڕێك بۆ قەیتانی سمێڵەکەم، هەڵبژێرێت! زۆر لە مێژە، بۆی سەرناگرێت!

جا لێم پرسی، ئەرێ برا بێزار نەبووی؟ سەری خۆی لە بۆم ڕاشڵەقاند، دیسان، فرچەی ناردەوە ناو ڕەنگدانەکان، جا بە پەلە دەری هێنا، ڕەنگێکی سوور لە سەر مووەکان داڕسان! فرچەی داناوە سەر شاشی بن ڕەنگەکان، وەك هەمیشە هەر بەم ڕەنگە، سواقیدا!

ئینجا پاشتر، ئەو برادەرەی وێنەگر، لێی ڕاکشا؛ سعاتەکەم چرکەی دەهات؛ دڵم هەر خورپە خورپی بوو، دەریاچەی جوانی ئۆتێریۆش، بێزار نەبوو، هەتا ئێستا باسکی دێنا، گەرەکی بوو دەستێك بە ئەبرۆم دابێنێ، بۆی نەدەکرا! ناچار دەبوو وێنەی ئەستێرەی ئەم شەوە، لە ناو خۆیدا، بداتەوە! لە ئامێزی خۆیان بگرێ و یێك یێك بیانشارێتەوە! بەیانی هات، بەیانی دا، سمۆرەیێك، هاوتای ئەوانەی کوردستان، چاوی زیت و کلك زۆر پان، لە کونەکەی وەدەر کەوت و هاتە سەر شان! بەیانیت باش. ئاخ و سەد ئاخ، ئەو وردیلە، لە ئامانجم قەت تێناگات، جا ڕادەکات؛ وەکوو پێشان، هەڵکشاوە سەرە لووتکەی درەختەکان!

٢٠٠٣/٩/٣٠ - هاملتن - کەنەدا

قەراخی دەریاچەی ئۆنتێریۆ.

## ٢٠٠٤

### نامەیێك بۆ دایكی شەهید

دوێنێ، تیرۆر لە كوردستان دەستە قارەمانێكی شەهید كرد.

ئەی ئافرەتە پڕ سەبرەكە؛
ئەی ئەو دایكە خۆڕاگرە، دڵ گەورەكە!
خۆزگەم دەخواست،
لە بری جگەرگۆشەكەت، من بوومایە!
بەڵام داخم، ئەوا حوكی قەدەر وایە!
ئەمجارەشیان نەبووە نسیب، ببمە قوربانی شەهیدان،
هەر بۆ ئەوهەندە مامەوە، تا ئەم شیعرە بهۆنمەوە!
هەڵیواسم بە ئاسمانی پڕ لە هەوری غوربەتیمان!
ئەی ئەو كەڵە ئافرەتە قەت نەبەزیوەی كوردەواری،
دایكی شەهید! تۆ تەنیا نیت!
چل ملیۆن كورد هەموو وەك تۆ ئەشكیان باران؛
چل ملیۆن شاخ،
دڵیان وەك دڵی شكاوت، گریان گرتووە و بوونە گڕكان.
چل ملیۆن دڵ، گەورایەتی ئەم ڕووداوە،
هەمووی ئەوا دەستە كردن؛ هەمووی كردنە یێك نیشتمان!
ئەی ئافرەتی شەختەبەندی دڵ فرەوان؛
ئەمساڵ، شەوبۆی قەدپاڵی كێوە بەرزەكان،
هەڵدەكشێن، دەڕۆن بەرەو تاقی ئاسمان،
خوێنی ئەم دەستە شەهیدەی یێكی شوبات،
ڕادەژێنن عەرشی یەزدان؛ دەبنە ئاڵا بۆ كوردستان.

٢٠٠٤/٢/٢ هاملتن - كەنەدا

## جـــەژن

دوێنێ، تیرۆر لە کوردستان دەستە قارەمانێکی شەهید کرد.

بەیانی زوو،
زانیمان ئاسایی نەبوو!
چونکە ئەمڕۆکە جەژن بوو.
بۆیێ هەموو،
لە شادی بوون، لە شایی بوون،
خەندەی سەر لێو ئاسایی بوون،
چەپووك هەستان، پاك ڕوخساری خۆیانیان شووشت،
بەرگی نوێی جەژنەکەیان زوو لەبەر کرد،
لە پێش ئاوێنە ڕاوەستان، سەریان شە کرد،
ئاخر ئەو ڕۆژ وەکوو ڕۆژی پێشان نەبوو!
ئەمڕۆ خۆش بوو؛ خۆ جەژن بوو، خۆ جەژن بوو!
ئەو ڕۆژ کاتی گەردن ئازادی بوو.
خنجیلەکان دەگەڵ بەیان، لەبەریان کرد جلی جوان،
بە کل دایانڕشت چاوەکان،
شانەیان کرد، قژی سەریان،
گوڵاوی خۆشیان پرووشان،
ئینجا بلێ لە هەموو کەس، دایە و بابە، دراوسێکان،
ناسیاو، نەناس، گەورە و بچووك و پیرەکان،
جەژنە پیرۆز، پێیان بەخشین، زەردەخەنەی بەرائەتی منداڵییان،
خۆ جەژن بوو، لە بۆ هەمووان،
پەپوولەکان، ڕوومەت پەمبە، شیرینەکان، ڕوو گەشەکان،
خۆشهاتنی هەمووانیان کرد، پێشکێشیان کرد شیرینییەکان،

هەولێر هەموو شادمان بوو،
لە ناو خەڵکی دەست لە ملان بوو،
چونکە جەژنە، کاتی شادی منداڵان بوو.

ئەمڕۆ لە خاکی میدیا،
زەردەشتی مەزن هاتووە، کڕنۆش بۆ خوای مردن دەبا!
شێخ سەعیدیش، لە ناو بەندی گرانی تورکان، لە باکوور ڕا،
وا دەنگی دێ، دوعا دەکا -
(خوایە هەولێر بپارێزی).
مەلیك محمود لە سلێمانی، ڕووەو هەولێر، چۆکی داوە، دڵنیایە،
هەموو کونجێکی ئەم شارە زۆر پیرۆزە، بە خوێنی گەنج ئاو دراوە،
وا دەنگی دێ، دوعا دەکا -
(خوایە هەولێر بپارێزی).
قازی گەورە، لە مەهاباد،
پەتی سێدارەکەی پساند،
بەرەو هەولێر، ئاڵای ئازادی کوردانی ڕاهەڵشەقاند،
سمکۆی شکاك، بەرەو قەڵاتی هەولێرێ، خۆی ڕاتەکاند،
لە قامشلو، جگەر خوێنە، لە میحرابی کورد پەرستی، خەڵوەتی گرت،
دنیای هەژاند،
هەزار شیعری باڵا بەرزی بۆ هەولێر نارد، دەنگی دەهات، دەپاڕاوە -
(خوایە هەولێر بپارێزی).
مەلا شوکور، لە کەرکووکە،
لە ناو ئەو شارەی کە بووکە،
تاڤگەی گەورەی بابە گوڕگوڕ، بەرەو ئاسمان هەڵترووکاند،

بۆ جەژنانەی ئەم هەولێرە، تروسکەکەی کردە دیاری، جا ڕایهەژاند،
لەیلایەکەی کۆترە باریکەی خانەقین،
هات و جلی بووکێنی خۆی بە باڵای قەڵاتەکەی گرت،
ئاخر گەلۆ، ئەمڕۆ لە هەولێرێ جەژنە، کاتی گەردن ئازادییە،
بۆیێ لە قەد کێوی شیرینەوەش، لە بۆ هەولێرێ دێنەوە،
تا پێشکێشکەن ڕووناکییە، نووری چاوی بارزانییە.



ئیمڕۆ هەولێر نا وەك هەموو ڕۆژانییەتی؛
سەر تا پێ لە ئاهەنگدایە، بەهارییەتی،
ئەمڕۆ ڕۆژی جوانییەتی،
لە هەولێر ئیمڕۆ ئاهەنگە،
زەردە، سەوزە، ڕەنگا و ڕەنگە،
کوردستانمان لە قەراخی ئازادییەتی.



لەم کەش و هەوایە خۆشە،
شەیتانی ڕەش، بە فیکری ڕەش، بە هزری ڕەش، بە دیدی ڕەش،
بە پێستی سیس، بە چاوی ڕەش، بە کاری ڕەش، بە دەستی ڕەش، بە
هەستی ڕەش، بە دینی ڕەش، ڕەش وەکوو هەش،
هات و خوێنبارانی کردین،
خەونی خۆشی لێ زڕاندین،
کاتی خۆشی لێ فەوتاندین،
شێخ سەعیدی لە دار داوە،
قەنارەکەی لە بارەگای کوردەواری هەڵواسراوە.

٢٠٠٤/٢/٢ - هاملتن - کەنەدا

## وڵاتی من

ئەو وڵاتەی من لێی هاتم، بەهاری وەکوو زستانە؛
تەم و مژ و تاریکییە، فرمێسکی لێ گوڵبارانە؛
خۆشترین بەزمی گریانە،
هێشتا بۆمان تاجی سەر سەری زەمانە.
****
ئەو وڵاتەی کە لێی هاتم،
لە سەر نەخشەی سیاسییانی سەدەی بیستەم،
ناوی نەبوو؛
شاخ و دەشت و زی و ڕووبار و مەلی نەبوو؛
ڕێگاکانی لێ داخرا بوون؛
هەلی نەبوو؛
لە لای ئەوان نە کەلتوور و نە دەستوور و گەلی نەبوو!!
حەدیان نەبێ؛
بەلاغەتی زمانی من، بە هەمووانە!
***
ئەو وڵاتەی من لێی هاتم،
هەزار ساڵە خودا لە بیری کردووە،
هەموو لا دەیڕنێنەوە،
وا دەزانن کە ئینسانی تێدا نییە؛
لایان کەلاکی مردووە،
نەوتی دەبەن، نانی دەخۆن، ئاوی کانی دەخۆنەوە؛
خێر و بێری هەموو دەدزن،
حەرامی وڵاتی منیان، حەڵاڵ کردووە،

خۆیان وا لە گێلی داوە، دەڵێی نازانن زیندووە؛
باش تێبگەن؛ ئەو وڵاتەی من لێی هاتم،
هەموو جەستەی لە لێدانە؛
ئەو وڵاتەی من لێی هاتم،
دڵی وەك دەهۆڵ دەکوتێ؛
ڕووە و بەرزی هەڵدەکشێ؛
چاوی لە تاقی ئاسمانە،
هەموو دەر و دەشتی کراوە بە خوێن؛
بۆیە ئاسۆی سوور و جوانە.
ئەو وڵاتەی من لێی هاتم،
ڕووبارێکی پڕ بەهرەیە، هەموو بەردێکی کەعبەیە،
ئێمە چۆنین ئەویش وەیە،
ڕۆح و گیانی بە قوربانە؛
ئەو وڵاتەی من لێی هاتم،
هۆشە، هزرە، پیاوەتییە،
عیشقە، هەستە، مەحەببەتە، برایەتییە،
ئاوە، بایە، شاخە، باخە،
هەردە، وەردە، خۆڵە، بەردە،
ڕەنگا و ڕەنگیکی بێگەردە
شیری زوڵاڵی دایکانە،
سەد جار باڵا گەردانی بم؛
کوردستانە... کوردستانە... کوردستانە...
کوردستانە... کوردستانە... کوردستانە...

٢٠٠٤/١٢/٨ - هامڵتن - کەنەدا

٢٠٠٥

## خۆشەویستان گەیشتنەجێ

بۆ قوربانیانی ئەنفال پێشکەشە.

گەلۆ ڕابن؛ گەڕانەوە، خۆشەویستان،
لە سەفەری غەریبییان؛
ئێمە شێتی دیداریانین، ئەوانیش شەیدای کوردستان!
وا هاتنەوە؛ ڕێ کەن با وەپیریان بچم.
با لە سەر چۆك، پێشوازیان بم، بە زمان، ڕێیان بماڵم.
لە بەرانبەر باڵای پۆلێك گەنجی نەمر،
ئەڵقەی زیکری ناوی ئەوان دادەبەستین،
وەرنە تەکیەی شێخی بارزان، گەنج و پیران،
لەبەر دەستیان ڕادەوەستین؛
ئاخر ئەوان زوڵمەتی ئەنفالیان بەزاند؛
گەڕانەوە،
بۆ باوەشی کوردستانی زۆر میهرەبان،
لە سەفەری غەریبییان، بزر نەبوون،
وا هاتنەوە!
سەر تا سەر خاکی کوردستان،
لە حزووری دڵی گەورە و هەستی پیرۆز،
لە خزمەتی باوەڕی بەرزی پڕ لە سۆز،
بەیداخی قەشەنگی کوردە، داچەماوە،
یاخۆ لە ئامێزی گرتوون،
یان لە بۆیان، خۆی تاکوو نیوە هەڵداوە!
نە بیابانی زۆرداری،

نە زوڵمەتی فیکری تاریك،
نە ئەنفال و ئەنفالچییان،
نەیانتوانی پۆلێك پێشمەرگەی بارزانی،
لە ناو مێژوو بسڕنەوە،
بەچکە شێرانی شاخەکان،
زیندوو بوونەوە و هاتنەوە!
هەر لەو گۆڕی بە کۆمەڵیان،
تا بارزانی لانەی دلێری و بەرخۆدان،
تا دەگاتە کەنەدای دووری و غەریبیم،
هەمووی لە ماتەمە بۆیان؛
دەست لە سەر سینگ لە بەرانبەر نەبەردییان، ملکەچ ماوین!
هەموو دنیا لەبەر گەوراتی کارەسات، حەپەساوە.
سەفەری دوور، مەنزڵی دوور، وا بڕاوە؛
موسافیر غەریبی بەزاند،
بۆ باوەشی پڕ حورمەتی خاکی پیرۆزی دایکیان، وا گەڕاوە؛
چاوەڕوانی و دڵەڕاوکێ، وا بڕاوە؛
سوارانی کوردایەتی، گەیشتنە جێ، دەچنە ئەوێ؛
مەزاری بارزانییە لەوێ!
منیش ببەن؛ لە بەرانبەر گڵکۆی پیرۆزی بارزانی،
ڕووە و سەدان لاو و پیری ئەنفال بەزێن،
سەری ڕێز و نەوازشم نەوی بکەم
بۆم حەڵاڵ کەن، کڕنۆش ببەم!

٢٠٠٥/١٠/١٧ - هەولێر.

## ڕیفراندەم

نیگەرانن!
چونکە پێیان گوتی سەرۆک!
وا هەزار و چوار سەد ساڵە،
لە کوردانیان گرتووە بەرۆک،
دەیانکوژن، گوندەکانیان خاپوور دەکەن،
هەتا ئێستاش،
ناوی کوردیان لا حەرامە!
لەو ئەعرابانە تێبگەن، چیان مەرامە؛
بۆیان بکرێ، بێ هەڵوەستە،
هەمووان دەکەنە ژێر چەپۆک!
دڵگرانن؛
چونکە بە تۆیان گوت سەرۆک؟
قایل نینە،
کورد دەنگی خۆی داوە پێتان دەمانکوژن!
دێیەکانمان خاپوور دەکەن؛
هەتا ئەمڕۆش، پێیان بکرێ خاکمان دەبەن!
بۆیان بلوێ،
لە سەر زەوی نامانهێڵن، کزمان دەکەن،
چرای ماڵمان دەکوژێننەوە، بێی تۆ سەرۆک!

۲۰۰۵/۱۰/۲۹ – هەولێر.

**جیهان**

سەرەداوی ڕووناهییەکان، جیهان هەر تۆی،
لە لادانی ئێش و ژان و ئازارەکان، جیهان هەر تۆی،
لە ناو خەمی دوورییەکانمان، جیهان هەر تۆی،
پڕشەنگ دەدەی، کازیوە تۆی.
لە بەرداخی بادەی عیشقم،
وێنەی مەستیم، جیهان، هەر تۆی!
هەمیشە چاوت دەبینم،
خەمی زۆرم لە بۆ دەخوات.
هێندە شەیدای دیداری تۆم؛
بۆم بکرابا دەهاتمە لات.
تۆ هەناسەی خۆشی منی؛
تۆ خۆت گڕ و جۆشی منی؛
تۆ هەمیشە لەگەڵ منی؛
ڕوخسارت بۆم پێدەکەنی.
تۆ خۆت جیهان خەم ڕەوێنی؛
هیوای تۆیە دەمژیێنی،
خۆزگە دیسان، وەکوو جاران؛
لە باوەشت کۆرپەی شادی من دەبینی!

۲۰۰۵/۱۱/۳۰ - بەغداد.

## بـــــــاده

ئەو بادەیەی خۆشەویستیت، کە من بە یادی تۆ نۆشیم،
لە داری مێو قەدیمتر بوو زەمین لێم هاتە زەلزەلە،
لەگەڵ یێکەم قومـی شـــەراب، هەمووتانم هاتەوە
زەمان لەو کاتدا ڕاوەستا، کردی بە شایی و هەلهەلە!
لە سەر تەختی شاهی دانام، هەموو دنیای لە بۆ هێنام
بادە لە دۆست نەدیمتر بوو، گەیشتە مێشکم بە پەلە
لــە دایکــم بــە ڕەحمــتر بوو، شەرابی عیشقی ئیلاهی
کاشکا لە گۆڕ، لە گەڵم بێت، ئەوێ دەبتە ئاوە مەلە!
٢٠٠٥/١١/٣٠ – بەغداد.

تـــــــــۆ

لەگەڵ هەموو هەناسەکم، کە دێ و
خۆشەویستیت بڵـق دەدات و
لە گێژەنی گەردوونی خـــەم، کـــە
کازیوەی تۆ، خۆی بەیانـــە، وا بۆم
لە ناو بەرداخی بادەی تاڵ، کە فـــڕ
نیگای چاوت، بۆم هەڵدەکات؛
٢٠٠٥/١١/٣٠ - هاملتن - کەنەدا.

## ٢٠٠٦

### له خەو هەستاندن

براکانم، دڵسۆزانی شاخ و داخی نیشتمانم؛
وەکوو عارەب دەخیلتانم؛
له خەو هەستن،
خامەکانتان بخەنە گەڕ، بنووسنەوە،
له سەر ڕووشاری تیڤییەکان.
دەنگ هەڵبڕن بخوێننەوە،
بەرد و داری وڵاتەکەم،
ڕۆژنامەکان، گۆڤارەکان،
حەفتەنامە و فلایەر و کتێبەکان،
وەکوو پێشان؛
بکەنەوە بە گەنجینەی هزری پاکی کوردایەتی،
دەی براکان؛
به دەست و برد، پەله بکەن،
خۆ ئەگەر نا،
فیکری شێواوی چەواشە و هزری ڕەقی ناو بیابان،
وا خەریکە دەگرن لێمان، دەرگای ماڵمان.
ئەوی له یێك سەدە پترە دەیکەین،
خەریکن بە تاڵان دەیبەن،
دیدەنەوە بەر نێزەی شیری عارەبان.

٢٠٠٦/١/٣ - هامڵتن - کەنەدا.

**بندەست**

که هاتمەوە،
لە دەروازەی سنووری ئیبراهیم خەلیل،
ئاڵای کوردستانم بینی، دەشەکاوە،
گوتم:- ئۆخەی، باڵا گەردانت بم، داگیرکەر لێرە نەماوە!
سامم لێ نیشت!
داهاتمەوە، لەبەر سێبەری ئاڵاکە، کڕنۆشم برد؛
تۆزی بەر پێی پێشمەرگەیەکیشم ماچ کرد.
ئۆخەی ئۆخەی خۆ نەمردم،
بە چاوی خۆم ئەم بەشەی کوردستانم دیت، بندەست نییە!
داگیرکەری لێ نەماوە،
لە خۆم خەنی!
یاساوڵی سەر سنوریش،
بەو زمانە شیرینەی کورد وەڵامی سەلاممی داوە!
ئاخر ئەو بەشەی کوردستان، داگیرکەری لێ نەماوە.
***
هاتمە ناو شار
منداڵم دیت، زەردەخەنەی لە سەر لێوە،
کوڵمی عەینەن شەکرەسێوە،
هەرزەکار بوو،
زیت و زیندوو، چاوی دەتگوت چاوی مار بوو،
کچم بینین، ئاڵا و واڵا پێدەکەنین،
ئۆخەی، ئۆخەی، ترسیان لە دڵ نەماوە،

کوردە و ئاڵای هەڵکراوە!

***

بە ڕێکەوت چوومە بازاڕی،
ئاشێکم دیت، گەورە و بچووکی دەهاڕی،
لە بن پێچکەی ئەو ئامێرە،
کورد هاتنە ڕێم، نە ئەو کوردە بێچووە شێرە،
ڕوخساریان وەك خۆیان نەبوو،
نەمدیت کەسێك پەنجەی بۆ بەم بڵێم:- ئەمە، بە ڕاست، جوامێرە!
جوامێری زاراوەیەکی مێژوو بوو،
لەم خاکە ئازاد کراوە؛ ئێستا مۆدێلی نەماوە!

***

چوومە ناو کووچە و کۆڵانان؛
جێی منداڵیم، نەوجەوانیم، قیبلەی عیشقێکی بێ پایان!
نەجیرانم وەك جاران بوون،
نەمیوانم وەك جاران بوون،
سواڵکەریش وەك خۆی نەبوو، چ قەوماوە،
لەم بەشە ئازاد کراوە؟

***

حکومەتیش،
حکومەتی کوردی پەتیش،
بارەگاکەی، ئێستا، لێمان بۆتە قەڵای پڕ ژان و ئیش!
پرسگەکەی، پرسگەیە؛ نەك گەمەیە، پشتێکی ئەستووری هەیە،
قسەی خۆشی لەلا نییە، خۆشهێنان نازانێ چییە!
گەر واسیتەت دەگەڵ نەبێ،

یان قاتێکت دەبەر نەبێ،
مەحاڵە بێلی بچییەپێش،
لە بارەگای پڕ دەرد و ئێش.
***
خوا ڕەحمی کرد چوویە ژووری،
بەرانبەرت دێ چاو سووری،
لەو کۆردستانە ئازادە،
ئەمە ئەو هێندە بەربادە،
هزری بە دەست خۆی نەماوە،
لەم بەشە ڕزگار کراوە!
***
مودیر عامی دائیرەکان،
هەمیشە ڕیشیان تاشراوە،
قژیان ڕەش بۆیاغ کراوە،
قات و ریباتیان تازەیە،
دوێنی بە دۆلار کڕاوە،
ئەو کلینتۆنی بێچارە،
یەك مۆنیکا کردییە سۆتەکە جغارە،
کەچی لەم کوردستانە دیارە،
هەر یەك، هەر ڕۆژ، چەند جار مۆنیکا دەگۆڕێ،
بەڵام داخم؛ کەسێك نییە پێیان بڵێ:-
لە کوێت هێنا لە بۆی پارە؟
میراتی باوکت دیارە!
لەم کوردستانە بێ چارە!

***

هونەرمەندان، هونەرمەندان!
داخی گرانم! دەهۆڵ زەنن؛
لە ژوورێکی وەزارەتی ڕۆشنبیری،
لە شێوەی هەنگ دێن و دەچن،
خۆیان وا لە برسان دەمرن،
کەچی هزر لە خوێن مژی خودی خۆیان،
دێن وەردەگرن!
هونەر بڕۆ بۆ دواوە،
لەم بەشە ئازاد کراوە،
داگیرکەری لێ نەماوە!

***

ڕۆژنامەنووس؛
قەڵەمی چۆتە بن فلووس،
ڕێشمەی لە نووکی کراوە،
داخم لە دەستی چارەنووس!
چ قەوماوە،
لەم بەشە ئازاد کراوە؟

***

وەزیر - گزیر؛ گزیر - وەزیر!
بەردەست یا پیر،
بەرد یان هەویر،
وەزیر، وەزیر،
بەڵێ، بەڵێ...خودی وەزیر!

تا بن گوێی لغاو کراوە،
زمانی لە دەو نەماوە،
ئاخر ئەگەر یاسا بە ڕاستی پەیڕەو کا،
دەبێ، دەبێ،
برا بەر لە هەموو کەسێك، خۆی جەڵەو کا!
ئەگەر ڕەشادەتێ ماوە،
لەم بەشەی ئازاد کراوە.
***
ئەندامانی پەڕلەمانی کوردستانم،
قورگ و زاری ڕەش و ڕووتی بەستە زمانم،
دەنگم دا تۆ، تۆ دەنگمی.
ڕەنگم دا تۆ، تۆ ڕەنگمی.
هزرم هەر تۆی، تۆ... چی منی؟؟
تەنیا لە بۆ شەش سەد مەتر، گەلێکت خستە ژێر پاوە؟
***
گوتیان داگیرکەر نەماوە،
ئەی بۆ، ئەی بۆ، ئەندازیار ڕاستەی شکاوە،
مامۆستا فیکری وەستاوە، دکتۆر ویژدانی نەماوە،
زات کەم؛ بۆ هەورازتر بچم؟ دەرگەکانم لێ گیراوە!
ڕاستە گەلۆ، بەشێکی خاکی کوردستان، کورد کوژی تێدا نەماوە،
بەڵام، گەلۆ ئاگادار بن، لەم وەڵاتە، هەر لە منەوە،
تا دەروازەی دەرگاکەتان، تا وەزیر و گەورەتریش،
هەموو هەموو، لە لایەنی خاوەن شکۆ، مستەر دۆلار، دیل کراوە!
٢٠٠٦/٧/٦ - گوندی زانکۆ - هەولێر.

**شەو ڕاشکا!**

شنە بایێکی فێنکە،
وا باوەشێن لە خاك دەکا،
تاریکە شەو، بێشکەی بێخەوی چاوانمە!
سەر زەند دەکا،
زەند چاك دەکا!
ئەم دەریاچە فرە بەرینەی ئۆنتاریۆش،
هێدی هێدی وردە شەپۆل بەرەو قیبلەی پێیەکانم دێنێ،
کڵۆ، کڵۆ مرواری ئاسمان دەڕنێ،
لە باوەشیا دەیهەژێنێ،
دەمێك ئاوی پاکی دەریاچەکە وا دەنوێنێ،
ئارەزوویە گەردانەیێکی ئەستێرەم بە بەرۆکەوە هەڵواسێ،
نەمن هێندە ملم دەبەم،
نە ئەو هێندە دەستی دێنێ،
ناگەین بە یەك!
شەپۆلەکان دەکشێنەوە،
وردە بارانێك جێ دێلن، دەمرشێنێ!
شەو ڕاشکا!
سرووشت ئەم شەو زۆر شیرێنە؛
بۆتە کەسی بێ کەسیم و دەڵێی سەد ساڵە دەمناسێ!
ئەم شەو سرووشت وەك غەوارە؛
هانای لە بۆ من هێناوە و کەس ناناسێ!
سرووشت ئەم شەو بۆتە مۆڵگەی غەریباتی؛

پەیتا پەیتا زەمان دەخوا،
وەك تەسبیحی دەستی دەروێش،
دێت و دەچێت؛
بێ وەی کە هیچی دەستکەوێت!
هەرگیز کۆتایی ناهێنێت،
هەرگیز ماندوێتی نابینێت!
سرووشت و تەزبیح و مامکاك،
هاوڕێ لەگەڵ شەپۆلی ئەم دەریاچەیە،
نەدەزانن لە کوێ هاتوون؛
نەدەزانن بۆ کوێ دەچن!
نە سەرەتای ژینیان هەیە،
نە لە دوواییش قورتار دەبن!
شەو تۆسقاڵێکی زەمانە،
لە پەنجا ساڵ ڕەتی داوە ئەم ژیانە،
بەردەوام لێم لە تێکدانە؛
دەم لە دوای دەم،
فڕێك لە تەمەنم دەدا،
قومێك خوێنم دەخواتەوە؛
ناوناوەش لە سەیرانە!

٢٠٠٦/٨/١٤ - هامڵتن - کەنەدا.

## گوڵستان

له ناو گوڵستانی هەستم
چاوم دەگێڕا هۆزانێك، لەو مێرگە بێتە بەر دەستم،
قەراخ کانی نەما نەچنم، ڕەز و ڕەوەز نەما نەڕنم،
بەرماڵ نەما سەری لە سەر دانەنوێنم،
سێبەر نەما سەر خەوێکی لێ نەشکێنم،
گوڵێك نەما بۆنی نەکەم،
بەردێك نەما هاواری خۆمی بۆ نەبەم،
شەو یاخییە! شیعر شەونخوونی دەوێ،
کێوی قافە! ووشەیەکم دەست ناکەوێ،
بێ دەگەڵ من، بە سەر لووتکەی خەمێ کەوێ!
شیعر میهرە، دڵم جەنەی لێ گرتووە،
کەزی و بسکی ناسکی دەوێ
شیعری نەبێ، ماڵی نەڕمێ، دڵ ناسرەوێ!
له بەر دەرگای ماڵی باوکم، لە تەیراوە،
لە قرچەی گەرمای نیوەڕۆ، دەرگایەکم بۆ کراوە،
مزگەوتی شعووری جاران، دوو ڕکاعەت سوننەتی ویست،
لە دەرگەی میحرابی شیعر، دوو دڵۆپە فرمێسکی تەڕ
لە گوڵزاری هەردوو بیلبیلەکەی چاوم، دەستیان گرت،
بە ئاوازی نووزەی یادداشتی منداڵیم،
سەماییێکی گەرمیان کرد.

٢٠٠٦/٧/٧ - تەیراوە - هەولێر.
لە بەر دەرگەی ماڵەکەمان لە تەیراوە

**شیعر**

شیعرەکانم،
وەك شیعری هەستیاران نییە،
هەڵبەستی من،
پارچە پەڕی با بردووە،
نووسیمەوە،
هەستڕێژم کرد،
خوێندمەوە،
وەکوو لەشکر ڕێکم خستن!
جا گەر هات و ڕات لە هەموو
شیعرەکان هەبوو،
گەر لات وابوو کە پڕ جۆشن!
تکا دەکەم،
ئاگام کەوە،
تا نووشتەیێك بۆ خۆم بکەم!
یان سەردانی دکتۆرێکی دەروونناس، بم؛
چونکە ئەگەر وا بوو،
مرۆڤێکی ئاسایی نیم،
یانیش تۆ خۆت خوێنەرێکی نائاساییت؛
بۆیێ هەموو شیعرەکانی منت،
لە دڵ خۆشن!

٢٠٠٦/١/٢٠ - هامڵتن - کەنەدا.

٢٠٠٧

**لێم وەرگرن**

لە نووکی مووی تۆقی سەرم،
تا نینۆکی پەنجەکەی پێم، سەر تا سەرم،
ووشەی کوردە!
قسەم شیعرە، هزرم بۆ گەلەکەم پردە؛
سێ کەڵتووری لە یێك جودا،
لە ناو مێشکم، یێکتر دەگرن!
دەبنە خامە؛ نووسینەکەی خاوێن، وردە!
هەتا ماوم،
ئەمانەتە؛ لێم وەرگرن! کە ڕۆیشتم، نامبێننەوە!
یەقینیشم،
لە پاشە من،
تا چەند سەدە،
لە کوردستان،
کەسێك نایێتە بەر دەستان،
بە سێ زمان شیعر بڵێ،
لە بۆ هەمووان،
دوور لە حزبان،
بێتە ناو نووکی قەڵەمتان.

٢٠٠٧/١٠/١٤ - هاملتن - کەنەدا.

۲۰۰۹

**یـــاری من**

سروەی بەیان مەحاڵە وەك یاری من بێ!
سروەی بەیان لە دوای کازیوە هەڵدەکا،
دێت و دەڕوا.
یارەکەی من،
هۆ خزمینە، کازیوە لە دوای خۆی دێنێ،
تنۆك تنۆك مچوڕکی پڕ کامەرانی،
لە گشت جەستەم دەئاڵێنێ!
گەر دووریش بێ،
خۆشیی هەرگیز لە ناخ دڵم ناچێتە دەر،
هەر دەمێنێ.
یارەکەی من،
گوڵ دێ لە بەرانبەر لێوی پەممەی،
سووراو دەکا،
سپیاو دەکا،
بە ڕەنگاوڕەنگ خۆی دەنوێنێ!
بەڵام کە لای مسۆگەر بوو
بە سۆزی یارەکەم ناگا،
سیس دەبتەوە و تاجەکانی یەکە یەکە دەوەرێنێ!
کوڵمەکانی یارەکەی خۆم،
سپی ڕەنگن،
وا ئاونگیان لێ نیشتووە؛
چاوەکانی ئەستێرەنە، دڵی منیان لێ نووستووە،

ئەبرۆکانی،
هەمیشە لە هەڕەشەنە،
بەڵام کەسیان نەکوشتووە!
هەرگیز خوێنیان نەڕشتووە!
باوەش تەڕە،
جەستەی نەرمە!
سۆزی هەر چەند دیلی شەرمە؛
بەڵام کە دێتە باوەشم،
هەڵم دەکا؛
هێندە گەرمە.

٢٠٠٩/١/٢٦ - هەولێر.

**کوردایەتی**

تاکوو مابم،
کوردایەتی بۆم ڕێبەرە!
هزر بەخش و پشت و پەنامە؛
هاندەرە!
لە پێشمەرگەی کوردان فێر بووم،
کوردایەتی لە بن نایە،
لێیان فێر بووم،
کوردم بوێ،
کوردایەتی بەرخودانە!
ئێستا وا کاتی مەیدانە!
ڕێگری لە دوژمنانە؛
دوا قۆناخی ڕێبازی
ئازادبوونی کوردستانە؛
گەلۆ باوەڕ بە خۆ بوونم،
لە کانی هزری کوردانە؛
دڵنەوامە،
کێوەکانی کوردستانم،
ئازاد دەبن بەم زووانە.

٢٠٠٩/٢/٢٤ - هاملتن - کەنەدا

## کەین و بەین

کەین و بەینێکی سەیرانە!
نە هزرم هێندە ڕووناکە لە بنەوانی بوونم بگا،
نە هەندە شارەزاشم من،
تا تێبگەم چی ڕوودەدا!
پرسیار بە دوای پرسیاردا دێ،
دەنووك لە مێشكم گیر دەكا،
ئەرێ تۆ كێی؟
لە كوێ هاتی؟
بۆ كوێ دەڕۆی؟
ئەرێ ئامانج لە هاتنت چییە؟
كە تۆ هاتی بۆچی دەڕۆی؟
كەی بوو زەمان دەستی پێكرد؟
كەی زنجیرەی ئەم ژیانە دەبڕێتەوە؟
ناوت نووسرا، كەی ئەو ڕۆژ دێ، دەسڕێتەوە؟
كێ نەرێنی ئەم كەین و بەینە ئاڵۆزە هەڵدەماڵێ،
لە نیوەڕۆژ دەیلێتەوە؟
نەمن زەینم هێندە ڕوونە تا تێبگەم،
نە ئەو هێزەی دایهێناوم هێندە زیتە قوڕی بنی ئەم ئەفسانەم بۆ ڕاماڵێ!
چ سڕێكە لە ئەو دیوی عەقڵی مندا شراوەیە؟
چ مەیلێكە ئومێدێكم پێ نابەخشێ،
تا ئەم قوتبە تاریكییە ڕەوشەن بكەم؟ بیكەمە ڕێ!

هەر لە زەردەشت تا ئیبراهیم، هەتا یوسف، تاکوو ئەیوب، کۆنفۆشیۆس و بوودا و یونس، مووسا، عیسا، تا دەگاتە پەیامبەری موسوڵمانان، لە پاش ئەویش خەیامی وێڵ و سەرگەردان؛ نەیاتوانی ئەم حەقیقەتە هەڵماڵن! ئێستاش ئەوەی خۆم تێبگەم ڕەش و سپی تێکەڵ یەکن؛ ڕێگە بە ڕەنگەکانی دی نادەن سەر دەربکەن. مەگەر من خۆم، لە ناخ ڕاستی بوونی خۆمدا چەند نهێنی ئاشکاردەم. ئارەزوومە لە کونهی (ڕاستی) تێبگەم، چونکە بە ڕاست: ئەوەی نێتە سەر هزری من؛ ئەوەی نێتە ناو چوارچێوەی تابلۆی تێگەیشتنی وردی من، هێندە تەنکە، زۆر ناسکە؛ ناشێ بگاتە ئاستی من!

من دڵنیامە و دەزانم، ئەو کەین و بەینە لە کوێیە؛ لە ناو کۆن دێ، چی نوێیە؛ هێزی پێیە! بۆیێ کۆنیش لە ناو نوێ بەدی دەکرێ، خەوی لێیە! هەردووکیشیان پەروەردەی کونجی ئەزەلن! ناپسێنەوە؛ نەپسانەوەش کۆرپەی ناو مێشکی ئینسانە؛ چونکە ئەگەر مرۆڤ نەبا - ئەزەل وجودی نەدەما!

مێژووی مرۆڤ خۆی بە تەنیا، چیرۆك و سەربردە نییە؛ ئەفسانە و دەسکردە نییە؛ شیعر و حەیران و لاوك و خۆ هەر هۆرەی جافان، قسەی ڕەوانی چاوەش و شایەر نییە؛ هەر پەڕێکی پنجی مێژوو - ڕەنگی توخمێکی لێوەیە؛ خوێنی گەلێکی پێوەیە؛ پەڕی مەلێکی تێوەیە؛ کەڵبەی سەگێکی ژێوەیە؛ ڕنەی شێرێکی هەر هەیە!

فەلسەفەی عەقڵی ڕووناکی پێغەمبەرێکی پێوەیە؛ ماکی خوێنی ملی بڕاوی چەند مەلیکێکی پێوەیە! ئارەقەی پشتی کۆماوی چەند کۆیلەیێکی پێوەیە؛ چڵمی کۆرپەی دایك مردووی تێهەڵسواوە؛ ڕیخی مانگای هیندۆسانی پێ نووساوە، تۆزی تەباشیری دەستی مامۆستای

وا لێنیشتووە؛ گوللـــەی گەرمی تۆپخانانی پێکەوتووە! پەنجەمۆری هەزاران دیلی ئازادی لێ نیشتووە!

ئازاد، کۆیلە، عاقل، دانا، پیاوی شێت، گێل و زانا؛ عارەب و کورد؛ تورك و یۆنان؛ ئەڵمان؛ تامیل و ئامازیغ؛ ئازەر؛ بە سوننە و بە شیعە؛ موسوڵمانان بە هەر هەموو مەزهەبەکان؛ گاور؛ یەزیدی؛ کاکەیی؛ دورزی؛ مایی تا هیندۆسی؛ چینی و بێ خودا و بێ باوەڕ؛ هەر هەموویان پیساتییان لە ناو دەقی مێژووی ئەزەل، جێهێشتووە! لە زانینی ئەم مێژووە، لە پێداچونی لە ناو چوون، لە ناو بردن، تەواوی گەلێك قڕ کردن؛ هیچ ڕەها نین! باوەڕ ناکەن، کەوا مێژوو ڕاست نەبووە، درۆ چووە! نەدەشزانن ئەزەل چی لە بن پاشۆڵێ وەشاردووە!

دڵنیاش نین، ئایا مێژوو ڕاستە - درۆیە!

مێژوو تارە؛ ئەزەل تارە؛ ئایندەش لە بن باڵیاندا تاریك بووە!

ترسیش گەورەی تاریکییە،

وا لە ناو دڵی هەمواندا خۆی ماتداوە، لێی نیشتووە؛

ترس کانە بێ سەرەتا، لە ئەزەلدا، وشك ناکا، هەر هەبووە!

پێچەوانەی هەموو وجود هەڵدەکشێ،

سەیریش ئەوە، کۆتایی دوا قۆناغیش، هەمیشە هەر پێشەکییە!

ترس نەبێ، پێشەکی بێ کۆتاییە!

بۆیێ لە ڕووی ئەم زەمینە، نە ئایین و نەکولتور و نەهزر و بیر،

نە فەلسەفە، هێندە کاریگەری نەبووە و نییە.

ئەم ترسە لەم تاریکییە، ڕەوشتی پێمان گۆڕیوە،

هونەر و وێژەی کوشتووە؛

میوزیکی بەنگ کردووە،

یاسا و سیاسەت، ئەدەب - نووسین،
یان فەلسەفە، شارستانی سەرتاسەری ئەم دونیایەی سڕ کردووە!
ئەم وجودە بۆتە مەیلێك، کەسێك نییە هەڵیبێنێ؛
بۆتە بیرێك کەسێك نییە ئاوی پاکی هەڵێنجێنێ؛
قانوونێکی بۆ ڕێك بخا،
مەحەکێکی لە بۆ دانێ، بتوانێ هەڵیسەنگێنێ!
هەر چەندە بۆی هەوڵ دەدەم،
ئەم مەیلە بۆ خۆم هەڵبێنم؛
بناغەیێك هەڵبکۆڵم، تەلارێك بۆ خۆم دابێنم؛
بەڵام داخم!
لێرە و لەوێ
چاڵی گەورەی تێ دەکەوێ!
بناغەکە نغرۆ دەبێ!
نە پلانێکی توکمەی ڕێك،
لە سەر بنەمای هزری پاك، دادەڕژێ،
نەپێشبینی ڕووناکیشم قەت پێ دەکرێ.
٢٠٠٩/١٢/٢ - تۆرۆنتۆ - کەنەدا.

**پاریس**

لێرە، ئاسمان باڵندەی پەڕەسێلکەیە؛
ڕەنگدانەوەی خەونی گەشی تریوەی سەد ئەستێرەیە؛
لە ناو ئاوی ڕووباری سین، دەبیندرێن؛
سەیرانت دێ!
لەم پاریسەی فرەنسییان،
ئەستێرەکان وەك ئەوانەی پیرەمێرد نین؛
لە ناو ڕووبار، لە سەر زەوی ترووسکەنە!
شەو و ڕۆژی ناو ئەم شارە،
بە یێکەوە ئەستێرەکان جەلە دەکەن!
نە پاریسە ئۆقرە دەگرێ،
نە پاریس بە ڕۆژ دەشڵەژێ!
(لا توخ ئیفێل) پاسەوانە؛
قامکە گوڵی تەزووی ناسك، بە ناو جەستەی میوانانی هەڵدەمژێ!
لەم گەڕە ئاڵۆزاوییە؛ لاتەریکە،
لە ناو (کڵێسای نۆتخدام)،
سەدای دەنگە زوڵاڵەکەی خوداوەند،
دەبیسترێ!
پیاڵەی بادەی گڕ گرتوو،
ماچی لێوی عاشقانی دنیا دەکەن،
کڕنۆش لە بۆ نەناس دەبەن!
ڕووناکی ڕەنگ دەداتەوە،
گڵێنەی چاوی خەواڵوی سەرمەستەکان،

ڕەباس دەکەن!
لەم پاریسە،
هەموو دونیا کۆبووەتەوە!
پاریسییەکان،
دەست لە ملی ڕەش و سپی،
ڕۆماننووس و شاعیر دەکەن!
(سین)ی ئارام بە شێنەیی شەپۆل دێنێ،
سیمای خۆری ئاسمان دێنێ،
زەدەخەنەی لێوی تەڕی کچە پاریسییەکان دێنێ،
لە لا لێوی بە نزگرەی ئاوارەکان،
ماچی گەرمی جوان دێنێ!
زۆرم سەیرە،
چلۆن خورشید،
ئەم ئاسمانەی ئەم پاریسە، بە جێدێلێ!
خەواڵووە،
تا بەیانی،
هەرکە بەیانیش هاتەوە،
زۆر لە جارانیش قەشەنگتر،
خۆشی لێرە دەبارێنێ!

٢٠٠٩/٥/٢٩ - پاریس - فرەنسا.

## ٢٠١٠

### بۆ دایکی منداڵەکانم

جیهانەکەم،
هاوسەرە گەورە و گەشەکەم؛ نە جوانی تۆ،
نە نەرمی پێست، نە ئاگری چاوانی تۆ،
ئاواتمە!
هەر بۆ ناخی مێشکت دەڕۆم؛
چونکە شەرتە ڕۆژێك لەوێ، ببمە جووت و باوانی تۆ،
تۆش دەزانی،
قەشەنگی جەستە و جوانی، ڕۆژێك دێ، دەڕوا زەمانی!
بەڵام باوەڕ، بە عەکسەوە، پاش ئێمەش هەر دەخولێتەوە،
بۆیێ گیانە، حەزم لێیە دڵنیا بم،
ئاونگ لە سەر عەرشی گەڵای بەهار،
تاجی تریفەی مانگەشەو لە سەر دەکا؛
دڵنیابم، مەحبووبە دێ،
لە دوڕ چاوی، پڕ لە عیشقی، خودی نالی، نەزەر دەکا!
دڵۆپ دڵۆپ، یەکەم بارانی پایزیش،
دێت و قوڕگی تینووی زەوی باش تەڕ دەکا،
ئەو کات نووری ئەڤینی تۆ،
لە کریستاڵی هزری من، سەر دەر دەکا.
هەرکە فیکرم گڕی گرت و دەستی خستە ملی عیشقت؛
بە ڕەوە پەروانە هاتن، لە سەر دەستم باڵیان تێکنا،
گوڵزار لە بۆم هاتنە خەندە،
شەمی وەلی دێوانەش هات،

قامکە ناسك و نەرمەکانی لە سەر سەرم، شل کرد، لێك دا.
ئەی ژنە بێهاوتایەکەم،
پەری ناو ڕووباری خوێنم، بە ئاسپایی چرپەییێکت لە بۆ دەکەم،
شمشاڵەکەی قالەمەڕە[1] نەیکردبێ!
شنەی شەماڵی کوردستان، ڕێگەشی پێ نەبردبێ؛
بەفری قەندیل نەیناسیبێ؛
ئاخر ژنە دڵ گەورەکەم،
ئەی ئەو شۆخەی، وەك کۆرپە، نازم هەڵدەگری،
وەك شاعیر، سۆزم وەردەگری، لە ئاماژەی چاووم دەگەی،
چرپەیەکت لە گوێ دەکەم، لێی تێبگە، ووتەکەی من گۆرانییە،
نەگوتراوە؛ لە بیابان وەکوو ئاوە،
لە تاریکی ڕۆناهییە؛
لە ژێردەستی – ئازادییە؛
لە هاوین، دەبێتە سێبەر؛
چرپەکەی من،
وەك خۆی نەبووە، نەبووە و نییە؛ نەخولقاوە!
تۆم خۆش دەوێ،
خۆشەویستیت ڕووبارێکە، بەر لە بوونم هەڵقوڵاوە؛
هەر خوڕەی دێ، ووشك ناکا؛ هەر خۆی ئاوە!
مۆرکێکە، هەر دەمێنێ، گەش دەمێنێ؛
جا با هەر زەمان قووتم دا،
خۆشەویستیت بێ کۆتایە؛ کۆتای نایە، دەیسەلمێنێ!
٢٠١٠/١/٢٤ – هاملتن – کەنەدا.

[1] قالە مەڕە، (١٩٢٥ – ٢٠٠٩) – شمشاڵژەنێکی کوردی خۆرەلات بوو.

٢٠١١

**ئەگەر نەینووسمەوە تەق دەکەم!**

ئەگەر ئەمە نەنووسمەوە،
باسی ئەمڕۆ، بۆ ئایندە نەگێڕمەوە،
ئەم هەموو بابەتەی هەمە،
تۆمار نەکەم، نەیڵێمەوە،
خیانەت لە مێژووم دەکەم،
بۆیێ ناچار، دەینووسمەوە!
دڵنیاشم ئەم نووسینە،
ڕەنگە، بە دڵی هەمووان نەبێ،
دەنگی بۆ ناو مێشکیان نەچێ،
ڕەنگی بۆ پێڵاویان نەبێ!
ڕەشماڵە، بە جێیان نەبێ!
بەڵام وا هەر دەینووسمەوە،
وەکوو مێژووی کوردەواری، دەیهێڵمەوە،
کاشکا ڕۆژێك، میریان دەبێ،
دەیخوێنتەوە و پێیدا دەچێ،
جا هزرێکیان لێ وەردەگرێ، دانامێنێ، دێتە ڕێزێ،
نەتەوەی کورد، لە گێرەشێو، دەپارێزێ!
دیمەنی شار
ئەم شارانە پڕیان دیمەنی پڕ گەردە!
دراوسێیەك دەرگەی ماڵی ئۆتۆماتێك دەکرێتەوە،
دەرگەی حەوشەی تەنیشتەکەی بە پەت بۆی دەبەسترێتەوە.

ئەو بە مۆنیکا و وەنەوشە، لە گەراجی ماڵ دێتە دەر،
ئەمیان بە کڵاشی دڕاو، بە دڵێکی پڕ لە کەسەر،
ژینی ئەمڕۆی تەماوییە، سبەی چییە؟
دوو بەیانی یا بۆی دەبێت، یان هەر نییە!
**زیندان**
لەم شارانە، جەحێڵ ئاوا فێر کراوە،
وەکوو کۆیلە، دەست لە سەر سینە ڕاوەستێت،
نەکا گەورەکەی لێی پەست بێت!
گەنجی ئێرە، بەندی زیندانێکی گەورەی بێ دیوارە؛
چاودێر و پاسەوانییەتی، هەموو چاوێکی ئەم شارە!
چی لە بەرە؟ چی لە سەرە؟
کێی هەڤاڵە؟ کێی لە ماڵە؟
چ دەخوا؟ چ دەخواتەوە؟
ڕۆژێ چەند جار دەچێتە مزگەوت؟
چەند ڕکاعەت نوێژ دەکات؟
چەند لێی دەنوێت؟ خەو دەبینێت؟
گەر خەوی دیت، کێی هاتە خەو؟
خەونی خێرە، یانە شەیتان بە خەوەکەی فێرە؟
ئەگەر شەیتان هاتە خەونی،
لێی دەپرسن ئەرێ شەیتان، چی لە گەنجی ئێمە دەوێ؟
خەونی گەنجیش وەك خودی خۆی چاودێر دەکرێ،
ئازادی لێ هاوێر دەکرێ.
ئاخر کلیلەی شارەکان، زۆر سواوە،
دەشێی بڵێی هیچ ددانێکی نەماوە،

خۆشی و شادی لەبەر ڕادیۆی ڕیشنەکان،
لەبەر تیڤی، زمان پیسە چڵکنەکان،
لەبەر کادیری حیزبەکان، لە گەنجان زەوت کراوە!
وڵاتێکی ڕێك و جوان، لاوانی گەمارۆ داوە!
لەبەر عەیبە، یان لە ترسی لۆمەی خەڵك؛
ئازادی پەلبەست کراوە،
لەبەر هۆزگەردی و عەشیرەت،
هێز لە یاسا گەورەترە و قانوونیش پەکی خراوە!
کێ دەڵێت وڵاتمان گوڵە، ژیانی خۆشی لێ ماوە؟
**نێرینە**
هەندێك خورتی کوردی هەژار، دژی کارن؛
حەزیان لە شەقام پێوانە؛ تەنیا خولیای خۆ هەڵدانن!
لە بەنگلادیش، پاڵە دێنن،
شەقامەکان پاك کەنەوە، شارەکان جوان بنوێنن؛
کەچی گەنجی کوردی جاحێڵ و ڕێك، شارەکانیان ناخەملێنن!
نەك هەر تەمبەڵن، کار ناکەن،
بەڵکوو نێری بێکاری سەر شەقام؛
تیر و توانجی زۆر بێ تام،
سووك و ڕیسوا،
لە بۆ کچان دەهۆننەوە!
کچە کێیە، گرینگ نییە!
خوشکە، دایکە، قوتابییە،
یانە بووکی جل سپییە،
سەر بە هەشە،

یا دڵتەنگ و چارە ڕەشە!
هەمووی یەکە، لای ئەو گەنجەی کەس نازانی، چۆنە و چییە!
هیچ بەهاییێکی کوردانە، لای ئەو گەنجە، ڕەگی نییە!

**مێیینە**

کچێك قایل بێت بە کەمی،
زمان نەگەڕێت لە دەمی،
هەڵنەڕێژێت خۆشی و خەمی؛
چ دایکێکی لێ دەردەچێت؟
چ منداڵێك بەرهەم دێنێت؟
کام گەنجێك دەبتە هاودەمی؟

**شۆخ و شەنگ**

هەر شۆخێك کە بە لەنجە و لار،
لە ناو پەرتووکخانەی زانکۆ،
کتێب لە دەست، بە شەقامێدا دێتە خوار،
جوان دەکا دیمەنی شار،
ئا، ئەم شۆخە، شایانە ببێتە سەردار.

**ڕووپۆش**

لەم سەردەمە، ئەو کیژۆڵەی ڕووی پۆشیوە،
ڕووناکی لە خۆی گرتووە،
شارەکەی کرێت کردووە،
ناتوانێ بێتە نێو مەیدان؛ ببتە سەردار،
قەت پێی ناکرێت، ببتە پشتیوانی هەژار،
هەر لە دواوە، لە بن ڕووپۆش ڕادەمێنێ،
نە خێر دەدات، نە خێر دەکات،

نە تۆوی چاکی دەچێنێت!
ئەو ڕوو سوورە، کوردستان بۆ دوژمن دێنێت!
نە سوود بەخشە، نە شیرینە،
نە ڕازاوە و نە نەخشینە،
نە ڕێبەرێکی سەنگینە،
وڵات بۆ ئەو عارەبانە دەبات، کە لە ئیسلام بێبەرینە!

**دیوار**

منی پیری ڕیش وەك بەفر،
ئەگەر لە ڕێ؛ وەکوو باوك،
سەلامێکم لە کچێك کرد،
سەلامێکی وەکوو شەکر،
چونکە هیچ متمانەی نییە،
چونکە گیرۆدەی ترسییە،
نازانێت باش بە ڕەوانی،
وەڵام بێتە سەر زوبانی!

**چاوەڕێ**

چاوەڕێمە، کاشکا ڕۆژێك،
گەنجی کوردی چاونەترس،
دیواری داخراوی هزر، دەڕوخێنێت،
قوڕی بنی لێزمەی ڕەشی هزربەندیی، دەردەهێنێت،
تەلی باریکی بێ پاساو، دەپسێنێت،
ئەو کات گەنجی کوردستانمان،
ئازادی خۆی وەدەست دێنێت.

**بریا**

بریا، بریا، هەزار بریا؛
کچە خانمە دراوسێکەم کە دەمبینێت،
دەوێرا پڕ بە دڵ بڵێت –
مامۆستاکەم ... بەیانیت باش،
لە ترسانا، نەدەگەڕاوە پاشە و پاش.
جا لە ناخڕا پێدەکەنیم؛ دڵم نەدەبووە هەزار قاش!
بەڵام چ بکەم! منی تەنیا، 'کەس باراشم ناباتە ئاش!'
دڵم، لەم بابەتە، پەست بوو،
مێشکم گریا، هەستم مەست بوو،
هەموو ژینم بووە بریا،
بریا کچ ڕێگەی پێدەدرا،
تا متمانەی بە خۆی هەبا،
ئینجا عەقڵ لێزمەی دەدا،
مێشك بیری دەکردەوە،
سارد و گەرمی تێکەڵی یەکتر نەدەکرد،
ڕاستی بە درۆ نەدەبرد.
ژیانیشی خۆشتر دەکرد.
زانست و خەیاڵ
هەستن وەرن هۆ گەنجینە،
ئێوە، دەی! کیژ و کوڕینە! ئەی کوردینە،
ئەو کتێبانەی قەدەغەن ... بیانهێنن،
ئەو دەستوورانەی قەدەغەن ... بیسەلمێنن،
ئەو نەریتانەی لە سەریان کورد دەکوژرێن ... بیرمێنن،
عیلم و خەیاڵ نابن بە یەك، فڕۆکە بە دوعا نافڕێت،

ڤایرەس چونکە زیانبەخشە، مەحاڵە کاری خودا بێت،
عەقڵ هەوە: هزر هەوە: فیکر هەوە،
لە سەر مینبەر،
دروست ناکرێت ... کۆمپیوتەر،
خوا دەفەرموێت - [وَ قُل اُعْمَلوا...]
کۆشش نەکەی؛ بەرهەم نابەی.
ئەوەی هەیە، زۆر جودایە لەوەی نییە،
چمان هەیە؟؟؟!
بەڕکی پڕ و کەللـــەی زل و مێشکی بەتاڵ.
**من خۆم**
من عاشقی سورمە و کوحلی چاوی هیچ کیژۆڵەیێ نیم،
بۆ کورد ژیام، بۆ کورد دەژیم.
ڕاستە بە مامکاك ناسراوم،
بەڵام ڕاستتر ئەوە - نە ماماویم نە کاکاویم ...
ڕەش و ڕووت و کتێباویم،
دڵم هەردەم لە لێدانە بۆ ئازادی،
بۆ سەربەستی نەترساوم،
لە بۆ ڕاستی، بۆ جوانی؛ لە پێناوم؛
چونکە پارسەنگی ژینمن،
چونکە ئامرازی بوونمن،
چونکە کۆڵەگەی دینمن.
بەیانی و پیرەمێرد
کە بەیانیان دەچمە سەر ئیش،
هەموو ڕۆژێك لەم چوار ڕێیە،

پیرەمێردێك لە سەر شۆستەی گەڕەكێیە!
سەرما گەرما، هیچ ناگۆڕن؛
ئەو پشت کووڕە هەر لەوێیە!
ڕیشی سپی، لەڕ و باریك، لە سەر پێیە.
کە دەیبینم، گەرووم دەبتە زەققوومی تاڵ؛
دەوم دەبتە بیابانی وشك و بەتاڵ!
داخی گرانم،
ئەم سەردەمە بۆ ئەم کەنەفتە چی پێیە؟!
هەر جارەکی کە دەمبینێت،
چونکە جارێك پێم گوتووە -
من هیچ جغارە ناکێشم،
دەستێك بنێشتی بۆم دێنێت!
کە منداڵ بووم، دایکم گوتی -
نابێت پیاو بنێشت بجوێت،
دەنا سمێڵی خوار دەبێت.
بەڵام لێرە بە گوێی دایکم نەکردووە!
هەموو ڕۆژێك بە ٢٥٠ دینار، جاجگێکی تفت و تاڵی لێدەکڕم،
ئەم بنێشتە گۆشتی خۆمە، زوێر، زوێر لە دڵی خۆمی دەبڕم،
ئەم ددانانەی ناو دەوم زۆر نەماوە بمکرۆژن، بەڵام چ بکەم؟
ناچارم پاش بنێشت کڕین، هەموو جارێك بۆی پێکەنم؛
ئاخر بۆ ئەم پیرە ساڵبەزێنە دەبێت سەرباری هەقەکەی،
زەردەخەنەشی پێشکێش کەی؛
توخوا ویژدان، ئەگەر ئاوا نەکەم، چ بکەم؟
چ بکەم؟ چ بکەم؟؟ چارەسەری لە کن کێیە؟

خۆزگە هەرگیز دادم نادا،
ئەم چارەنووسە بەدکارە،
ڕۆژێ دوو جار ڕووبەڕووی یەکترمان دێنێت، من و ئەو پیرە هەژارە!
حێ. هێ. کێ. = حکومەتی هەرێمی کوردستان
دوێنێ کابرای پیرەمێردم نەدیت -
ئەمڕۆ هاتم پرسیاریم کرد: دیار نەبووی؟
گوتی: گوتیان:
'وا [حێ. هێ. کێ.] معاش دەداتە فەقیران،
جا منیش چووم.'
گەشامەوە، گوتم: ئۆخەی! لێت پیرۆز بێت.
گوتی - 'بەڵام چونکە خزمە وەزیر نەبووم؛
چونکە باوکی کچی ڕوومەت پەنیر نەبووم؛
چونکە ناسیاوی میر نەبووم؛
بەو ڕێگەدا هاتمەوە کە پێیدا چووم؛
زیانیشم ڕۆژێك ئیش بوو، دوو کڕیاریشم لە دەست چوو.'
سەیری دوڕ هەردووك چاویم کرد؛ گەلەك ڕاست بوو.
سەیری دوڕ هەردووك چاویم کرد؛ کەڵەمێر بوو.
سەیری دوڕ هەردووك چاویم کرد؛ پیرە شێر بوو.
خاوەن هەق بوو: مافی هەیە لەم کوردستانەدا بژی،
مافی هەیە لێرە بمری،
مافی هەیە لێرە بخوا، لێرە بڕی،
مافی هەیە پەنجە لە چاوی ئەو بنێت، نانی دەبڕی.
چیرۆکی ئەم پیرەمێردە
ئایندەی ئەو گەنجە کوردە

ژیانی بن پێچە و پەردە،
هەستیان پەست، عەقڵیان مەست،
کەلەپچەیان لە دەست کردم.

**لایتی سوور**

لایتی سووری سەرجادە بۆم داگیرسا؛
شوفێرم، ناچار ڕاگرم.
پیرەمێرد، دیسانە، نەهات.
گەنجێك، تەمەن لە خوارووی بیست، لە شوێن ئەو بوو،
بانگم لێی کرد؛ سۆراغی پیرەمێردم کرد.
گوتی - باوکم؟ سەرمای بووە،
هەموو جەستەی لێ ڕەق بووە،
نەخۆشە، لە ماڵ کەوتووە.
ئای لەو خاکەی پڕ خێر و بێر!
ئای لەو ئاخەی باوە گوڕگوڕ!
ئای لە وڵاتی دوو سەرچاوەی دیجلە و فرات!
سەد وای لە دەشتی بیتوێن و شەمامك و سەدان دەشتی وەکوو قەراج!
کەچی هێشتا گەنجی چالاك، پیری چاپووك،
بۆ لەتێك نان، ڕەق هەڵدەگەڕێن لە سەرمان!
لە بنەپاڵی ئەوانیش وا، دز و گەندەڵ و ماستاوچی،
غەرقی حەرامی قانوونین، تا بن پیلیان.
چی بکەم من! نامەیەکم لە لایەن خواوە بۆ نایێت!
هەر دەگەڕێم لەو پەیامە؛ ئاخۆ دەبێت،
ئەم پەیامە ئەزەلییە بۆ ئەدرێسێکی تر نەچێت؟

هەر عەودالٚم بە دوای پەیامێکی ڕەوا، ڕێم پێبدا،
دەنگم بگەینمە کن خودا!
ئەم پەیامە هەتا نەیێت،
هەتا دەنگم نەگاتە خوا، هەر وا دەبین،
هەتا ئەو پەیامە نەیێت،
هەتا دەنگم نەگاتە خوا،
ڕۆژ لە ڕۆژ، پتر ڕوودەچین،
هەتا ئەو پەیامە دەگات،
هەتا دەنگم دەگاتە خوا، ئیفلیج دەبین،
ورگ زلتر، مێشك کەمتر، چاومان کزتر،
زەردەخەنەی گێلاتیشمان،
درێژتر و بێتامتر و هەر وا دەبین!
من و خودا،
لە کاری خوا، سەر سوڕ ماوە!
ئەو، لەم سەردەمەی ئێستادا،
سەدەها مەلای ناردووە،
پێچەوانەی زانایانی لە پێش خۆیان،
خەم لە هەموو شتێك دەخۆن،
عیلم نەبێت، ڕاستی نەبێت، کوردایەتی نەبێت!
منیش، سەر سووك، خەمی هیچم لەبەر نییە،
زانین نەبێت، ڕاستی نەبێت، کورد و کوردایەتی نەبێت!
جا بۆیێ من خەفەت بارم، برا دەبێ شوێنێك هەبێت،
لەگاڵ مەلا ڕیزدارەکان، بگەین بە یێك!
٢٠١١/٨/٢٨ - هامڵتن - کانەدا

٢٠١٢

## بازرانی و شکۆی مێژوو

لەو ڕۆژە بینیم سەرۆکە تازەکەی پەرلەمانی کوردستان، ئەرسەلان بایز، وێنەی پێشەوا مستەفا بارزانی لە ناو پەرلەمان لادا، ئیتر ئەم پەرچەکردارەی ئاغای بایزی هەستی خرۆشاندم و ئەم هۆزانەم نووسییەوە.

شۆڕەسواری کوردەواری!
چۆن هەمیشە لە هەموو دوژمنێکی کورد بێ منەت بووی،
توخوا لەمەش بێ منەت بە!
ئاخر ئەم سەرپەرلەمانە، لێنەزانە،
یان خۆ خۆرە، بڕکی تاڵە،
کەللـــەی وەکوو کوولەکەی زلـە، بەتاڵە،
با هەر لەوێ وێنەکەت بێنێتە خوارێ،
ئەم کارەی ئەو،
کرداری هەرزەکارانە، گرینگ نییە؛ کرچ و کاڵە،
بایەخ ئەوە،
سەرۆك مستەفا بارزانی، وێنەت لە دڵ هەڵواسراوە.
***
ئەی پێشەوا،
ئەم سەرۆکەی پەرلەمانە
دەبێ بۆ هێندە نەزان بێ، کە تێنەگات،
کورسی سەرۆکی پارلەمان
بە ئارەقەی خەباتی تۆ دامەزراوە،
بە خوێنی پێشمەرگەکانت وا چەسپاوە!
وێنەکەتی لەوێ لادا؛
دەستی نەشکێ؛

بەڵام خۆ لە ناخی مێشکم لا نابرێ و لانەبراوە.

***

تۆ پێشەوای، لە کاریتان یان لە بارزان،
تۆ پێشەوای لە سەر تا سەری کوردستان،
لە هەزارەها ماڵی کورد،
وێنەت لەگەڵ وێنەی باوکان،
وەکوو ئاڵاکەی کوردستان،
هەڵواسراوە، هەڵدراوە، هەڵکراوە.
ئەوان ڕۆژێك لە سەر کورسی دێنە خوارێ و بزر دەبن،
بەڵام مستەفا بارزانی تا دێ تۆ مەزنتر دەبی؛
شکۆی مێژووت لە سەر ناوە.

٢٠١٢/٢/١٦ - کانەدا

٢٠١٥

**شێوەنی گەنجانی پەناهەندە**

دەنگی شێوەن
ئەوا کوردستان دەتەنێ!
لە ناو ئیجە،
لە ناو کەناڵی ئینگلیسی،
لاوانی کوردی بێچارە،
سەری هاواری دەبەنێ!
وا دەگەڕێن،
بوخچەی شەپۆل دەکەنەوە،
هەواڵێکی بگێڕنەوە،
هەر سوارە،
لە ناو ئاوێدا چەقیوە،
هەر ئومێدە،
لە قوڕگی ماسی ون دبێ،
هەستن گەلۆ،
سەدای شێوەن مەبڕنەوە!
کانی ئەسرینی چاوەکان مەسڕنەوە!
نەفرەت لەو کەسانە بکەن،
قەتیسماون، شەرم ناکەن،
ڕێگە نادەن،
کارێك بۆ گەنج نادۆزنەوە.

٢٠١٥/١/٢٣ - هەولێر

**من و کێوی سەفین و بندەستی**

بەیانی دا، دنیا سپی هەڵگەڕابوو،
بینیم سەفین لەچەکێکی بەفری سادەی لە سەر نابوو؛
تریسکەی دا، قەشەنگ دەرکەوت؛
هاتمە سەیری، کاشکا خەمم دەشواتەوە؛
سەنگی زەمانە لادەدا و کەمێك دڵم دەداتەوە!
کەچی لە مەیدانێ دەرکەوت،
خودی سەفین چۆڕەی ئەسرین دەخواتەوە!
کە دیتی، وا من حەپەسام، خێرا گوتی:-

- هۆ سەر سپی، ئەسرینەکەی من کاتییە، ماوەی کەمە،
کەچی ژینی ژێردەستی تۆ هەمیشەیە و هەمووی خەمە!
سەیرم مەکە؛ هەرگیز مەیێ سەیرانی من!
لە تەماشام پەند وەرگرە و فێربە لەمە،
نە من وەك تۆم نە تۆ قەت وەك منت لێدێ!
من هەر دووای چەند ڕۆژی دێ،
هێمای پیری لادەدەم و گەنج دەبمەوە،
کەچی تاجی بەفرینی سەر سەرت،
هەر لە چەشنی بندەستی خۆت،
تا تۆ دەگەڵ خۆیدا نەبا،
لە سەر سەرت ناسڕێتەوە!

٢٠١٥/١/٢٤ – هامڵتن – کەنەدا.

## هۆ خانمەکەم

سەیرت نەیێ کە وا زەمان تاجی زیوی لە سەر کردووم؛
هەر هەیبەتی ئەم تاجەیە دەمخەملێنێ، دەمهێلتەوە؛
دڵم هێشتا هەرزەکارە؛
شیعری تەڕی پڕ عیشق و جۆش، دەهۆنتەوە،
زەردەخەنەت دەخوێنتەوە،
لە گەڵ زرمەی بازنگەکەت دەخرێتەوە،
تیری چاوە پڕ نازەکەت دەگرێتەوە،
بە دیدارت، ئاسۆی شادی گزنگ دەدا؛
دەرگای خۆشی دەکرێتەوە؛
بە یێك حریتەی پێکەنین، زەمان تازە دەبێتەوە.
هۆ خانمەکەم.

١ / ٩ / ٢٠١٥ - هەولێر.

## ٢٠١٦

**هاوار لە خۆم،**

ڕۆژێ دێتن، منیش دەڕۆم.
بەڵام خۆ من تاکە کەس نیم،
بۆنی گوڵی مردن دەکەم، تۆزی ڕێگەی هەڵدەمژم، شیلەی دەخۆم!
لە پێش مندا چەندان گەلامان وەریون، چەندین ئەستێرە ڕژاون؛
نالی، خانی، بێکەس، سافی؛ لێرە، لەوێ، لە خاکی ڕۆم.
با هەر بژیم، سەد ساڵیش بێ، دەبێ دەرچم، لە بۆی بڕۆم،
بچم لە شوێنێ دوور وڵات، سەر نێمەوە، لە ناو گڵکۆم.
وەك پەرستاری بێچارە،
سەر لە زامی خۆم دەرناکەم، هیچ برینم تیمار نابن، برینی خۆم!
ماوە، پاچی زەمان لێمدا،
ڕووح و جەستەم، وەك کەڵە شاخ، لێك جودا کا،
چەرخی گەردوونم ڕاگرێ،
هزر و هۆشم لێ لابرێ، هەموو تەمەنم لادرێ،
بمخاتە چۆم.
من لە مردن ترسم نییە، چون دەزانم، من لەو ڕۆژەدا مردوومە،
کە لێی بوومە؛
من لەو ڕۆژی لە پشتی باوکم هاتمە دەر،
هەر ئەو ڕۆژی لە ناو چوومە.
هەتا ئەمڕۆ، کفنی ڕەنگ ڕەنگ بۆ خۆم دەکڕم،
خۆشم لەبەر خۆمیان دەکەم،
هەر واش دەبم تا ئەو ڕۆژەی، یەکێکی تر، کفنی سپی دێنێ لە بۆم.
ئینجا دەبێ، بژییمەوە، دیسان بۆ خۆم بتوێمەوە،

ئێستا دەچم، وەك چۆن هاتم،
بەڵام هەینێ، لە هات و چوون نابڕێمەوە.
لەو كات چاوم، لە میهری زاتی خودایە،
ڕەحمی ئەوێ بەزەیی ئێرەی تێدایە،
خۆشی ئەوێ، زەردەخەنەی لەگەڵدایە!
كە دەردەچم، خەمی گەورەم كوردستانە؛
لەبەر دەستی بێ دەستانە!
ڕاستە خۆ من، لەم وڵاتە هیچ شتێكم نەبردووە،
ئەوەی بووە، نیوەی پتر بۆ كارگێڕ و بۆ زارگێڕ و مەیگێڕ بووە!
من لێی ڕامكرد؛ چونكە بە ڕاست، هەستم پێیكرد
داری ڕەحمی لێ نەڕواوە!
سیاسییێكی بە شەرمی، لێ نەبووە!
هەموو ماندووی یێك سەفەرین، وەك ئەوانەی مەلە نەزان،
لە دەریای تووڕەی ئیجەدا، بێ خەبەرین.
ئەگەر بێتوو ئاسمان تەماشامان بكات، خراپەی دنیا بەش بكات،
نیوەی بۆ ئێمە جێ دێڵێ، جا با بیخۆم.
چ كاتێكی خۆشمان هەیە؟ چ ئایندەی ڕووناكمان دەبێ؟
مردن باشە دڵۆپ دڵۆپ با بینۆشین،
یان، با بە جارێك، هەڵوەرین.
ئەگەر مردین، خەم نامێنێ، گریان ئیتر دەبڕێتەوە.
بەڵام گەلۆ، ئێمە فێرین، باش دەزانین، ناوە ناوە دەژیێینەوە!
دەبێ لە پاش ئەم مردنە،
ناچار دیسان، وەكوو پێشان، هەموو بە یێك بگەینەوە؟
٢٠١٦/١/٢٣ - هەولێر

**هەنگاوی یێکەم**

تۆ یێکەمین هەنگاوم بووی،
لە ناو سووڕی خوێنی سوورم لە هات و چووی!
لە گەڵ خورپەکانی دڵم، گەشە دەکەی،
لە گڵپی ناو هەناومەوە،
ساواییێکی، بۆ خۆت دەنووی!
منیش تاوەکوو ئێستاکەش، کە دەتبینم، ڕادەهەژێم،
عەقڵم گرتووی چاوی تۆیە؛
وەك وشکەدار بۆت دەسووتێم!
لە دیدی من، تۆ ڕووناکی،
هەندەی ڕێچکەی ئاوی بەفر،
ساف و پاکی؛ هەندەی هزری پاراوی من، ژنی چاکی،
جیهانەکەم، عەشقی ئەزەلی ژیانم!
جیهانەکەم، تاکە هیوا و بوون و مانم!
بە تۆ ژیام، بە تۆ دەژیم؛ دەتخۆمەوە!
بۆیێ دەژیم، لە باوەشت بتوێمەوە!
لە پاش مردن، سەردانم کەی،
لە ناو گۆڕم، دەژیێمەوە؛ ئێستا چۆنم، وا دێمەوە!

٢٠١٦/٧/١٨ – هامڵتن – کەنەدا.

## جیهانەکــەم

جیهانەکەم،
بە بیرت دێ، لە ڕۆژێکی وەکوو ئەمڕۆ،
ماڵمان پڕ بوو لە نووری تۆ؟
ئوتومبێلە سوورەکەمان،
بە دیدەنی ڕوخساری تۆ،
بە سۆزی تۆ، لە خۆشی تۆ،
چۆن ڕازاوە و کردی چرۆ!
لە بیرت دێ، ئەو ڕۆژی دڵ، وەك پەپوولە،
خۆی هاوێشتە ناو ئاگری دوو چاوی تۆ؟
پڕ بوو لە عەشقێکی پاراو،
خۆش و بە تاو،
هەموو ئاواتم هاتنە دی، کە هاتی تۆ!
زەمان گۆڕا، ژیان گۆڕا!
لە ڕۆژێکی وەکوو ئەمڕۆ،
هەموو دنیام، هەر تۆ بووی تۆ.

٢٠١٦/٧/١٨ - هاملتن - کەنەدا.

**مالکی**

أیا حجة العراقِ، بۆ کوردستان بە خێر هاتی،
بۆ ئەو خاکەی تۆی پاراست و نانی پێدای،
بۆ ئەو شارەی لە زانکۆکەی جێی بۆ گرتی،
فێری کردی، تێری کردی،
تۆی شاردەوە لە قەومی خۆت، بیرت نەچێت، لە بیرت بێت.
بە خێر هاتی بۆ ئەو خاکەی وا لێت بڕی نان و خۆراکی هەژاران،
بۆ ئەو شارەی کە لێت نەهێشت لستی مووچەی کارمەندەکان،
بە خێر هاتی بە سەر چاوی ئەو کەمینەی، وا بە هاتنت شانازن،
کوشتنی هاوگەلی خۆیان لێت دەخوازن.
بە خێر هاتی بە سەر چاوی ئەو گەمژانەی،
بە گەورەی کورد قایل نینە و بەر پێی کورد کوژان دەماڵن.
بە خێر هاتی، وا دیارە سلێمانی ئیتر هەرگیز برسی ناکەن!
شاری هەڵمەت و قوربانی چیتر هەرگیز پشتگوێ ناخەن،
بەڵام ئەی حجة الاسلام، من یەقینم، ئێوە نانی سلێمانیش نادەن!
ئاخر هەر لە دێر زەمانە، کوردی گەمژە جێی گومانە!
پردی بەر پێی دوژمنانە، بکوژی ئومێدی ژیانە!
بە خێر هاتی، خاڵ مالکي، بۆ سەر گردی!
بۆ ناو جادەی مەلیك مەحمود، بۆ سەر شەقام، بۆ تووی مەلیك،
بۆ هەموو سووچێکی شاری، خۆت بە بێ سوود!
گەمژەکانی چەقی سیاسیانی کوردی بڕووخێنە، ئینجا بڕۆ، بگەڕێوە،
لە ناو سیاسییانی شیعەدا، شەرم مەکە؛ سینگ دەربێنە!

٢٠١٦/٧/١٨ - هەولێر.

**کەنەدا**

لێیان پرسیم -
تۆ هاوڵاتی، کام وڵاتی؟
لە کام وڵاتەوە هاتی؟
گوتم - گەلۆ! یێکەم جار بوو،
من لە سایەی ئاڵای شەکاوەی کانەدا، هەستم پێکرد کە ئینسانم
هەر لەوێ بوو چرۆی دەرکرد و گوڵیدا، بیابانەکەی ژیانم
لە کانەدا، گەشامەوە،
لە کانەدا، شەکامەوە،
شکۆم گرت و ژیامەوە.
***
هەتا دڵم خورپەی لێبێ،
هەتا چاوم خۆر ببینێ،
هەموو هەستم بۆی دەسازێ
هەموو هزرم یادی دەکات،
وەك کوردستان،
بۆ کانەدا سەر شۆڕ دەکەم،
دادێمەوە،
پەیمانێکە،
بۆ دوو وڵات،
جاڕیدەدەم،
نایشێرمەوە.

٢٠١٧/٢/١٦ - هاملتن - کەنەدا.

**دەتانەوێ ببم بە چی؟**

هەمووم کوردە تا دەگاتە ناو ئێسقانم.
دەتانەوێ وەرمبگرن بە لایەنگرێکی پارتی؟
باوەڕتان بێت؛ من ڕاست ئەوم!
تێدەکۆشن بمکەن بە مامی یێکێتی،
سپی وەك ماست، بێ سێ و دوو، بە خۆم هەوم!
گەرەکتانە، ببمە پارتێکی خۆر هەڵات،
بمخوێننەوە، بۆنی نێرگزی مەهاباد دێت لە دەوم!
ببمە سیاسی خۆر ئاوا، گوێم لێبگرن،
لە سەر لووتکەی کێوی ئەکراد، تەنیا کەوم!
پێتان خۆشە ببم بە چی؟
بە کادیرێکی هەدەپە؟
ئاسوودە بن،
لە ناو زیندانی تورکان و لە بن ڕووبارێکی باکوور، زیخ و چەوم!
بەڵام، تکا، لێم تێبگەن،
باش بزانن قەڵەمەکەم
بە کەس نادەم، کورد بترازێ.
لە ناو هزری هەر یێك لێتان،
چ لە کوردستان نزیکە،
چ دەگەڵ کوردان دەسازێ،
ئەو هی منە و
منیش هەر خۆم هەمووتانم.
مامکاکتانم.

٢٠١٧/٣/٩ - هەولێر.

**چاوەڕێ**

بیست و هەشت ساڵە چاوەڕێم، بە سەبرەوە، تا بێمـە لات!
نە تەڵقــین خوێــن ئامادەیە، نە تۆش هاتییە خاك و وڵات!
لەم ڕۆژەدا، دەی خــودی خــۆت، سەرت بۆ خوارێ داگرە!
دیمــەنی کــوردان ببینــە؛ بزانــە چییــان لێ بە سەر هات!
پەیڕەوکارانی دینەکـەت، عــارەب، عەجــەم و تورکەکـەت
گاسی کوشنــدە و ژاراوی دەپڕژێــنن، لــە نـــاو دێهـات
نــووری تۆیــان لـە نـاو کــوردان وا کــردە ڕێگەی قەڵاچۆ
دەمانکــوژن، بــە نــاوی تــۆ لە بن پەردەی ناوی خودات
٢٠١٧/٣/١٦ - هەولێر.

## هاواری خنکاوەکان

کیمیابارانی ئیدلب، لە سوریا

دەی خوای من و خنکاوەکان؛ بێرە مەیدان
دەی خوای من و خنکاوەکان
نە من،

بە خۆم، نە ئەوانەی ئەمڕۆ خنکان،
کەسمان نییە بۆمبێك بێنێ،
گوللـــەییێکی سووك بهاوێت، قۆچەقانی بخاتە شان
دەی خوای من و خنکاوەکان،
ئەگەر تۆ نێی،
بڵێ - توخوا - هاواری ئەو خنکاوانە بۆ کێ بەرم؟
ڕوو لە کێ کەم، بێتە هانام،
بنبڕیانکە ئەو کەسانەی دنیایان کرد کیمیا باران.
دەی خوای من و خنکاوەکان، وەرە مەیدان.

۲۰۱۷/٤/٤ - هەولێر.

**گوللـــه**

له بەر چاوی نەتەوە یێکگرتووەکان،
له بن سێبەری باڵی ئێف هەژدە،
له بڵندگۆی مزگەوتەکان،
له سەر مینبەر، له ناو میحراب،
له بن پۆستاڵی پۆلیس و زنجیر و تایەی زرێپۆش،
گوللـــەی ئاگر بە پەپوولەی ناو مێرگی نێرگز وەدەنێن.
٢٠١٧/٤/٥ - هەولێر.

**کەرکوك**

تەمەنت هەندەی زەمانە، هەندەی بوونی کوردستانە،
لەوەتی ئەم خاکە، خاکە، کەرکوك مەڵبەندی کوردانە، پڕ ژیانە،
کەچی هێشتا، بکوژانی ئەم سەردەمە هەوڵدەدەن؛
خاپوورت کەن، لە ناوت بەن!
لە سەر ئەم خاکە نەتهێڵن، هەوڵیانە، بتشکێنن،
هەڵتکوڵن، سامانی ناخت دەربێنن، هەر نەتهێڵن.
کە هەڵبژاردنت دەبێ، دەقیڕێنن،
کە ئاڵاکەت بەرەو ئاسمانێ هەڵدەدەی، دەقیژێنن،
لەگەڵ ئەمەش سلت نەکرد؛
لە ڕیفراندەم ڕاستی توخمی خۆتت ناساند،
کەچی ئەوان بە بێ شەرم، ڕاستییەکەت دەشێوێنن.
گەرەکیانە، لەم زیندانە بە سێ قۆڵی، چەسپت بکەن، بتروخێنن.
لە هەر لاوە، ترس بە ناو زیندانەکەت دەورووژێنن،
هەرچەند ترس دۆستی هەمیشەی خاکتە؛
نە ترساوی، نە دەتوانن بتترسێنن.
هەر تۆی کەرکوك، تۆ ئەڵماسی نیوچەوانی کوردەواری،
نە دەشێوێی، نە دەشلەژێی، نە دەفرۆشێی،
سەنگینتری لە مرواری،
دنیا ئەمڕۆ، هەموو - هەمووی لە ئاستی تۆ کەتنکەرە،
تۆش قاپە ماستێکی سپی، قەت ناتوانن،
لەبەر چاوی کورد ڕەشت کەن، بتخەوێنن.
٢٠١٧/١٠/١ - هەولێر.

**دامەنیشە!**

بێ دانیشە! پشوو بدەین!
ساڵانێکە بە ڕێگەوەین،
وا پێدەچێت ڕێگەش لەگەڵ ئێمە دەڕوا،
دەنا دەبوو لە کۆتایی ئەم گلۆڵە،
قۆناغێکی سەفا هەبا.
مێژوو پێماندەڵێ هەبوو،
گەر کورد نەبا!
بێ دانیشە! پشوو بدەین!
بیر بکەینەوە، تێبگەین!
بۆ چی وایە!
نەتەوەیێك برنج دەخۆن،
نەتەوەیێك سابوون دەشۆن،
نەتەوەیێك، ناوە - ناوە کڕنۆش دەبەن،
ئەگەر نەبێت خۆیان دەخۆن.
نەتەوەیێك، لە بەرانبەر زنجیرە درامای تورکی دادەنیش،
خەفەت دەخۆن!
نەتەوەیێك، مێشکی وەك تاکسی سەر شەقام،
ئەوەی خوا پێی خۆشبێ نایکات،
ئەوەی سوودی هەبێ نایخوات!
هاوار بۆ کێ ببەم خزمان؟
دەدانیشن، پشوو بدەن،
هەر لەو ڕۆژەی مێژووی زەمان ڕێکخراوە،
بە ڕێگەوەین،

ناگەینە جێ، پشوو بدەین!
دە پێم بڵێن، دەی دەملەقوچ، ڕامەوەستن!
هاوار، گەلۆ! چۆن نەتەوەیێك لە خەو کەم،
پێیان بڵێم -
خەون، خەونە؛ ڕاستی لە سنوور دوورترە!
چلۆن بە ئاگایان بهێنم، پێیان بێژم -
ئاوەز لە هێز بەهێزترە،
هونەر لە چەك بە پێزترە!
بێ دانیشە، گوێ ڕاگرە، لە حیکمەتی جووتیاری کورد،
لە ئایەتی قورئانی ورد،
لە فەلسەفەی ئینگلیسی گورد،
تا بزانی بێ دەست و برد،
ناپەڕیەوە لە ڕێ لە پرد.
بێ دانیشن! پشوو بدەین!
هزر ڕێکخەن، تا تێبگەین!
هەموو دنیا بۆتە ڕنە، بۆتە کەڵبە،
گەرەکییەتی لەمەش پتر هەڵتاندرێ،
ناوت لە ڕەگ ڕەشکاتەوە،
مێژوو و ئێستاکەت نەهێڵێ،
لە ئایندەش، بە سانایی، بتانبڕێ!
ئەی نەتەوە ساویلکەکەی خۆشباوەڕەی ئەم زەمینە؛
چاو هەڵێنە،
دامەنیشە و گەلانی دیکە ببینە!

٢٠١٧/١١/١٠ - هەولێر.

**پرسیار**

لێم پرسیار کرد، زەمان چییە، گیان، ژنەکەم؟
بۆم پێکەنی، پاشان گوتی - زەمانِ بۆ من
چرکەییێکە، کە لەو دەمی، هەست بە گەرمی باوەشتەکەم!
٢٠١٧/١١/١٩ - هەولێر.

## ٢٠١٨

### باوەشی تۆ

لە هەر کوێ بیت، خۆشیت پێیە؛
هەموو شتێك، لە دەوری تۆ، گەڵا دێنێ!
ئەی خاتوونی باڵا بەرز،
زەمین هەموو، بە دیدەنیت، نارێکەکان، لەگەڵ یێکتر، دەسازێنێ!
دەی خاتوونێ؛
بۆنت لە گوڵاو خۆشترە،
ژیانیش لە باوەشی تۆ زۆر لە خوناو پڕ جۆشترە!
٢٠١٨/٢/١٥ - هەولێر.

**من و جیهان و باران**

لە ژوورێکی گەرمی پڕ نوور،
هاودەم لەگەڵ هاوسەرێکی خۆشەویستی جوانی ڕوو سوور،
لە دوورڕا هاتە بەر گوێمان،
دەنگی خۆشی ڕێژنەی باران،
کە لێزمەی کرد و داباری بە خوڕ لە بان،
سەر بە کڵاوە، گرمەی پێیەکانی دەهات،
شایی دابەست، لە هەر لادا، بارانە هانی زەوی دەدات،
نووکی تپلی خاکی ماچ کرد، تینوویێتی پایزی شکاند،
گەردی بیابانی لادا، خاکی ووشکی لاواندەوە، زنجیرەی گەرماتی پساند،
لێزمەی خێر بوو، ڕوخساری شەقامی خەملاند،
کوڵمی کۆڵانی شاری شووشت،
ئاوازێکی خۆشی ژەنی، دڵی هەردووکمانی خورپاند،
بۆیێ من هاوسەرەکەم، گەلەك خۆشمان دەوێ، باران.
٢٠١٨/٢/٢٢ - هەولێر.

**فرمێسکت**

هەر دڵۆپێك لە فرمێسکت، کە دەبارێ؛

دانەیێکی مروارییە، لە تەوژمی خوێنی دڵم دێتەخوارێ.

٢٠١٨/٢/٢٦ - هەولێر.

**کات**

من لەو کاتانە هەست دەکەم،
کەوا من هەم،
ئەو دەمانەن، کە بیر لە بوونی تۆ دەکەم!
٢٠١٨/٢/٢٨ - هەولێر.

**سەما**

له هەر کوێ بیت، هەر شت لەوێ، دەبتە ژیان!
دڵ خۆش دەبێت، شنه و شەوبۆ، گوڵ و ڕەیحان!
ئەی خانمی بۆن خۆشی، شۆخ، له بەر تۆیه، شیعر و حەیران؛
وەره باوەش هەتا منیش ببمه بەشێك، ڕاگرین زەمان!
٢٠١٨/٢/٢٨ - هەولێر.

**درەخت**

وەك درەختێكی كلۆرم؛

كرمی زەمان، قەد و باڵای داڕزاندوم!

وەرە با تاوێ بتبێنم، هەتا تەوژمی ڕۆژانم، ڕاینەماڵیوم، نەیبردووم!

٢٠١٨/٤/١٠ - هەولێر.

ماستاو

نیوەی ئێمە، بۆ گەورەکان،
ماستاوی سارد، ڕاست دەیکەینە سەهۆڵبەندان!
نیوەکەی دیش، کە خۆی بینی لە پاش ماوە،
کۆشش دەکات، تا جێی دەبێت لە ناو گەڕی ماستاوچییان.
٢٠١٨/٥/٩ - هەولێر.

**ساقی هاوار!**

ئەم شەو زەمان بۆم سازاوە، دەی! بۆم تێکە، تا لە لێوی دەتکێتەوە،
زەنگی زەمان هەر دەنگی دێت؛
گوێی پێمەدە، تا نەتبڕێت، نابڕێتەوە؛
هەرگیز بەقا بە شەو ناکرێت، کێ دەزانێ، سبەینێ ڕۆژ دەبێتەوە؟
ساقی هاوار، پەنجەی وەك نەی،
وەئالێنە لە ملی شووشەی، پڕکە پیاڵەی؛
پیاڵەی پڕ، پڕ شوعاعە،
بادە میهری خوداوەندە، میهرە دەبووژێنێتەوە،
هاو مەجلیسم، تەمەن لە شەستی ڕەتیدا،
بە گومانم، زەمان لەمە پتر ڕێکا و کانی وشك بزێتەوە؟
پیرە بەڕوو، مەحاڵە، قەت ناژیێتەوە!
ساقی هاوار! گەنجی ڕەت بوو، ئەوەی ڕۆیی بە فیڕۆ چوو،
تەنیا ئەو کات نەبێ مەست بووم؛
هەموو شتێك چێژی هەبوو، زمان هەبوو ، ترسی نەبوو،
بە هۆشیاری زمان لاڵە،
ژین پڕ ترسە؛ چێژی نییە! هۆشیاری خۆی بێدادییە،
بێدادییە نابڕێتەوە.
مەستی، چێژ بەوانە دەدا - مەستن،
هەرکە مەستی، خاوەن دەستی، خودان زمان و پڕ هەستی،
هەر کە مەستی، زەمان بە پێی میزاجی خۆت، ڕادەوەستی
یانە هەر نا، بە خەیاڵت، نەك هەر تەنیا ڕاوەستاوە،
بەڵکوو زەمان دەکشێتەوە؛ ژیان تازە دەبێتەوە!

٢٠١٨/٩/٢ - هەولێر.

**دووا ژوان**

لەم دنیایە، تاکە یێك ژوانم ماوە!
ئاخر گەلێك هەرچی و پەرچی هاتنە سەر ڕێم،
گەلێك پادشا و سەرم دیتن،
لە سەر تەختی شاهانەیان، کە دانیشتن،
لە بیریان چوو، نیشتمانم بێ ناز ماوە،
دادپەروەری، دوور لە دەرگای قەسرەکانیان، ڕاگیراوە،
لە بەرانبەر تەختی ڕزیو، قەتیس ماوە!
تا ئەو دەمی بەرەو قەنارە ڕاپێچران،
نەیانزانی لە گشت ژوانێك سازترە، ئاوی کانی خاکی کوردان!
منیش هێشتا لەم دنیایە، تاکە یێك ژوانم ماوە!
زۆر خاك و وڵاتانم دیت، داگیرکەر خستییە ژێر پێیان،
بەهارم دیت، گوڵ و خونچەیان لێ وەران،
کوڕ و کچی جوانم دیت، لێیان حەرام کرا ژوان!
بەڵام هێشتا، منی شەیدا،
چاوەڕێمە، لەم دیدەنە دووا ئومێدم بەدی بێت،
لە ژێر دەستی، ڕزگارم بێت؛
ڕووە و هەندەری ڕووناکی، لە سەرەخۆ، هەنگاو بنێم
دەستم بگرن، تا ئەو دەمەی، چاو هەڵدێنم!
دەنا ڕەنگە لە ناو زۆنگاوێکی بێ بن، ڕووچم؛ ئیتر بڕۆم و نەمێنم!
پێش ئەوەی ئا لەم دنیایە، بگەم بەو دیدارەی ماوە!
ژوانی من، ئەمجارەیان، دوو ئەگەری گەورەی تیایە،
گەر دەست لە ملی وڵات نەبێت، لەگەڵ خودی مردندایە،
لە بناری شاخێکی ڕووت، زۆر لە مێژە،

چاوەڕوانی بەهارێکم، وا دیارە هەرگیز نایە!
هاوخوێنانم، هاوڕێیانم،
پێیەکانم هەنگاو داوێن، دڵم خورپەی دڵی لێ دێت،
ئاخر لێرە ژوانی دوور، خۆشەویستی یاران دەکوژێت!
گڕ لە هەناسە بەر دەدات! خوێن دەمژێت!
منیش تەنیا، لە سێبەری کەلاوەیێك، چاوەڕێی کاتی دیدارم،
زەمان لە ئێمە غەزریوە، دەڵێی هەرگیز کاتی نایێت،
گەیشتن بە چاوی یارم!
بۆیێ دەڵێم، ئاگاردار بن، گەلۆ!
دووا دیدار ئەگەر لەگەڵ یارت نەبێت،
ئەکید، لەگەڵ مردن دەبێت!
ئەو دیدارە، هێشتا ماوە!
لە تاریکی ئەنگوست لە چاو، زیندەگیمان بە ڕێ دەکرێت!
لە ناو بڵێسەی ئاگر و ململانێی با و باران، ڕادەبوورێت!
ئەی هۆی چییە، هێشتا بەهار ڕێی گیراوە!
هێشتا زستان، بێ بارانە! هێشتا پایز بێ ڕەنگ ماوە!
هێشتا هاوین گەرمە، گەرمە، ڕانابوورێت، ڕاوەستاوە؟
دەبێ بڕۆم، نابێ ئەم ژوانەم لە دەست بچێت،
خۆ بەر لەوەی تێر پێکەنم، باش دیارە!
ئەگەر ئاگام لە خۆم نەبێت،
دوا ژوانم لەگەڵ خودی مردن دەبێت!
بەڵام گەلۆ، ئەو دیدارەم، هێشتا ماوە!

٢٠١٨/٩/١٤ – هەولێر.

**کەی دێیتەوە؟**

جیهان چووەتە دوبەی!

دوور مەکەوە،
با بۆ تاکە ڕۆژێکیش بێت؛
لە دووری تۆ نازانم چۆن هەناسە دەم!
چاوەڕێمە، بێیتەوە لام، ژیان بێی تۆ پڕە لە خەم.
جێم مەهێڵە، با بۆ تاکە ساتێکیش بێت،
نازانم چۆن پێبکەنم؛ تۆ لام نەبیت،
لێوم دەڕنێت، زەردەخەنەم!
دڵ بە بێ تۆ تەنگ و تارە،
دڵۆپ، دڵۆپ دەتوێتەوە، ئۆقرە ناگرێت، مەگەر زۆر کەم!
ماڵمان چۆلە، گشت ژوورەکانی تاریکن،
بەیانیانم بێزارییە، تامیان نییە؛ لێم بووینە تەم.
ڕەنگی ڕوخساری گەشاوەت، تابڵۆی قەشەنگی خەیاڵە،
چاوەکانت جێم ناهێڵن، بۆ من بووینە یادی سەردەم.
کە نەتبینم، زەمان لە زەمین دەبتەوە،
کەینێ دووریت دەبڕێتەوە؟ کەی دێیتەوە؟
یانە دووریت نابڕێتەوە،
تا دەمکوژێ و دەبتە ماتەم؟

٢٠١٨/١٠/٢٠ - هەولێر.

## ٢٠٢٠

### ڕەش

هەر لە مێژە، شەوەکانمان تار کراوە!
هەورێکی ڕەشی چڕیشە، وا هاتووە، توند – توند ئامێزی لێداوە!
دنیامان، ئەنگوست لە چاوە؛
هەنگاو شەختەی بۆ ناشکێ؛ چەرخی زەمان، گڕی لە هزر بەرداوە!
کەچی هێشتا دەودەوانێ، لە سەر هیچێك، باوی ماوە!
هزر چییە؟ پلان چییە؟
هیچ لە ئاسۆ دیار نییە؛
هەورێکی ڕەشی سیاسی، وا بیانووی هیچی داوە!
*

ڕێ نیشاندەرمان، دوژمنە!
فیکری لە نێو گوشێك ناوە، هیچ باگۆڕکێی تێدا نییە!
هێندەی کونی دەرزی دروومان، هیچ ڕووناکی تێدا نییە؛
سەیری دیرۆکی دنیاکە، باسی تاکە کوردێك ناکا،
مەگەر بندەستی خۆیان بێ،
یانە خزمەتچی خۆیان بێ!
کوردێك نییە، بێ و مۆمێکی خۆکردیمان بۆ ئاگردا،
هەر دەبێت پەنجەی بیانی، زۆر جارانیش دەستی دوژمن،
توند توند بگوشن،
ئاخر چبکەم؛ پەنجەی کوردی هێزی داگیرسانی نییە!
عەقلی کوردی هێشتا شەیدای بیابانە؛ هیچ نرخی بێستانی نییە!
*

لەم گرژییە، گرفتی گەورەی ئەم خاکە، بڵێن چییە؟
پێویستیمان، جگە چاکە، بڵێن چییە؟
دانیشتنی پڕ پێکەنین، ئاسۆیێکی ڕووناهییە،
دەزانم کە قسەکانم زۆر بە دڵی سیاسی نییە!
بەڵام ئەمە پێویستییە،
دانیشتنی خۆشەویستی و پڕ پێکەنین!
ئاسۆیێکی ڕووناکییە، هەورە بروسکەشی نییە،
هەر چەند لە ناو چوار چێوەی خۆری تاریکین،
بەڵام، با هەموو بزانین،
پیر و گەنجمان، نێر و مێمان، زانا و نەزان،
ترسنۆکمان، ئازاکانمان،
کەودەرییەکان، بلیمەتمان،
هەمووی سەودای ئازادینە؛
لە پێناو یێك ڕۆژی ئازاد، ئامادەن بێنە سەر مەیدان.
*
ئایا ئێستا، کورسی خولاو،
کارەبای بیست و چوار سعات، گەرم نەبڕاو،
پاسەوانی وشت، حەپەساو،
لە ناو لاندکرووزی جام ڕەش،
لە پێشمەرگەکی ناو سەنگەر،
هەر ڕۆژ چەند جار، دێتە هاوار، گرینگترە؟
*
ڕەشایەتی لەم ڕێگەیە، بەم ڕێگەیە، نابڕێتەوە،
نە لا دەچێ، نە بە کەسیش دەسڕێتەوە!

نەهاتییە! ڕۆیشتووە، نایێتەوە!
پیسن، پیسن!
دوور لەوانەی کە لە سەریان دادەنیشن،
کورسییەکان خۆیان پیسن!
لاندکرووزە جام ڕەشەکان، وەکوو هەولێری گۆتەنی - حەپوو پیسن!
دیمانەکانی سەر تیڤی، قسەی پیسن!
ناوی خوای بێنن! بوەستن، زوو ڕاوەستن؛
گوێم لێبگرن؛ تا بزانن،
پێویستیمان چۆنە و چییە!
پێویستیمان بە ڕێبازێکی تازەیە!
پێویستیمان بە چراێکی تازەیە!
لە ناو خاکی بن کڵاشی پێشمەرگەیێك دابگیرسێ،
ڕووناکی بێت، ئەستێرە بدرەوشێتەوە!
ڕەش سپی کات، هەڤر بڕەوێنێتەوە!
تاریکی ناو - هزری سیاسی بێ ئەزموونیش ڕەوشەن بکات،
هیواکەی سەدەی بیستەمین، بێنێتەوە!
*
لە سەر کۆڕستانێکی بە کۆمەڵ، شایی ناکرێت،
لە سەر هەر گڵکۆی شەهیدێك، چراێکی کوردایەتی داگیرسێنە،
گوڵێکی گەش، بۆ پێشمەرگەی ئازای سەنگەر، خێرا بێنە!
ئاخر لە سێبەری ئەوە،
سیاسی گەڕ، دەخەوێ و دەحەسێتەوە.
۲۰۲۰/٤/۱۸ - هەولێر.

## هەولێر

دڵم پڕ ئاخە؛ مافوورت ڕاخە!
بادەیێك تێكە، ئەمڕۆم پڕ داخە!

خێرا ڕابردووم لە بیر ببەوە؛
پێم بێژە، چی بکەم! لە بیر ناچتەوە!

گەلە دوور چوو بووم ئەوا هاتمەوە
بۆ شاری هەولێر، وا گەڕامەوە!

ئەم شارە هەمووی پڕی پەرییە،
پڕ جوامێری و هەم سەرووەرییە!

هەولێرە عیشقم، هەولێرە هێزم،
هەولێرە فیکرم، هەولێرە چێژم

ئێرە هەولێرە؛ خۆشتر لە شاران
زستانی بەفرە و گوڵ لە بەهاران

قەڵاکەی بەرزە، قەشەنگ و جوانە
خۆی، پێگەی عەرشی زاتی یەزدانە

هەم بەزم و ڕەزم و بووکی کوردانە،
نەك تەنیا شارە، هزری هەمووانە!

ئەی هەولێرەکەم، وا بۆت هاتمەوە
دووری تۆ نەما؛ دەحەسێمەوە؛

ئاخر تەنیا تۆی ماڵ، پەنا و هێزم
خاکی پڕ ئاو و زێ و کارێزم!

ئەوا هاتمەوە، بۆ ناو باوەشت
وا خۆم ئاوێشتە ناو بەخت و بەشت

منی هەولێری، کوردی جافگەلم
لەیرە مافم هەس، لێرە سەرکەڵم

من ئەم شارەم هەس، تا تێیدا بژیم
لێرە گەورە بیم، بە هێز، خۆش هەلم

هەولێر پشتمە، خۆشەویستیمە
بەستە و گۆرانی و خوا پەرستیمە

هەر کاتێ هەولێر بەرز بێ و ئازاد
من بە گشت واتا، دڵم دەبێ شاد.

۲۰۲۰/٤/۱۹ هەولێر.

لە کەنەدا بە یێکجارەکی گەڕامەوە.

## ٢٠٢١

### سەرۆك پوتین

پێشکەشە بە سەرۆکی ڕووسیا - ڤلادیمیر پوتین

سالآنێکە، لە میدیاکانی ڕۆژئاوا، لە سەنتەری عارەب زمان،
وەك دێوەزمەی مرۆڤخۆر، سەرۆك پۆتین، پەیکەریان بۆ تۆ قەتیسە!
ئێمەیان ئاوا تێدەگەیاند - سەرۆك پوتین، کەسێکی تا بڵێی خەبیسە!
بێ ئەندازە لە خۆ بایی و بە بێ ویژدان و نگریسە!
شەڕەنگێزی، فیتنەگەری،
یا توخمێکی تێنووی خوێنی، عەکسی ئینسان!
کەچی هەر ئەم ئێوارەیە،
وا بۆم ڕێکەوت، لە ئینتەرنێت، تۆم هاتە پێش.
بەڵێ! تۆ بووی سەرۆك پوتین،
دەستی ئەو خانمەت ماچ کرد کە لە پۆلی یەکی سەرەتایی فێری کردی.
دیسان تۆ بووی، دەستی کچێکی نابینای ڕۆژنامەنووست، پڕ لە سۆز،
زیارەت کرد.
سەرۆك، پوتین، بێ شك، تۆ بووی،
سەرت لە، پیرەمێردێکی کەنەفتەی بە ساڵا چووی، کۆنە مودیرت دا،
ڕێزت لێ نا؛ نەمدەزانی چت پێدەگوت،
وەلێ هێشتا تێتگەیشتم، ستایشیت لە بۆ کرد،
بێ ماندووبوون، ئەم مرۆیە پیشکیشی وڵاتەکەی کرد!
سەرۆك پوتین، ئەم ڤیدیۆیە سنگینانەت، هەڵسوکەوتە پەسندانەت،
لە ناخ مێشکم، لە ناو دڵم، وێنەیێکی تازەی کێشا،
وەك پاڵەوانێکی نەترس، لە مەیدانێ تۆی نیشاندا.

٢٨/٥/ ٢٠٢١ - هەولێر.

**هۆ حکومەتی کوردستان**

شەقام با هەر ڕێك و جوان بن!
ئۆتۆمبێلی بەرپرسەکان،
با هەر جام ڕەش و گران بن!
با هەر وەفدە میوانەکان،
لە ئۆتێلە پێنج ئەستێرە خاوێنەکان،
پاش خواردن و خواردنەوە،
ماستاو بۆ پیرە بەرپرسان ساردکەنەوە،
سەری دەرخوونەی کوردستان هەڵدەنەوە!
هەرچی دەبەن، بیبەن، بیبەن!
بە ئێمە چی؟!
دەبا جارێك، هەر بۆ ناوبانگ بێت، یەك شاندێکیان،
سەر لە دەرگەی، بێ کلیلی، هەر کراوەی،
ماڵی شان بە قوڕێك دەرکات،
بۆ ماوەیێك، با کورتیش بێت،
خەمی گەورەی برسییەتی لەگەڵ بەشکات!
***
هاواری خەڵك، سەروەزیر،
هاواری خەڵك، حکومەت،
لە دەست بەرپرسی حیزبانە!
لە حەژمەتی خاوەن واستە و پشت ئەستوور و مل قەویانە!
هاوار ڕێزدار، سەرۆك وەزیر، هۆ حکومەت!
حکومەتی کوردەواری!
مرۆڤی ئاسایی ئەمڕۆ،

لەم هەرێمە ناسکەی تۆ،
ماف خوراوە، دڵ سووتاوە،
دوو ئەوەندەی ڕانە مەڕێك بەستەزمانە،
دوور لە ئێوە، دەڵێی بە بێ شوان ماوە!
***
هەر کەسێکی بە بێ پشت بێ،
حکومەت نابێتە پشتی؛
سووتاوە لەم کوردستانە!
ئەم وڵاتە، سەد دوژمنی بەڵاگێڕ بێت،
لێمان بووە بە ئەشکەوتێکی زۆر تاریك؛
پڕ مەوکبی دار و دەستەی مەسئولانە!
شەقامەکان تەنگ کراون، بووینە باریك!
لەم وڵاتە بێسنوورە، بەرپرسەکان دێن و دەچن، دەڵێی مارن،
هەر ڕادەکەن، هەر باردەکەن، بەڵام لە ڕاستی بێ کارن!
بێ بەهرەنە، بێ بەرهەمن،
دوور لە یاسا و دوور لە قانوونی سەردەمن!
ئەوەی سیاسییەکان دەیکەن،
وەك ئەوەیە فڕیان بە برسێتی گەل نەبێت!
ئەوەی هەبێت هەر هی وان بێت!
ئوتومبێلی فەرمانگەکانی کوردستان،
لە خزمەتی بەرپرسانە،
کت و مت بۆ خزمەتیانە،
نەك بۆ خزمەت فەرمانگەکان!
***

شەو، کە نووستم، خەونێکم دیت؛
لە هەر ماڵێك گریانێکی تازەم دەبیست.
هەناسەی سارد و بێدادی کۆرپەی بە بێ نازم دەبیست.
برسیم دەدیت، تینووم دەدیت، ماڵی بێ ئاگرم دەدیت،
دڵی پڕ لە ئاخ و لە حەسرەت،
هێشتا فۆرمی بردنە ناو حیزبانم دەدیت!
***
هۆ حکومەت، هۆ حکومەت!
دوور نا - لە سەر جادەی گوڵان،
سەد دوژمنت باڵاگەردان،
پیرەمێردێك،
لە هەموو سبەینەکی خوا، لە ئێواران،
کلینیکسی نیوە بە تاڵ، گوڵە بەڕۆژەی بە پیاڵان،
دەفرۆشێتە شوفێر و نەفەری ناو وەنەوشە جام ڕەشەکان!
ڕیشی سپی ...سپی، سپی،
سەدان سیاسی بێ ویژدانی، بە خزمەتکار!
پشتی کۆماو! بێهێز داماو!
ئەگەر ئەم پیرە ماندووە، لە مەڵبەندی واقواقیش با،
پاش ئەم تەمەنە گرانەی، وای نەدەکرد!
پێویست نەبوو ئەم چەند ڕۆژەی کە ماویەتی ئاوا هەرزانفرۆشی کا.
جارێك دیتم، هەر بە ڕێکەوت،
وەنەوشەیێکی جامڕەش هات و دەرکەوت،
لە ڕاست پیرە پیاوەکە،
هەڵوەستەیێکی بۆ کرد و لە کەلێنی شووشەیێکدا،

نووکی پوولێکی دەرهێنا!
هەر لەو درزە ڕێچکۆڵەی هەڵمێکی زۆر تیر، دەرکەوت!
گوشاری خوێنی پیرەمێرد، لێی وەرسەرکەوت!
ئاخر خاڵۆ لە سەرمادا، وا قەسری بوو،
شوێنی وا گەرمی نەدیبوو!
پارەکەی بۆ نەدەگیرا؛ حەپەسیبوو!
***
حکومەتی کوردەواری،
سەد دوژمنت باڵا گەردان، گەل هی تۆیە!
گەل بۆ تۆیە! بە دەست تۆیە! ئۆباڵیشی لە ملی تۆیە!
وەڵامت بۆ مێژوو چییە؟
من دەروێشی تەکیەی کوردایەتی پاکم،
دەنگی کزی گەلێکی دوو جار ئەنفال و هەر چاکم،
ترسم هەیە، گەر وا بڕوا دیسان بنووم!
ئاخر لەبەر سەرینی پڕ پارە،
وەختە نەمێنێت هیچ چارە!
هەستی زۆران بۆتە دراو!
سیاسەتوان، بۆتە دراو!
سەنگی مەحەکی منداڵان، بۆتە دراو!
پارە دەنوون، پارە دەخۆن،
بە پارەی ئەم هەژارانە دێن و دەڕۆن!
هۆ حکوومەت!
پارەی هەژاری کوردستان،
کاربەدەستی مەست کردووە،

هۆشی هەمووانی بردووە!
هەندە ناز بە پارە دەکەن،
دێن و دەچن، وەك کۆتری پێ بە تووکی سەر بە کڵاوە،
کوردستانیان لە بیر چووە، وڵاتیان لە لا نەماوە!
کوردایەتی لە بیر بردن!
لە بیرتان بێت، لە بیر نەکەن!
شەوانی ساردی سەر شاخ و شەڕی دژواری بێ سەنگەر!
لە بیرتان بێت، لە بیر نەکەن!
بوخچەکۆڵەکەی سەر پشتان، نانە ڕەقەکەی بەردەستان!
ئاوی ڕوونی بە بێ خڵتی کانی ساردی کوردستانتان!
***
هۆ حکومەت! بڵێ، چبکەم؟ هەشم بە سەر...کورد نەماوم!
پێشتر لەگەڵ سەرکردەکان لە سەر یەك قاپ دادەنیشتین،
نانمان دەخوارد!
لە سەر یێك بەڕ دادەنیشتین، تێر باسی خۆڕاگریمان، دەگێڕاوە!
ئێستا، حوکمەت،
نە کاسە سەری شەهیدانی ژاری کیمیا، چاك دەبینم!
نە هێسك و پروسکی شەهیدانی دەستی تیرۆرم لە بیرە!
بێزم نایێت! نازانم چۆن، بە کام دەستم،
سەلام لە بەرپرسی شانەی نهێنی ناو شار، کەم!
هۆ حکومەت، باڵا گەردانت بم، چارەسەرێك!
توخوا بڵێ! کاکە! هانا بۆ کێ ببەم؟
دەبێ بەم پیرییەم کار کەم؟؟؟
٢٠٢١/١٠/٢٠ – هەولێر

هەولێر

دەی! بۆم ڕاخە مافووری دەشتی بەرینت،
هەڵیدە بۆم، ڕەشماڵی قەڵای دیرینت،
زووکە! پڕکە! بەرداخێکی ئاوی پاکی کارێزەکان،
یا کۆتکێکی، پڕ ماستاوی دەستی کابان،
با دانیشم جا نۆشی کەم.
گەر مەست نەبم،
گەر لێواولێو پڕ هۆزان و هەڵبەست نەبم،
گەر نەتوانم یەزداندۆختی شازادەمان، بژیێنمەوە،
یان ئەشتار بلاوێنمەوە،
زەردەشت بە قسە بێنمەوە،
بێ و ئاڤێستا بخوێنتەوە،
لە دارمدەن! مەمهێڵنەوە.

٢٠٢١/١٠/٢٠ - هەولێر

٢٠٢٢

## خۆشترین خەون

لەم سەر تا ئەو سەری زەوی،
شاخی بەرز و دۆڵی نەوی،
چەندین وڵاتانی ئازاد،
ڕێگەی دوور و گەلانی شاد،
هەمووم بینین بەم چاوانە،
هەڵممژین بەم لێوانە،
بۆنم کردن،
ڕامووساندن،
تا لە کۆتادا بۆم دەرکەوت،
یارێك نییە وەك یاری من،
خاکێك نییە وەك خاکی من،
بە خوێنی گەش، ئەسرینی ڕەش،
ئاو درابێت، لە سەر تا بن!
خەمێك نییە وەك خەمی من،
لە خۆر ڕەوشەنتر دیار بێ،
لە شەو تاریکتر بێ یار بێ!
بهارێتن لە سەر تا بن،
تەنیا خەمی وڵاتی من،
لەناوچوونی زمانی من،
لە هەموو خەم گەورەترە،
لە ئەسرینیش دڵبڕترە،
بەڵام چبکەم! هیچ چار نییە!

هەر کەسێکی خاکی نەبێت،
لە ژیانی بەهار نییە!
ئەی کوردینە!
دەسەڵاتداران مەردینە!
مێلن کوردی لە ناو بچێ،
زمانێ تر جێگەی بگرێ!
من کوردم، کوردیم خۆشدەوێ،
بەم زمانە شەهد و ناسکەم
ژێ و یێ و ئەلف و نوونەکەیم دەوێ!
کوردی زمانی دایکمە،
کوردستانماڵی باوکمە،
لێرە دڵ شادە و دەسروێ،
لێرە دڵم دووایین خەوی لێدەکەوێ.
٢٠٢٢/٥/٢٠ - هەولێر

**تەڵیفـۆن**

لەو سەردەمەی لە کوردستان،
پەیمانی دا، بێتە ژوانێ،
تەلیفۆنێك، لەو گەڕەکـەی ئێمە نەبوو!
کەچی ئەمڕۆ، لە کەنەدا،
مۆبایلەکـــەم زەنگی لێدا،
بێ ئـەوەی بزانـــم کێیە، دڵـــم خـــورپا؛
بە هەپڕوون بوو!
زۆر بە پەلە هەڵم گرت و هەلۆم بۆی کرد؛
ئینجا زانیم کە ئەو نەبوو!
داخی گرانم! خۆ ئەو نەبوو!

٢٠٢٢/٧/١٣ – ماڵەکوا - کەنەدا

**وات کرد**

پێش ئەوەی کە تۆ بناسم، منداڵێکی خۆپەرست بووم!
بە ڕاستی هەر وامدەزانی کەوا ئاسمان خێوەتێکە، تەنیا بۆ من هەڵدراوە!
وای بۆ دەچووم،
ئەم گۆی زەوییەش،
دوورگەییێکی پاشماوەی تۆفانی نووحە، بۆ خۆم ماوە!
لێم بترازێ، کەسی دی نە لێی دەژی نە لێی ژیاوە!
کەچی تۆ خۆت،
لە کت و پڕێك و لە ناکاو،
بۆم هەڵهاتی، وەکوو هەتاو!
لە هەموو لاوە بۆم هاتی،
شوورە و قەڵا و باخت تێکدام!
هەموو ڕەنگێکت لێ گۆڕیم،
یاساکانت سەر و بن کرد،
سەرەداوت لە من ون کرد!
وات کرد هەست کەم، گیراوێکم، لە قەفەزم!
وات کرد بە شەو، لە ناو نوێنی تایبەتیم،
بە نیوەی سەرین قایل بم!

١٤/١١/ ٢٠٢٢ - هەولێر.

**یادگاری یێکەم عیشقم**

کە منداڵ بووم، شەیدای کیژێکی چەند ساڵ بووم،
ئەگەر ڕۆژێك ڕەتیدابا، نەمدیتبا
ئەو ڕۆژ زەمان ڕادەوەستا؛ لەبەر دەستی پاکی خودا!
ڕۆژێك ناوی بە سەر زارمدا نەهاتبا،
وامدەزانی گشت باڵندەکان دەشێوێن؛
نە دەخوێنن، نە دەفڕن، نە دەچن و دێن!
پەڕەسێلکە زمانەکەی لە بیر دەکا!
خۆر سوورگەی خۆی ناناستەوە؛
ڕەنگە بێ شك، لە رۆژاوا بۆ ڕۆژهەڵاتێ ڕا بکا!
لە منداڵیم، شەیدای کچێکی ناسك بووم!
هەرکە هەردووك بێزار دەبووین، وێکڕا دەچووین،
خانووێکی چکۆڵمان، لە بۆ خۆمان دروست دەکرد!
ناوماڵەکەمان ڕادەخست؛
هەموو خۆراکمان ڕێکدەخست!
شەربەیێکی ئاومان دێنا،
جەلحەیێکی کۆمان دێنا! لە کانی، ئاومان دەهێنا؛
هەرکە لە پاشی چێشتانان، برسیمان دەبوو، هەردووکمان؛
سوار ئەسپی قامیش دەبووم، ئینجا دەچووم؛
ڕاوم دەکرد!
نیچیرێکم دەهێناوە و دەهاتمەوە،
خانمە خنجیلانەکەشم،

وەکوو ڕووح و ئاسۆی گەشم،
لە قوڕ ئەستووکی بۆم دەکرد؛
گەرمای هەتاو ووشکی دەکرد،
چۆن ئەستوورکێ، با نەخورابا،
بەڵام بە خوا، ئەو ئەستووکە، هەموو نانی دونیای دێنا!
ڕۆژان ڕۆیی، یارۆکەکەم لە گەڕەکی ئێمە نەما!
هەموو گەڕەکی بۆ گەڕام؛
هەموو دنیام لێ پشکنی، وێستگەکانی شەمەندەفەر!
فڕگەی گەورە و جێ نیشتنەوەی هەلیکۆپتەر،
مەیخانەکان، مزگەوتەکان، کەنیسەکان، کەنیشتەکان،
یانەی سەما و مەسرەحەکان؛ سینەماکان!
بڵێن، چی بکەم؟ گەڕام هەمووان،
کاشکا پاش ئەم هەموو ساڵە؛ دەیدۆزمەوە، وەکوو پێشان؛
وەکو سەردەمی منداڵی، لە باوشت دەکەمەوە
هەر بە گۆزەڵە وەك جاران، قومێك ئاوی عیشقی ئێستام دەخۆمەوە،
بێنێك دەدەم؛ بێن دێنمەوە! دەڵێن ڕۆیشت؛ نایێتەوە،
بەڵام من هەر چاوەڕێتم، قەت لە بیرم نەچوویتەوە و ناچیتەوە؛
یادەکانت وەك برووسکن،
ناوە ناوە دەگرمێنن، ئاگرەکەی خۆشەویستیت؛ دەیژیێننەوە.
٢٠٢٢/١١/١٣ – هەولێر.

## وەکوو خۆم

لە نیگاری کەسێك گەڕام، وەك هی خۆم بێت،
کامە دەروازە مەزن بوو، پێیدا ڕەت بووم؛
لەوێڕا چوومە ناو مێژوو؛ کاشکا سەرداریٚ دەبینم،
کەچی لەویٚ، بەختەوە بووم، لە خۆشیانا کەتمە ڕۆندك؛
ئەوەی بینیم، ئەو کەسە زۆر هۆشیارە بوو، خۆی (مام مۆتك)!
چەندە کێشەی چارە کردووە، هەمووم هاتنەوە پێش چاوان،
بە رانبەری ڕێساکانی ڕێزم لێگرت،
پێشتر قەت لار نەبوویمەوە، بەڵام بۆ ئەو داهاتمەوە،
زۆر نەمابوو، بە نیوچەوان، خاکی لە پێش بسڕمەوە،
گوتم - دانا، چارەسەرێك!
گوتی - برا، چارە هەیە؛
بەڵام لە ناو ئێوەی نەوەی ساسانەکان،
هەر لەو دەمی ڕووخان، نەمان،
هەتا ئەمڕۆ، هەموو خۆتان پیٚ سەرۆکە؛
ئەمەش تەواو عەکسی عەقڵە،
چونکە دەبیٚ، ئەوەی کورد بیٚ،
بۆ یێك سەردار،
دەست لە سەر سینگ ڕابوەستیٚ،
ئینجا دەبنیٚ!

۲۰۲۲ /۱۱/۱۹ - هەولێر.

## وەرگـــــــێڕان

### خـــەون

[لانگستن هیوز] [1]

خەونەکانت توند، توند بگرە؛ چونکە ئەگەر خەون بمرێ،
ژیان دەبتە باڵندەیێکی باڵ شکاو؛ ناشێ بفڕێ!
خەونەکانت توند، توند بگرە؛
چونکە کاتێك خەون نەما،
ژیان دەبێتە کێڵگەیێك،
لە بن بەفر دەبەسترێ.
٢٠٢٢ /١١/٢٤ - هەولێر.

### ژیان

ژیان هەرگیز پاشەوشکێن نابێتەوە
هەر تەمەنێکیش کە مەحاڵە، ناگەڕێتەوە!
٢٠٢٣ /١/١٦ - هەولێر.

[1] Hughes, Langston; Dreams;
<https://www.poetryfoundation.org/poems/١٥٠٩٩٥/dreams-٥d٧٦٧٨٥٠da٩٧٦>;
٢٤/١١/٢٠٢٢.

## ناسنامـــەی نووســـــەر

- ناو - طاهر طیب جاف.
- ساڵی شوێنی بوونی- ١٩٥٢/١/٢٥ - گوندی گردەسۆر، دەشتی هەولێر.

**پلەی خوێندن -**

- ٢٠٠٣ - ٢٠٠٦ ماستەر لە ئەدەبی ئینگلیسی - زانکۆی یۆرك - تۆرۆنتۆ - کەنەدا.
- ٢٠٠٠ - ٢٠٠٢ بڕوانامەی ئەدەبی ئینگلیسی - زانکۆی ماکماستەر - هاملتن - کەنەدا.
- ١٩٩٧ - ١٩٩٨ بڕوانامەی سستمی بەکاربردنی کۆمپیوتەر - عەممان - ئوردون.
- ١٩٧٩ - ١٩٨٣ بەکەلۆریۆس لە وەرگێڕان - بەشی زمان - زانکۆی موسڵ - عیراق.
- ١٩٦٦ - ١٩٦٩ بڕوانامەی فێرکردن - خانەی مامۆستایانی سەرەتایی - هەولێر.

**کارە ئەدەبییەکانی**

**وەرگێڕان**

**لە زمانی ئینگلیسی بۆ سەر زمانی کوردی**

- ماریانا خارۆداکی - کورد و سیاسەتی دەرەوەی و.ی. - ٢٠١١ - دەزگای ئاراس.
- جۆنەتان ڕاندڵ - ئوسامە چۆن خۆی پێگەیاند - ٢٠٠٦، ٢٠١٠ - دەزگای ئاراس.

- پیتەر گاڵبریت - کۆتایی عیراق - ٢٠٠٧ - دەزگای ئاراس.
- مایکڵ گەنتەر - فەرهەنگی مێژووی کورد - ٢٠٠٧ - دەزگای ئاراس.
- مایکڵ کێرتس فۆرد - دە هەزارەکە - ٢٠٠٦ - دەزگای ئاراس.

**وەرگێڕان بۆ سەر زمانی ئینگلیسی**

- قادر گۆزێ - من و شەقڵاوە - ٢٠٠٨ - هەولێر - کوردستان.
- نجيب الصالحي - الزلزال (عربي) - ١٩٩٨ - عمان - الأردن.

**دانـــان**

- طاهر طيب جاف - ئەوەی نەدەوێرام بیخوێنمەوە، وا بڵاوی دەکەمەوە- ٢٠٢٣ - هەولێر. (شیعر)
- طاهر طيب جاف - سەربردەی جوامێرێکی نەترس - ٢٠٢٢ - هەولێر - کوردستان.
- طاهر طيب جاف - The Man Who Made It - ٢٠٢١ - دبي - الامارات.
- طاهر طيب جاف - Kurdish Language and Associated Translation Issues - ٢٠١٦ - کەنەدا.

لە دوای بەیانی ١١ی ئاداری ١٩٧٠، بزاڤێك کەوتە ناو گەنجی کورد و ڕێگەی بۆ والا بووەوە و کورد لە کوردستان دەنگ و ڕەنگێکی بۆ پەیدا ببوو، منیش هەستام ئەو هۆنراوانەی پێشتر لە ١٩٦٥ تا ١٩٧٠ ڕێکم خستبوون هەموویانم خستە سەر چەند پەڕێکی دەفتەرێك و ناوی (بۆ پێشمەرگە)م لێیان نا، ڕەوانشاد مامۆستا سعید یحیی ناوەکەی بۆ نووسیمەوە و ناردمە بەغدا تا (هيئة رقابة المطبوعات) لە (وزارة الاعلام) مۆڵەتی بڵاو کردنەوەیان بدات؛ ئەو چەند شیعر گەڕانەوە؛ ئەوەی بۆنی کورد و کوردستان و بۆرە تامێکی کوردایەتی لێ بهاتبا، لە سەر هەموویانیان نووسیبوو (يحذف) واتا (قوت دەکرێت) و منیش لە سەر ئەو بنەمایە هیچیانم بڵاو نەکردەوە و ئەم ناوەی ئێستاش کاردانەوەی ئەو کاتییە کە نووکی قەڵەمی کوردیان دەبڕی و ئەوەی بە دڵی ئەوان نەبا ڕێی نەبوو چاپ و پەخش بکرێت؛ بۆیێ ئێستا، کە هەموومان لەم بەشەی کوردستان ئازادین، لەبەر ئەمە پێشتر (**ئەوەی نەدەوێرام بیخوێنمەوە، وا، بڵاوی دەکەمەوە**) و ئومێدمە وەبەر دەست و چاوی خوێنەری کوردی بگات و وێنەی جوانی پێ نیشان بدات، بە تایبەتیش گەنجەکان، و ئومێدیش دەخوازم کاشکا واز لە پرۆگرامەکانی سەر تێلیفۆنەکانیان دەهێنن و بەرەو پەڕی کتێبان دەگەڕێنەوە تا بزانن ئەدەب و زانست چنە و چۆنن و چەند سوود بەخشن و باشتریش بزانن ئەوەی کە دەکەوێتە سەر لاپەڕەیێکی قاقەز، لەوەی کە لە سەر هەندێك لاپەڕەی تەمەن کورتی ئینتەرنێت پەخش و بڵاو دەبنەوە تەمەن درێژتر و بە سوودتر دەبێت و وەك ئەوەی سەر هێلە ئێلێکترۆنیکەکان زوو لە ناوناچن و ماندوبوونەکانیش بزر نابن. ئاخر بابەتەکە هەر ئەمەندە نەبوو کە وا بکات شیعر لە ناو دڵم و لە مێشکمدا گەشە بکات؛ بەڵکوو لە ژیانی مندا؛ شیعر هەستە، شیعر عەقڵە، شیعر سۆزە، شیعر عیشقە، شیعر خەمە و خەم ڕەوێنە، شیعر کۆرپەی نائومێدییە و لووتکەی پڕ ئومێدییە؛ ژینە، ژانە، هیشکەتییە، بیابانە، شیعر ئاوە، خۆراکی ژینە، نانە، شیعر میهری خودایە بە هەموو کەسێك نادرێ؛ چونکە ئەوەی بە شیعر دەگوترێت، بە زمانێکی دیکە پەروەردە نابێت. هەر نەتەوەیێکی شیعر لە ئەدەبیاتیدا نەبێت، نەتەوە نییە.